چاپی چواردەم

عەزیز نەسین

# بێناسنامەکان






وەرگێرانی: حەمە کەریم عارف

# پێناسنامەکان

عەزیز نەسین

گۆڕینی لە فارسییەوە
حمە کەریم عارف

چاپی چوارەم ۲۰۰۹

* بێناسنامەکان (ڕۆمان)
* نووسینی: عەزیز نەسین
* گۆڕینی لە فارسیەوە: حمە کەریم عارف
* چاپی یەکەم: ١٩٨٦
* لە بلاوکراوەکانی یەکێتیی نووسەرانی کوردستان/ زنجیرە: ٣٩
* چاپخانەی شەهید عبدالخالق معروف
*چاپی چوارەم ٢٠٠٩ چاپخانەی سایە سلێمانی
*تایپ: سروشت رزگار حەساری
*هەڵەچن:سەرگوڵ محەمەد ئەمین

زنجیرەی کتێب ٥٥
لە بلاوکراوەکانی خانەی چاپ‌ونێوەندی سایــــە



ناونیشان: سلێمانی – ئازادی – سەرسەدەکە
٠٧٧٠١٥٥٠٨٥٣ -٠٧٧٠٢١١٩٥٦٤

# لە جیاتی پێشەکی

## نەسین

## خواجە نەسرەدینی سەدەی بیستەم

ن: جەلال زەنگابادی / و:حەمە کەریم عارف

نەسین، بەشی هەرە زۆری فەلسەفەی خۆی لەمەڕ ژیان وئەدەب لە یەکێك لە قەسیدەکانیا چڕکردووەتەوە کە دەڵێت:

(ئەرکی منە کە
بەپڕی
بەقوڵی
بژیم
ئەرکی من: خۆشەویستییە
بە ئازادی
وبە بەهێزی
ئەرکی منە کە بنووسم
پەڕە دوای پەڕە
لە پێناوی گەلەکەم
ئەرکی منە کە بخەبتم
لە ڕای ناندا
لە پێناوی ئاشتیدا)

***

لە وەڵامی پرسیارێکدا: (یەکەم چیرۆکی خۆت بیر دێت؟) نەسین ڕووداوێك دەگێڕێتەوە کە لە یابان بۆی پێشهاتووە، دەڵێت:ئێوارەیەك یەکێك چیرۆکێك دەخوێنێتەوە کە بەدڵی ئامادەبووان دەبێت و نەسینیش زۆری لا پەسند دەبێت ودەکەوێتە ستایشی نووسەرەکەی کە نایناسێت..ئامادەبووان سەرسام دەبن و وادەزانن گاڵتە دەکات..کە هۆی سەرسامییەکەیان دەپرسێت، وەڵامی دەدەنەوە کە ئەمە چیرۆکێکی ئەوە، ئیدی لەسەرسامی و لەڕوودامانا دەمی دادەچەقێنیٚ.

نەسین لە ڕێگەی گێڕانەوەی ئەم ڕووداوەوە دەیەویٚ بڵیٚ کە زەحمەتە یەکەم چیرۆکی خۆی وەبیر بێتەوە. چونکە خودانی هەزاران چیرۆکە. جا ئەگەر ئەمە حاڵی چیرۆکنووسەکە بیٚ، دەبیٚ حاڵی وەرگێڕو توێژەرێکی وەك من چ بێت کە بەناو دارستانێکی بەرینی دوورە کەشفی بەرهەمێن وی کەوتووم. بە تایبەتی کە کارەکانی نەخراونەتە بەر توێژینەوەیەکی ئەوتۆو لە خانەی بەئانقەست (فەرامۆشکراو) دان، تەنانەت لە زمانی تورکیداو، لە ئەنسکلۆپیدیای (مێژووی ئەدەبی تورکی)دا ناوی نەهاتووە! ئەوەندەی بێگانان بایەخی دەدەنیٚ ،لەناو خۆدا بایەخی پێنادرێت..کە ئەمە خۆی لە خۆیدا سەتیرێکەو دەچێتە سەر سەتیرە نەسینییەکان. جا بۆیە ئەم هەوڵە بچووکەی بەندە، تەنیا درزێکەو دەخرێتە کەوشەن و ئاقاری چڕە دارستانەکەی نەسین.

## * کۆمیدیایەکی مرۆڤانی

ئاشکرایە کە مرۆڤ تاقە بوونەوەرێکە کە پێدەکەنیٚ و پێکەنین لە تایبەتمەندییەکانی ئەوە. ئەرستۆو هزرڤانانی دیکەش ئەوە دووپاتدەکەنەوە کە پێکەنین هەمیشە پەیوەستە بەلایەنی رۆحی ژیانی مرۆڤ و هەندیٚ دیاردەی چالاکییە سایکۆلۆجییەکانی مرۆڤەوە. چیرنیشفسکی گوتەنی لە کاتێکدا کە "جێگای کۆمیدی لە نێو بێگیانان وڕووەکاندا نییە" ئێمە "بەگیانلەبەران پێدەکەنین، چونکە مرۆڤ ورەفتاری مرۆڤمان بیر دەخەنەوە.."وەکو مەیموون، بەتریق، بۆق، مشك، ورچ، پشیلە، زەڕافە، سەگ وگوێدرێژ... بەڵام سروشت

برگسون گوتەنی "دەشێت دیمەنی سروشتی جوان و دڵڕفێن بێت، یان ناشیرین بێت، بەڵام هەرگیز پێکەنین ئاوەر نابێت."ئەمە لەرووی دروستبوونەوە، بەڵام لە رووی زەرورەت وکاریگەرییەوە ئەوا ئەمیل میشال سیورانی فەیلەسوف گوتەنی "پێکەنین بیانوویەکی گەورەی ژیانە! دەبێ ئەوە بڵێم کە من لە هەرەتی چرکەساتەکانی نائومێدیدا، دەمتوانی پێبکەنم. هەر ئەمەشە کە مرۆڤ لە گیاندار جیا دەکاتەوە" وەرەنگە (کاندس د.لانگر)ی رەخنەگر گوتەنی "تەوس تایبەتمەندییەکی دیار بێ لە روانگەی مۆدێرنیتەوە بۆ جیهان و شۆخی(هەزل)یش مەرجێکی زەروری و لەوەیە بەس بێ بۆ ئەقڵیەتی پاش مۆدێرنیتە".. لەوەیە نەسین هەر زوو پەی بە بایەخی ستراتیجی پێکەنین بردبێ، بۆیە ئەوەتا جارێك گوتوویەتی: " من چیرۆکان دەنووسم، تا خەڵکی بەدەم پێکەنینەوە بیر لە ژیان بکەنەوەو بەدەم بیرکردنەوەشەوە پێبکەنن". دیارە مەبەستی لە پێکەنین سەتیری کۆمیدی ئامێزە، کە لە رێگەیەوە سەروگوێلاکی دکتاتۆران و بیرۆکراتان و ریاکارانی هەموو بوارەکان دەکوتێتەوە. تەوس و توانجی نەسین ختوکەدانێکی قێزەوەر نییە، بەڵکو تەوس و توانجێکی لەبەردڵانی نیوەرۆك ئیجابییە، بەڵکو جەوهەرە دژی رواڵەت، قۆریات و حەیف و زوڵمان ئاوەرووت دەکات و گیانی شۆخیبازی پڕ لە جورئەتی ئامانجدار بڵاودەکاتەوە کە چەوساوان دە توانن پەنای بۆ بەرن و داخی دڵی خۆیانی پێ بڕێژن بەسەر زۆرداراناو تۆڵەی خۆیانی پێبکەنەوە. ئەمە جگە لە رۆڵی کاراو کاریگەری پێکەنین، لە زاڵبوون بەسەر کول و کۆڤان و دژوارییەکانی ژیانداو، بڵاوکردنەوەی شۆخی و گەشاندنەوەو بەهێزکردنی گیانی گەشبینی لە دڵ و دەروونان‌دا.ئەمە جگە لە کاری ئیجابیانەی لەسەر تەندروستی سایکۆلۆژی و بەدەنی، رینۆلد نیبور لەم رووەوە دەڵێت: "ئێمە بەزەبری پێکەنین بە سەرڤە سەرڤەکانی ژیان ، سەلامەتی و ساغڵەمی ئەقڵی خۆمان دەپارێزین..." جێگەی خۆیەتی لێرەدا ئەم رووداوە پڕ دەلالەتە لەوبارەیەوە بگێرینەوە: رۆژێك چابینی

لیبۆکی بە ناوبانگی ئیتاڵی سەردانی دکتۆرێکی دەروونی دەکات و سکاڵای حاڵی خۆی دەکات و دەڵێت:

- دکتۆر! من نەخۆشم، تامی لەزەت لەهیچ شتێك ناکەم..چەندین ساڵە ناتوانم پێبکەنم.. پێکەنینم ژبیر کرد..تەحەمولی هیچ شتێك ناکەم، تەگبیرم چییە؟

دکتۆرەکە وەڵامی دەداتەوە:

- منیش وەکو تۆ وابووم، چوومە سێرك و بەتەمەشاکردنی هەڵسو کەوتە ناسك و دڵگیرەکانی لیبۆکە بەناوبانگەکەی...دڵم ئیسراحەتی کردو چابوومەوە... بۆیە ئامۆژگاریت دەکەم چەند جارێك بچیتە ئەو سێرکە...

ئیدی نەخۆشەکە دەستی خستە سەرسینگی و هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو گوتی:

- دکتۆری ئازیز من ئەو لیبۆکەم!

ئەم حیکایەتە حەقیقەتی حاڵی ئەو پێکەنینسازانەشمان بۆ بەدیار دەخات، کە بەزۆری خەڵکی دێننە پێکەنین و خۆیشیان بەئازارەوە دەتلێنەوە!!

پێدەچێت نەسین، بەزەبری ئەفراندنی کۆمیدی بازنەی کۆمیدیای تەقلیدی وئاسایی بەزاندبێ، توانیبێتی شتە پوچ و ناشیرینەکانیش بکات بە هەوێنی کارە کۆمیدییەکانی خۆی. لێ کۆمیدیای تەقلیدی لەکۆنەوەو تا ئیستاش بەدەوری خەوش و کێماسییە مرۆڤانییە بچووکەکاندا خولاوەتەوەو کردوونی بە هەوێن و شتە ناشیرین و پوچەکانی بۆ تراجیدیا بەجێ هێشتووە، نك گروتمان لەم بارەیەوە دەڵێت: "کۆمیدی بەدەوری لاوازی و شتە پوچە مرۆڤانییەکاندا دەخولێتەوە"..

ئەدەبی نەسین خۆی لە خۆیدا عەمارێکی تەژی داشۆرینی توندو حەیابەرەی زوڵم و زۆرداری بیرۆکراتییەتی گەمژەو بۆگەنی و گەندەڵی کۆمەڵگەی ئەرستۆکراتی و داڕوخانی ئەخلاقی دەوڵەمەندان و دابەزینی بەها

مەعنەوییەکان و ڕیاکاری و دروشم و گوتارە سیاسییە بۆش و بەتاڵەکان و دیماگۆگییەتی لاسارو زوڵم و زۆرو گەندەڵی و کەربازاڕی باو و ڕەواجدار بوو...
نەسین توانی بەزەبری شێوازی پڕ داهێنانی کەم وێنەی خۆی، ئەو شتانە بەسەر سانسۆردا تێپەڕێنێ کە قەدەغە بوون. بێگومان ئەم بنگۆم لێدانە لە سانسۆر ئەرکی هەرە بنەڕەتی داهێنەرەو نیشانەی زیرەکییەتی لە هەموو شوێن و زەمانێکدا.. بۆیە "چیرۆکەکانی نەسین بە (کۆمیدیایەکی مرۆڤانی)گەلی تورکیای هاوچەرخ دەژمێردرێت و خۆی لە خۆیدا ئەوزارێکی سەرسوڕهێنەرو وردیشە بۆ شیکاری داهێنان" بەگوێرەی راوبۆچوونی ل. ئۆ.ئیلکایڤا کە پێی وایە ئەوەی عەزیز نەسین دەینووسێت سیمای زۆر وڵاتی دیکەشی گرتووەتە خۆ چونکە "ژیانی تورکیای هاوچەرخ وناکۆکییەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی، لە جەوهەردا هەمان ئەو ژیان و ناکۆکییەیە کە لە زۆر وڵاتانی دیدا بەدی دەکرێن ". هەر ئەمەش بۆخۆی رازی ناوبانگی جیهانیی نەسینە، بۆ نموونە د. مرتەزا مەردیها دەڵێت: "هەرچەندە فەزای تورکیا لە کارەکانی عەزیز نەسیندا زاڵە، بەڵام کارەکانی بارو دۆخی سیاسی و کۆمەڵایەتی لای ئێمەش دەگرنەوە، کە دەیانخوێنمەوە هەستدەکەم چیرۆکێن خۆماڵی لای خۆمان دەخوێنمەوە "...
هەر بۆیە نەسین توانی لە نێو سەتیریستەکاندا پایەیەکی میللی گەورە نەك هەر لەوڵاتی خۆیدا بەڵکو لە زۆر وڵاتی دیکەدا، لە ڕێگەی وەرگێڕانی بەرهەمەکانییەوە پەیدا بکات..گەشترین نموونەی ئەمەش ڕەزا هەمڕایە (لە دایکبووی ساڵی ١٩١٩یە، نووسەرێکی سەتیرەو دەیان بەرهەمی نەسینی کردوون بەفارسی) کە هەندێ جار ناچار بووە چیرۆکەکانی خۆی بە ناوی نەسینەوە بڵاوبکاتەوە، تا بیروبۆچوونەکانی لە ڕێگەی شۆرەت و نێوبانگی نەسینەوە بڵاو بکاتەوەو ڕەواجیان پێ بدات و خۆیشی لە شەڕی سانسۆرودەزگا سەرکوتکەرەکان دوور بخاتەوە!!
کەواتە بەم پێیە دەکرێت بڵێن کۆمیدیای نەسینی، نموونەیەکی زندوو وبەرچاوی کۆمیدیای ڕەسەنە و بەزەبری ئەفراندن و داهێنان بازنەی ناوچەیی

بەزاندووەو گەییوەتە دنیا وئەوەتا شۆرەتی نەسین، شۆرەتی نووسەرە تورکە سەتیرنووسەکانی تورکیای وەکو: رەفعەت ئیلگاز(١٩١١- ؟) و مزەفەر ئیزگوی کردووەتە ژێرەوەو تەنانەت شانی داوە لە شانی زۆر سەتیرنووسی جیهانی وەکو:ئیریش کاستنەری ئەڵمانی و یوری یاشکی رووسی و ئاندراس کورتیی هەنگاری و ئیلیا پوڤیسلی یۆگسلافی و ئەفرەهیم کیشونی ئیسرائیلی، بەڵکو ناوی لەگەڵ ناوی دیارترین هونەرمەندانی ئەدەبی ساتیری جیهانیدا دەدرەوشێتەوە، لە ئەریستۆڤانی یۆنانی(٤٤٥-٣٨٦ پ.ز)یەوە بیگرە و بە ئاراسمۆسی هۆڵەندی(١٤٦٦-١٥٣٦)وسیرڤانتسی ئەسپانی(١٥٤٧-١٦١٦)و مۆلییری فەرەنسی(١٦٢٢-١٦٧٣)وسویفتی ئیرلەندی(١٦٦٧-١٧٤٥)و ئەندرسنی دانیمارکی (١٨٠٥-١٨٧٥)و گۆگۆلی رووسی (١٨٠٩-١٨٥٢)و توینی ئەمریکی (١٨٣٥-١٩١٠)و ئەناتۆل فرانسی فەرەنسی (١٨٤٤-١٩٢٤)و شۆی ئیرلەندی(١٨٥٦-١٩٥٠)و هاوپتمانی ئەڵمانی (١٨٦٢-١٩٤٦)و ئالکوکونستانتینۆفی بولغاری(١٨٦٣-١٨٩٧)ەوە تا دەگاتە یارۆسلاڤ هاشکی چیکی (١٨٨٣-١٩٢٣).

لێرەدا ئەم پرسیارە بەرۆکمان دەگرێت: چۆن نەسین ئەم ژانرە ئەدەبییە دڵرفێنەی دۆزییەوە؟.. لە بندێڕی وەڵامە پەراگەندەکانی نەسیندا لێرەو لەوێ، ئەوە دەردەکەوێ هەر زوو پەی بە ڕادەی کاریگەری و بایەخی سەتیر بردووەو کەشفی کردووە. هەر لە منداڵییەوە کاتێ کە منداڵێکی بچووک بووە و لەدەرسەکانیا سەرکەوتوو بووەو خەڵکانی دیکەی سمێڵدار دەرنەچوون و زۆرجا سەریان کردووەتە سەری، سەتیر بووە بە تاقە چەکی دەستی و کە دەرەقەتی هاوپۆلە زەلامەکانی نەهاتووە، گاڵتەی پێکردوون و بەر تەوس و توانجی داون و تا وای لێهاتووە گروپێکی لە دەور خڕبووەتەوەو لەسەریان کردووەتەوە. تا وای لێهات نەسین ئەم چەکە کاریگەرو دەگمەنەی لەسەر ئاستی گشتی، بەتایبەتی لەنووسینە ئیبداعیەکانیدا وەکو ئامرازێکی داکۆکی لە چەوساوەو هەژاران بەکار هێنا وبەڵێنی بە خۆی و بە خەڵکی دا کە : "تا زوڵم،

گەوجاندن، چەوساندنەوە، کۆیلاندن و دکتاتۆرییەت بمێنێ، لەسەر نووسینی سەتیر بەردەوام دەبم. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە من تا دوا ساتەکانی ژیانم دەسبەرداری نووسین نابم."

نەسین دڵنیابوو لەوەی کە تەوس و شۆخی دەورێکی یەجگار گەورەی لە ئاشتیدا دەبێت، چونکە وێرای ئاوەرووت کردنی خراپییەکان، دەبێتە مایەی راستکردنەوەو لە نێو بردنیشیان، لەم بارەیەوە دەڵێت: "تۆ کە کۆمەڵگە دەخەیە پێکەنین، یانی تۆ بەشداری لە خزمەتکردنی ئاشتیدا دەکەیت. ژن و مێردێك شەڕدەکەن یانی پێناکەنن، کە دوو مرۆڤ دەکەونە دەمەقاڵێ توند، پێناکەنن. بەلام کە پێبکەنن واتا شەڕەکەیان تەواو بوو. کە دوو سەربازی بەشەڕهاتوو پێکەنین، ئیدی پەنجە بە پەلەپیتکەوە نانەن. "ئا بەمجۆرە نەسین پێی وایە "ئەو پێکەنینانەی لە دنیادا دەنگدەدەنەوە، بەشدارییەکی کارا لە خزمەتکردنی ئاشتی جیهانیدا دەکەن، چونکە هەرگیز دانووی جەنگ و پێکەنین لە یەك مەنجەڵدا ناکوڵێ "

رەنگە ئەوەی یارمەتی نەسینی دابێ بۆ کەشفکردنی بایەخی تەوس و بەکارهێنانی وەکو چەکێك ئەوە بێ کە "ئەدەبی سەتیر هونەرێکی هەرە باوی میللییە لە تورکیاو گەلی تورکی بە هەستی سەتیرئامێزی پەرەسەندووی خۆی بە قووڵی هاوسۆزی دەگەڵ ئەم ژانرە ئەدەبییەدا کە یاسا تایبەتییەکانی چەسپاند، دەکات " بۆیە سەیرە "ئەگەر لە تورکیادا نووسکارێن سەتیر پەیدا نەبن و هەڵنەکەون، چونکە تورکیا –نەسین گوتەنی–بۆ خۆی مەیدانی سەتیر بازییە ".

جا وەکو چۆن رەمزی جوحایی (بەر لە نەسین) لە لای تورك لە ئاخرو ئۆخری سەدەی چواردەی زایینی و سەرەتای سەدەی پازدەی زایینیدا وەکو زەرورەت و پێداویستییەکی ئەدەبی مێژوویی سەری هەڵدا، ئەو حاڵەتە دووبارە لە سەدەی بیستەمدا لە چوارچێوەی فۆرم و ناوەرۆکێکی هاوچەرخ و بەناوی نەسینی (خواجە نەسرەدینی سەدەی بیستەم ) سەری هەڵدایەوە. دیارە لە بارو دۆخ و هەلو مەرجی گۆرانکاری مێژوویی پڕ لە نیگەرانی و لە قۆناغە

دژوارەکانی گوێزانەوەی مێژوویی بە زەبری هێزی سوپایی و ململانێی خوێناویدا، خەڵك ناچار دەبن کە بێدەنگ بن.. چونکە ئازادی دەربڕین لە دەستدەدەن و هەنگێ ویژدانی تاك لەبواری داهێنانی هزری و هونەریدا خۆی لە نێوان دوو هەڵوێستدا دەبینێتەوە. یان لە ناو دەسەڵاتی تازەداو بەدەم ماستاو ساردکردنەوەو ڕیاکارییەوە دەتوێتەوە، کە ئەمە هەڵوێستێکی یەجگار قورسەو نە هونەرمەندی داهێنەر و نەهزرڤانی رەسەن خۆی لێنادەن. هەڵوێستی دووەم ئەوەیە کە خاوەنانی بێدەنگ بن...جا لەو حاڵەتەدا خۆ دەدەنە پەنای ویژدانی دەستە جەمی (میللی) کە ئەویش دەستپێشکەری خۆی دەکات و ڕەمزێکی هونەری سەتیر ، کە رەمزی جوحاییە، هەڵدەبژێرێ یا بەرهەمدێنێ،ئیدی هەمووان لەرێگەی ئەوەوە گوزارشت لە رای خۆیان دەربارەی جووتە دەسەڵاتی سوپایی و سیاسی دەکەن ، لایەکەوەو جیهانبینی خۆیان بۆ بونیادی کۆمەڵایەتی و چۆنییەتی روو بەروو بوونەوەی ئەو بونیادە بەرجەستە دەکەن لە لایەکی دییەوە بەبێ ئەوەی کەسیان دووچاری زەبرو زەنگی دەسەڵاتی سوپایی حوکمڕان ببنەوە... ئەمەش فەندێکی هونەری سادەیە کۆمەڵگە مرۆڤایەتییەکان وەکو گەلان و وەك تاك زانیویانە...و لە رێگەیەوە بوونی کۆمەڵایەتی و ساغڵەمی سایکۆلۆژی خۆیان پاراستووە، بەپێی ئەنجامگیرییەکانی د. محمد رجب النجار.

جا نەسین بەخۆی لەمبارەیەوە بێزاری خۆی سەبارەت بە نالەبارییەکانی بارودۆخی ولاتەکەی دەردەبڕێت و دەڵێت: "من شەرم دەکەم کە تورکم!" هۆیەکەشی ئەوەیە "کەش و هەوای تورکیا دژی دیموکراتییەتە، دەستورێکی دژ بە دیموکراتییەتی تێدایە... جا لەمجۆرە کەش و هەوایەدا ،ناکرێت باسی مافی مرۆڤ بکرێت". جا لێرەدا ئەم پرسیارە بەرۆکمان دەگرێت: ئەدیب کام سەنگەر هەڵدەبژێرێت و چۆن؟!

نەسین پێی وایە مەحەکی ئەدەبی راستەقینە ئەوەیە کە لەسەنگەری جەماوەردابێ و ئەدیب تا دوا هەناسە بەگژ زاڵماندا بچێتەوە. بۆیە زۆر زەحمەتە

ئەو ئەدیبانەی کە لە ئاسودەیی و خۆشگوزەرانی و دڵنیاییدا دەژین، ئەدەبێکی ڕاستەقینەی کاریگەر بەرهەم بێنن و لەمبارەیەوە دەڵێت:

"..باشترین کاری خۆم لە زروفی زۆر سەختدا، لە زندان و تاراوگاندا نووسیوە، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە من داوا بکەم نووسەر بخرێتە زروفێکی سەختەوە، تا ئەفراندن بکات! نووسەر دەتوانێ لە زروفی باشیشدا داهێنانی خۆی بکات، بەڵام ئەوەی دەمەوێ پێی لەسەر دابگرم و دووپاتی بکەمەوە ئەوەیە کە نووسەر پێویستی بە هەندێ جۆری نیگەرانی و بێزاری و تووڕەیی هەیە تا نووسینێکی ئیبداعی بەرهەمبێنێ. ئەگەر ئەو جورعانەی کەم بێ ،ئەوا کارە ئەدەبییەکەی دێتە خوارەوەو لاواز دەبێت." بۆیەش پێی وایە "ڕژیم و سیستەمە زیرەك و فریوکارەکان زۆر بە توانان لەوەدا کە نووسەر لە بورجی عاجی بنەن و گەلەك ڕەمزی ئەدەبییان، کە لە قۆناغێك لە قۆناغەکاندا لە مەیدانی داهێناندا شت بوون پوکاندەوە بەوەی پلەو پایەی سیاسییان پێدان و کۆشك و تەلاریان دانێ و بە گەشت و سیاحەت بۆ هەندەرانیان ناردن..." بەمەش حاڵەتی نیگەرانی و ڕارایی لای ئەو نووسەرانەی کە هەرەشەو گورەشە کاری تێنەکردوون، کەم دەبێتەوە.

هەڵبەتە نەسین کە بەخۆی ئەفسەر بوو، هەرچی دەکرد نەیدەتوانی ئەفسەری و نووسەری پێکەوە بگونجێنێت و هەستی بەناکۆکییەکی زۆر لە نێوان ئەو دوو کارەدا دەکرد، بۆیە دەستی لەو سوپایە کێشایەوە کە لە ساڵانی (١٩٣٧-١٩٤٤)دا کاری تێدا کرد. ئاشکرایە نەسین بەئارەزووی خۆی نەچووە کۆلیجی سوپایی، بەڵکو دەستکورتی و هەژاری ناچاریان کرد ئەو کۆلیژە هەڵبژێرێ چونکە بە خۆرایی بوو. بەڵام کە دەستی کێشایەوە ئیدی هیچ ناکۆکییەکی لەوەدا نەدەبینی کە کۆنە ئەفسەرو تازە نووسەرە، بەڵکو بە پێچەوانەوە شانازی بە قۆناغی قوتابییەتی و خزمەتی سەربازی خۆیەوە دەکرد، کە فێری زەبت و ڕەبت و سەبرو تەحەمولی کردبوو، ئەمە جگە لەوەی وەکو ئەفسەرێك زۆر ناوچەی تورکیا گەڕابوو و بە بەردەوامی تێکەڵی خەڵکی بووبوو،

ئەمە خۆی لە خۆیدا بووە سەرچاوەیەك بۆ نووسینەکانی.. ئەگەر کابرایەکی سیڤیل بووایە بە خۆڕایی ئەو دەلیڤەو زروفانەی بۆ نەدەرەخسا!

## *چۆن وچی دەنووسی...؟

نەسین فایلی تایبەتی بۆ چیرۆك و رۆمان و شانۆنامەو گوتاران کردبووەوەو لە هەر بوارێکدا بینووسیایە پشتی بەو فایلانە دەبەست. لە چیرۆکەکانی سەرەتایدا پشتی بە نەقڵی راستەو خۆ دەبەست و پاشان ئەم قۆناغەی بەزاندو چاوە تیژەکانی کەوتنە قۆستنەوەی رۆژانە رووداوەکان تا بەزەبری ئاوەزی بە توانای بیانگۆڕێت بۆ وێنەی هونەری، ئەمە جگە لەوەی کە بە چاکی ئەفسانەو حیکایەتە میللییەکانی رەعەمەل دێنا کە خۆی لە خۆیدا بە سەرچاوەیەکی دیکەی دەوڵەمەندی کۆمیدیا دەژمێردرێت، ئیدی کەلەپوور و حیکایەتی کۆنی دەهێناو لە قاڵبی تەکنیکی تازەی دەداو چەمك و مەبەستە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکانی خۆی بە دوور لە راپۆرتکاری و جەڵەبییەت پێ دەردەبڕی. واتە نەسین کەلەپوری میللی هەرسکرد ولەباری هونەری و ئەستاتیکییەوە بە جۆرێ دایڕشتەوە کە لەگەڵ ژیانی رۆژگاری خۆیدا بسازێ و بگونجێت.

نەسین توانی بە ئاوێتەکردنی ئەفسانەو واقیع، بازنەی واقیعی سنووردار ببەزێنێ و پێ بنێتە جیهانی بەرینی واقیعی سایکۆلۆژی وەکو کۆڵەکەیەکی بنەرەتی لە کۆڵەکەکانی تەنز لە ئەدەبیاتدا " هەوڵمدا لە رێگەی تێکەڵکردنی سییانەی واقیع، ئەفسانەو دەروونەوە ئەزموونی ئەفراندنی خۆم فراژوبکەم و لە دەروونی خەڵکییەوە نزیك بم، بەوەی بچمە قولایی دەروونیانەوە لە جیاتی وێنە گرتنی رواڵەتی دەروونیان، هەڵبەتە مەودای دەروونی لە شانۆنامەکانم دا زۆری یارمەتی دام ، شەقڵێکی تازەی پێ بەخشین."دیارە ئەمە سەبارەت بە رۆمان و چیرۆکەکانیشی دروستە.

هەرچەند نەسین لە هەڤپەیڤینەکانیدا حەزی نەدەکرد باسی وردەکارییەکانی ژیانی تایبەتی خۆی بکات وخۆی لێ دەبوارد، بەڵام وێڕای ئەوەش دووپاتی کردووەتەوە کە ژیانی سەخت و دژوار بووەو حەزناکات بیگێڕێتەوەو "زۆربەی وردەکارییەکانی ژینم لەبن دێڕی کورتە چیرۆکەکانمدا پەخش و بلاون. خوێنەر دەتوانێ زۆر وردەکاری ژیانم لەوێندەردا بناسێتەوە، منی نووسەر لە ناو هەموو چیرۆکەکانمدا هەم، هیچ چیرۆکێکم لە من خاڵی نییە، ئەگەر وەکو نووسەر بوونم نەبێ ،ئەوا تاپۆو سێبەری من وەکو مرۆڤ هەیە، بەتایبەتی تاپۆی کۆمەڵایەتی یان بەشێوەیەکی وردتر وەکو سێبەری کۆمەڵایەتی."

جگە لە ئەزموونەکانی ژیانی خۆی و ئەو واقیعەی تیایدا دەژیا و ئەو کەلەپورە میللییەی دەوری دابوو، نەسین هەر شتێك ئەزموونی داهێنانی دەوڵەمەند بکردایە بەشێوەیەك لە شێوەکان وەریدەگرت، داهێنەر ، فۆکنەر گوتەنی "دزێکی کارامەیە، دەزانێ چۆن دزی دەکات و چۆن دزییەکانی دەشارێتەوە!" لە راستیدا نەسین ئیعتراف بەکاریگەری چیخۆف لەسەر بەرهەمەکانی خۆی دەکات، هەرچەندە ئەم کاریگەرییە لە تەفاسیلدا دیار نییە بەڵام لە کەش و هەوا گشتییەکەیدا دیارە کە چۆن مامەڵە لەگەڵ مرۆڤی سادەدا و بە شێوازێکی کورتبڕانە دەکات. دیارە بەرهەمێن نەسین لە سێبەری کاریگەری نووسەرانی دیکەی وەکو ئەندرسن بەدەر نین، بۆ نموونە نەسین هەوێنی چیرۆکی (ئافرەتی موجیزە)ی لەو وەرگرتووەو پاشان لە رووی شێوەو ناوەڕۆکەوە بە شێوازی تایبەتی خۆی داپڕشتووەتەوە. نەسین جارێك لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا: "چ فاکتەرێك لە کاری نووسەردا گرینگە؟" دەڵێت: "زەمەن بۆ نووسەر زۆر زەرورییە تا بتوانێ نووسینەکانی پوختە بکات." لێ مەخابن نەسین زۆربەی بەرهەمەکانی پوختە نەکردوون و پەلە پەل و کەڵکەڵەی ژمارە زۆری پێوە دیارە، کەلەپوری دەوڵەمەندی نەسین لە کاڵ و کرچی و کاوێژکردنەوە خاڵی نییە. دەربارەی نەسین گوتراوە کە زیاتر بابەتەکان یەخەی ئەویان گرتووە بۆ نووسین، تا ئەو یەخەی بابەتەکان بگرێ و بیانهونەرێنێ!.. نەسین

تەنزنووسی بە سەیدەلانی شوبهاندووە: "وەکو چۆن سەیدەلانی کەرەستەو گیای جۆراو جۆر تێکەڵ دەکات و پاشان ئاوەکەی دەگرێت و دەیکات بە دەرمانی شەفا بەخش، تەنزنووسیش هەمان شت دەکات، لە هزرو ئاوەزی خۆیدا داب و نەریت و خوو خدە وئاکاری کۆمەڵگە لێك دەداتەوەو شرۆڤەی دەکات و لە ئەنجامدا کارێکی تەوسئامێز و تاڵ و توندو پڕتەشەری وای لێدەخولقێنێ کە تەحەمول ناکرێت، تەنزنووس ناچارە ئەو تلّپەیە بە دەموچاوی خاینان و زاڵمان و سپڵەو نۆکەران و چەقۆکێشانی ناو کۆمەڵگەدا بدات".

## *مرۆڤی سادە قارەمانی سەرەکین...

وێنەی مرۆڤی بچووك و سادە بە شێوەو ئاستی جیاواز لە بەرهەمێن ئەم نووسەرانە بەدیار کەوت: تۆفیق فیکرەت ١٨٦٧-١٩١٥، خالید زیبا ١٨٦٦-١٩٤٥، عومەر سەیفەدین ١٨٨٤-١٩٢٠، رەفیق خالید ١٨٨٨-١٩٦٥، سەلاحەدین ئەنیس ١٨٩٢-١٩٤٢، سەدری ئەرتیم ١٨٩٨- ١٩٤٣، سەباحەدین عەلی ١٩٠٧-١٩٤٨، بەکر سدقی ١٩٠٥- ١٩٥٦ و سەعید فایەق ١٩٠٦-١٩٥٤، کاری ئەمانە دەکەونە خانەی (ریالزمی رەخنەیی) ئەوجا وێنەێن مرۆڤی چالاك و تێکۆشەر لە بەرهەمێن ئەم نووسەرانە دەرکەوتن: نازم حیکمەت ١٩٠٢- ١٩٦٣، کەنعان خەلوسی ١٩٠٨- ١٩٥٤٣، ویەشار کەمال ١٩٢٣- ...ئیدی وێنەی مرۆڤی بچووکی قوربانی چەوساندنەوە، خەریك بوو بە تەواوەتی لە بەرهەمێن ئەوانە، کە شەقڵی (ریالزمی سۆسیالزم)یان وەرگرتبوو، ون ببێ و نەمێنێ.

لێ بەرهەمێن نەسین، باشترین نموونەی ریالزمی رەخنەیین، کە پڕن لە جەماوەری چەوساوە. بەش مەینەت، هەژارو بێنەوایان، ئاوارەو دەربەدەران، بێزراوان و بە پەراوێزکراوان، کە لە بنی بنی کۆمەڵگەوە دەژین و ئەوەی راستیش بێ هەر ئەوان بناغەی کۆمەڵگەن. نەسین بێوچان پەردە لە رووی ئارامیی ساختەو پەردەپۆشکراو هەڵمالێ و پانۆرامایەکی هەموو چین و توێژە

کۆمەڵایەتییەکانمان پێ نیشاندەدات.بەڵام قارەمانی سەرەکی نەسین وەکو نموونەیەکی کۆمەڵایەتی دەرووني هەر مرۆڤە سادەکەی قوربانی دەستی بێدادی کۆمەڵایەتی و چەوسانەوەیە،ئیدی جوتیار بێ یان پیشەوەر، کرێکار بێ یا فەرمانبەری بچووك، یان رۆشنبیری پلیشاوە بێ... لە کەمترین مافێن مرۆڤانی مەحرومەو شەوو رۆژ بە دووی نانێکی حەڵاڵدا هانکە هانکێتی. بەهرەمەندو بە تواناش بێ هەموو دەرگاکان لە رووی دادەخرێن. ئاشکرایە زۆربەی قارەمانانی نەسین لەو جوتیارانەن کە هاتوونەتە شار و لەوێندەر تووشی شەرە شەق و سەریەشە و روتکردنەوەو چەوسانەوە دەبن. دیارە نەسین نایەت وێنەی تەجریدی مرۆڤی سادەمان پیشکەش بکات، بەڵکو لە جوانترین وێنەی کۆمەڵایەتیدا سیما واقیعییەکانی بەرجەستە دەکات. نەسین لەم بوارەدا کاریکاتێریستێکی دەگمەنە بە شێوازە گوزارشتییەکەی پۆرترێتی سەرنج راکێشی قارەمانە قەیراناوییەکانی دەکێشێت، دیمەنی تراجیکۆمیدی چارەنووسی قارەمانەکانی لە کەش و هەوای جیاوازی تورکیایی و نا تورکیایی، کۆن و تازەو ئایندەگەری، واقیعی و فانتازی سەیرو عەنتیکەدا بەرجەستە دەکات. نەسین حیکایەتخوانێکی بە توانایەو شێوازێکی کورتبڕی گێڕانەوەی خۆش و ئیشتیا بزوێنەو خوێنەر رادەکێشێت. زمانی میللی لە دیالۆگی نێوان قارەمانەکانیا بەکار دێنێ، دیارە زمانی هەر قارەمانەش بەگوێرەی ئاستی رۆشنبیری و هوشیاری خۆیەتی و دوورە لە هەر زێدەبێژی و دەستکردییەك. نەسین کە لە ئەدەبی خۆیدا پەنا بۆ مرۆڤی سادە دەبات ودەیکات بە قارەمانی سەرەکی بەرهەمەکانی، ئەمە خۆی لە خۆیدا پەرە پێدانی کەلەپوری میللیە (واتە پەرەپێدانی حیکایەت و نوکتەو نمایشەکانی ئورتاو قەرەقۆزە.)ئەم رەوت و رێچکەیەش لە ئەدەبی تورکیدا دەگەرێتەوە بۆ قۆناغی (سەروەتی فنون) لە سالأنی ١٩٨٦- ١٩٠١دا. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ل.. ئو.ئەلکایڤای توێژەر پێی وایە کە "نەسین خۆی لە چوارچێوەی هاوسۆزی دەگەڵ خەڵکێن سادەدا قەتیس نەهێشتووەتەوە بەڵکو هەندێ جار بە توندی

سیماو خەسڵەتە سەلبییەکانی وەکو تاکخوازی و تەنگبینی و گوێنەدان بە کڵۆڵی و بێنەوایی خەڵکانی دی و تەمەڵی... یانی سەرکۆنە کردووەو دەکات." بگرە گاڵتەیان پێدەکات و عەیبەکانیان بە جۆرێ دەخاتە روو کە خۆیان بە خۆیان پێبکەنن، تا هەستی قەدرو کەرامەتی مرۆڤانیان لە ناخدا بێدار بکاتەوە.

ئەدەبی نەسین کاتێ گەشایەوەو خەمڵی کە هەردوو هوشیاری کۆمەڵایەتی و هونەری تێیدا یەکانگیر بوون و بوو بە ئەدەبێکی ریالزمی رەخنەیی، کە بەشێوەیەکی ئەمین و هوشیارانە واقیعی وێنە دەگرت و تاکیدی لەسەر کرۆك و جەوهەران دەکرد. بەلآم ئەمە واناگەیەنێ کە هەندێ لە کارەکانی ساکارو سەرڤەسەرڤە نەبوون و لە کرۆك و جەوهەردا کاریگەر نەبوون

عەزیز نەسین باشترین شایەتی سەردەمی خۆیەتی و واقیعیانە پشتیوانی لە مرۆڤی چەوساوە کردووەو کەچهۆشی مرۆڤی سادەی داوەتە بەر تەوس و توانج و رەخنە. جا گوتاری ئەدەبی ئەو نووسەرە، تا وەزع و حاڵ و ڕەوشان لێرەو لەوێ نامرۆڤانە بێ هەر بەتەڕو تازەیی دەمێنێتەوەو گەندەڵی دەسەلآتان رسوا دەکات و بەشداری لە بێدار کردنەوەو شۆڕشگێراندن و ئایندەروانیدا دەکات و، بەڕاستی و پڕ بە پێستی وشە ئەدەبێکی واقیعی بێ رۆخ و کەنارە.

## *بێناسنامەکان وەکو نموونەیەك:

دوور لە راستی نییە گەر بڵێن رەنگە هەر هەموو وردەکارییە هونەرییەکانی نەسین لە رۆمانی (بێناسنامەکان)دا بەرجەستە بووبێ. ئەم رۆمانە وەکو شاجوانی کەلەپوری زۆرو زەبەندی نەسین رامان دەگرێت. بەڕاستی پانۆرامایەکی خەستکراوەی چیرۆك و رۆمان و شانۆنامەکانییەتی کە گەندەڵی و قەشمەرجاڕی بیرۆکراتییەت و دکتاتۆرییەت ریسوا دەکەن. ئەو بیرۆکراتییەت و دکتاتۆرییەتەی یەکدەگرن تا مرۆڤانی مرۆڤ بسڕنەوەو بیشێوێنن ئەمما شێواندن... دیارە خراترین بیۆکراتییەت و دکتاتۆرییەت ئەوەیە بتخەنە

پێکەنین. .هەڵبەتە کورتکردنەوەی ئەم رۆمانە لێرەدا ئەستەمە، چونکە رۆمانەکە لە ناوەرۆکدا کۆمەڵێك چیرۆکی گرتووەتە خۆ و، پڕە لە چڕە رووداوان و گەلێك دیمەنێن پانۆرامی بە لق و پۆپی لێدەبێتەوە، بەلام هەوڵێکی لەگەڵ دەدەین تا وێنەیەکی بخەینە بەر هزرو زەینی ئەو خوێنەرانەی کە رۆمانەکەیان نەدیتووە.
نەسین لە (بێناسنامەکان)دا داوی چارەنووسی مرۆڤێکی گوندەکی بە ناوی یەشار(زندە بەفارسی و کوردی)و(حی بە عارەبی) دەگرێتە دەست و بەرەبەرە هەڵیدەکات. (رەشید)ی بابی زندە لەبەر هەژاری و سەرقاڵی بە پەیداکردنی بژێوی و پێداویستییەکانی ژیانەوە، نایپەرژێتە سەر ئەوەی لە دایکبوونی منداڵەکەی لە دایەرەی نفوسدا تۆمار بکات. کە وەختی چوونە قوتابخانەی دێت داوای ناسنامەی لێدەکەن تا بە قوتابی قەیدی بکەن، ئیدی بابی دەچێتە دایەرەی نفوس تا ئەم کێشەیە چارەسەر بکات، لەوێندەر پێی دەڵێن ناکرێ تەسکرەی بدەنێ چونکە کوڕەکەی لە تۆماری شەهیدانی یەکەم جە نگی جیهانیدا تۆمار کراوەو لە ساڵی ١٩١٥دا لەبەرەی چناق قەلادا شەهید بووە و لە دایکبووی ساڵی ١٨٩٦، بابی زۆری پێ سەیر دەبێت چونکە ئەو بەخۆی لە ساڵی ١٨٩٧دا لەدایك بووەو هاجەری ژنی کە لە ساڵی ١٩١١دا خواستوویەتی لەدایکبووی ساڵی ١٩٠٦.
چونکە تۆمارو فایلەکانی دەوڵەت بەلای فەرمانبەری نفوسەوە مەحاڵە هەڵە بکەن و تا رادەی پیرۆزی دروستن، ئیدی زندەی منداڵی کە لە بەردەمیدا وەستاوەو بە چاوی خۆی دەیبینێ لە ناسنامە مەحروم دەکات و بەوەش لە چوونە قوتابخانە بێبەش دەبێت... هەرچەندە بابی تۆڵەی ئەو بێبەشبوونەی بۆ دەکاتەوەو دەیباتە حوجرەکەی گوند و لای مەلا داوود دەیخاتە بەر خوێندن، لێ مەینەتییەکانی زندە (زندووی –مردوو، مردووی –زندوو) لێرەوە دەست پێدەکات و زنجیرەی ژیانی تراجیکۆمیدی زندە یەك لە دووی یەك دێت و ئیدی بە درێژایی تەمەنی دەکەوێتە ناو ونگەو گێژاوەکانی دایەرەو دەزگاکانی دەوڵەتەوە،ئیدی بەپێی بەرژەوەندی دەزگا دەوڵەتییەکان، زیندوو دەکرێتەوەو

دەمرێنرێت. لە تەمەنی بیست ساڵیدا لە کاتی مارەبڕینی ئەقدەس دا کە کیژی دۆستێکی بابییەتی ،دەستگیر دەکرێت کە گوایە لە خزمەتی سەربازی هەڵاتووە، رەوانەی سەربازی دەکرێت و بە خۆشییەوە خزمەتی خۆی ئەنجام دەدات بەو ئومێدەی زندووەو جزدانی ئەسکەری دەدرێتێ... لێ نە دەفتەری خزمەتی وێدەدەن و نە خزمەتەکەی بۆ تۆمار دەکەن، چونکە لە تۆمارەکانی تۆمارگەدا زندوو نییە! ئەمجارەیان دەرکەوت کە لە ساڵی ١٩٣٥دا لە دەڤەری دەرسیم شەهید بووە، کەچی بەرێوەبەرایەتی باج بە میراتگری زندووی بابی ،کە لە کاتی تەواوبوونی سەربازییەکەی زندەدا مردبوو، دەزانێ و هەموو ئەو قەرزو قۆڵانەی کە لەسەری کەڵەکە بوون لەمی دەسەنن، تا بتوانێ میراتەکانی تری بابی وەربگرێت... بەڵام زۆری پێناچێت دیسان دایەرەکانی دەوڵەت بە مردووی لە قەڵەم دەدەن و لە مافی میراتگری بێ بەشی دەکەن. خەزوری (واتە بابی ئەقدەس) ئەوپەری هەوڵی ماددی و مەعنەوی بۆ دەدات و چ لەرووی دانەوەی قەرزەکانی بابی و چ لە رووی پەنابردنە بەر دادگایان و گرتنی ئەوقاتی دەستبڕ کە لە کێشانەوەی هەموو ئەو پارانەی کە زندە قەرزی دەکات ناپرینگێنەوە. ئیدی بە قسەی زل و بۆش و بەتاڵ سەرقاڵی دەکەن! هەر لەو سەروبەندەدا زندە روو دەکاتە ئەستەمبوڵ تا ناسیاوێکی بابی کارێکی بۆ دابین بکات و پێی بژی و بەدەم کارەوە هەوڵبدات بەهەر نرخێ بووە ناسنامە وەربگرێت، بەڵکو بتوانێ بەفەرمی ئەقدەس مارە بکات و بە ئاسودەیی و ئاسایی بژی... لێ هەیهو، لەوێندەرش بوو بە قوربانییەکی چەوسانەوەو دەستبڕی، مادامێکی لەلایەکەوە مردووەو هیچ مافێکی نییەو لەلایەکی ترەوە زندووەو، لەسەرێتی هەموو ئەرکەکانی بێ کەم و زیاد جێبەجێ بکات... بەڵێ کە کار پەیوەست بێ بە بەرژەوەندی دەوڵەتەوە ئەوا زندووە، بەڵام کە نۆرە بێتە سەر بەرژەوەندی ئەو وەکو هاووڵاتی و مرۆڤ ئەوا نەك هەر مردووە بەڵکو شەهیدیشە، بۆیە دەبینین هاواری لێ هەڵدەستێت و دەڵێت: "منی کلۆڵ.. کە ویستم بچمە قوتابخانە، گوتیان نابێ تۆ مردوویت، کە نۆرەی چوونە سەربازیم هات گوتیان تۆ زندووی.

بۆ دانەوەی قەرزو قوڵەی بابم زندوو بووم. بەلاّم بۆ وەرگرتنی میراتەکەی مردوو بووم. کە داوای ناسنامە دەکەم دەڵێن مردوویت. کە داوای وەرگرتنی مافەکانم دەکەم دەمخەنە شێتخانەوە!"و (ئەمە نموونەیەکی راستەقینەی یاساو دادوەرییە لە ولاّتی ئێمە، هەرکەسێك هەقیقەت بڵێ، بە شێت لە قەڵەم دەدرێت و دەبێ بخرێتە شێتخانەوە!) بە راستیش کاتێ لە دایەرەیەکدا هاواری کردبوو کە (من زندووم و شێت نیم) توڕیان دابووە شێتخانەوە. هەروەها جارێکی دیکەش لە زندانیان کردبوو بەو حەساوەی زندووەو سوکایەتی بە فەرمنبەرێك کردبوو لە کاتی ئەنجامدانی کارەکەیدا! تا کار گەییە ئەوەی زندە لەخۆی بپرسێت:

"بەراستی هەندێ جا گومان دەکەم و نازانم من مردووم یان زندووم؟!"

چونکە تەنانەت لە ناو زندانیشدا بۆی نییە کار لە کارگەی زندانەکەدا بکات، چونکە ناسنامەی نییە.ئا بەمجۆرە گەلێك لەو حاڵەتە سەیرە پێکەنیناوییە گریان ئامێزانەمان بەرچاو دەکەون کە زندە سەبارەت بەخۆی یان بەوانەی توشیان دەبێت، دەیانگێڕێتەوە... بۆ نموونە توشمان دەبێت بە توشی (ریچارد- رەشاد) ناوێکی جاسوسەوە کە تۆبەی کردووەو دەیەوێت بەشێوەیەکی ئارەزوومەندانە خۆی بە دەزگا دەسەلاّتدارەکانی تورکیا تەسلیم بکات، تا لە رابردووی خراپی خۆی ژێوان بێتەوەو ژیانێکی تازە دەست پێبکات (ژنێکی تورك بێنێ) کەچی دایەرەو دەزگا ئەمنییەکان هەر ئاوڕی لێنادەنەوە!! یان وەختێ زندە دەیەوێت مەرگە موش بخوات و بمرێت و لە کوڵ ئەو هەموو کلۆڵییە ببێتەوە، نامرێت چونکە مەرگەموشەکە غەشی لێکراوەو بە هیچ جۆرێ کاری تێناکات، کەچی دواتر دەبینین لە ئەنجامی خواردنی خوارنگەیەکەوە ژەهراوی دەبێت و چیوای نامێنێ بمرێت!!

یەکێك لەو گاڵتەجاڕییانەی لە میانەی هەوڵەکانی زندەدا بۆ دۆزینەوەی کارێك کە لە برسا نەمرێت، ئەوەیە کە کارێن وەکو پاسەوانی و بێستانەوانی و پۆستەبەری وا دەخوازن مرۆڤ کارنامەو بەهرەو پسپۆری هەبێ، بەلاّم پلەو پایەی وەکو پارێزگار یان بەڕێوەبەری شارەوانی یان سەفیر هیچی ناوێ مادامێکی

واسیتە لە هەزار بەڵگەنامەو کارنامە باشتر بێ.نەسین تەکنیکی سینەمایی (بەتایبەتی فلاش باک)ی لەم رۆمانەدا بەکار هێناوەو سەرەداوی گێرانەوەی داوەتە دەستی زندە کە قارەمانی سەرەکییە ئەو (مرۆڤە بچووکە —سادە)یەی کە توانای حیکایەتخوانی خۆی (شەهرەزاد ئاسا)، هەموو شەوێك و بە درێژایی هەژدە فەسلأن، لە پاش شێوی ئێوارانی زندانیانەوە تا کاتی نووستنیان، بە شێوازی (هەزارو یەك شەوە) سەلماندووەو لە ماوەی چوار هەفتەدا (کە ماوەی حەپسییەکەی زندەیە) هەموو رۆمانەکە دەگێڕێتەوە. لێ حیکایەتخوانی تەقلیدی (نووسەر یان غەیری نووسەر) تەنیا دەورێکی لاوەکی و بچووکی هەیە، کە هەموو دەورەکەی لە فەسلی یەکەمدا کە دەورێکی بچووکەو لە جیاتی دەستپێکە، ئەوەیە کە گێڕانەوەکە لە فەسلی دووەمەوە تا کۆتایی بە زندە دەسپێرێت ( رۆمانەکە لە هەژدە فەسلأن پێکهاتووە). زندەش تەنیا سەربوری ژیانی خۆی ناگێڕێتەوە، بەڵکو چەند چیرۆکێکی دیکەی هاوپەیوەست لەگەڵ چیرۆکی ژیانی خۆیدا دەگێڕێتەوە کە هیچیان لە چیرۆکی ژیانی خۆی کەمتر نییە... بە شێوەیەکی دوور لە راپۆرتکاری و بەزەبری حیبکە و گرێچنێکی درامی سەرنجراکێش گەشتێکی خۆشمان بەناو رووداو و دیمەنێن دڵگیری گوند و شار و سەربازخانەو شێتخانەو باخ و دایەرەو دادگا و زندان و نەخۆشخاناندا پێدەکات...

زەمەنی گێڕانەوەکە بریتییە لە ماوەی زندانییەکەی زندە، بەلأم زەمەنی گشتی رۆمانەکە هەموو ژیانی دەگرێتەوە لەرۆژی لەدایکبوونییەوە تا رۆژی بەربوونی لە زندان، تا خۆی و ژنەکەی و منداڵەکەیان کە بەرێوەیە، لەناو گێژاوی سیستەمی بیرۆکراتی دژوارو سەختدا رووبەرووی چارەنووسێکی نادیار ببنەوە. جا لێرەدا پاش ئەوەی زۆربەی بەرهەمەکانی نەسینم خوێندەوە دەبێ ئاماژە بۆ ئەو حەقیقەتە بکەم کە ئەم رۆمانە (بێناسنامەکان) گەورەکراوەی دوو چیرۆکی لێکچوون کە بریتین لە (بژی نیشتمان) و(یەشار نە زندووە نە مردوو) کە هەر یەکێکیان بە کورتکراوەو ئەسڵی ئەم رۆمانە دەژمێردرێن، بەتایبەتی یەکەمیان

کە خودی رۆمانەکەیە بە بچووککراوەیی. لێ چیرۆکەکانی دیکەی ناو رۆمانەکە، توانیم ئەسڵی هەنێکیان بدۆزمەوە کە بریتین لە: (لە تاکسیدا)یان (تاکسی پێنج ریاڵی) و (بەشێك لە سامانی دەوڵەت) کە چیرۆکی شەبقەیەکەو ( رووداوساز) ئەو چیرۆکەیە کە قارەمانەکەی بەوەی خۆی دەخاتە بەر ترۆمبێلی دەوڵەمەندان نان پەیدا دەکات، هەروەها (کارتی راسپاردن) کە واسیتەیە، ( خۆکوژی بە مەرگەموش) و (گوڵچی) و ( تەشریفات) ئەمیش چیرۆکی ئەو پیرەژنەیە کە بانگ دەکرێت بۆ خزمەتی ئەسکەری، بەڵام زۆر بە جوانی رەعەمەل هێنراوە.
کە زندە سەربهوردی خۆی دەگێڕێتەوە، گەلێك لایەنی چاکی تێدایە لەوانە سەرنج و خۆشەویستی و سۆزی زندانییەکان چ لەباری مادی و چ لەباری مەعنەوییەوە بۆ لای خۆی رادەکێشێت، هەروەها خەم و پەژارەو داخی کلۆڵی خۆی بەبادا دەدات، چونکە کلۆڵی و داماوی ئەم کوڕە بەرادەیەکە تەنانەت ئەگەر گوێگریشی دەست نەکەوتبایە دەبووایە بەسەرهاتی خۆی بۆ دیواران.. دارو درەختان گێڕابووایەوە دەنا لە داخانا دەتەقی...ئەرێ بەشی ئێمەی ئەدیب و وەرگێڕەرانیش هەر ئەم مەینەتی و کلۆڵییە نییە؟! ئێمەش لە ( اصعف الایمان)دا ناژین؟! لە کۆتاییدا دەبێ قسەیەك لەمەڕ وەرگێرانی کوردیی ئەم رۆمانە دڵگیرەوە بکرێت کە لەلایەن چیرۆکنووس و وەرگێڕی بەتواناو ئەزموندار حەمەکەریم عارفەوە ئەنجامدراوە، جا ئەم وەرگێڕانە هەند جوانە نەك هەر هاوتای وەرگێڕانە فارسییەکە دەکاتەوە، بەڵکو هاوتای دەقە تورکییەکەش دەکاتەوە. خۆزگە چاپی دووەم دەکرایەوە، چونکە چاپی یەکەم ،جگە لە کەمی نوسخەکانی وخراپی کاغەزەکەی و دەرهێنانە هونەرییەکەی، چووەتەخانەی نەبووان و دەست ناکەوێت (لە ساڵی ١٩٨٦داو لە چیا و بەدەم رۆژگاری پێشمەرگایەتییەوە چاپ بووە.)

## *نەسین و ئەدەبی منداڵان:

نەسین جگە لەوەی یەکێکە لە دیارترین وەستایانی ئەدەبی تەنزو سەتیر، لایەنگرێکی بێ هاوتای ئەدەبیاتی منداڵانیش بوو و، لەم رووەوە گەلەك نموونەی جوانی بەرهەم هێناوە کە جوانترینیان بیرەوەری منداڵی خۆیەتی بەناوی ( منیش رۆژێ لە رۆژان منداڵ بووم.)

چونکە نەسین دەرکی بەزەرورەتی ئەدەبێکی تایبەت بە منداڵان کردبوو، بۆیە مشتو مڕێکی زۆری لەگەڵ ئەوانەدا بەرپا کردووە کە پێیان وابوو ئەدەبی منداڵان زەروری نییەو بەرپەرچی گەلێك لە راوبۆچوونەکانی ئەوانەی داوەتەوەو پێویستە پوختەی راوبۆچوونەکانی نەسین لەم بارەیەوە بخرێتە روو.

ئەگەر جیاوازی ئاشکرا لە نێوان تواناو ئاست و شێوەی تێگەییشتنی منداڵان و گەورەدا سەبارەت بە چلۆنایەتی شوێن و کات هەبێ ، ئەوا بێگومان جۆری تێگەییشتنیان لە کا رێن ئەدەبی چوونیەك نابێ، ئەمە جگە لەوەی کە تەمەنی منداڵییەتی مرۆۋ بە چەند قۆناغێکی جیاوازدا تێدەپەڕێت و هەر قۆناغەشیان تایبەتمەندی خۆی هەیەو تەمەنی منداڵییەتی مرۆۋ ڕێژەیەکی زۆری  تێکرای تەمەنی مرۆۋ پێکدێنێ ئەگەر لەگەڵ تەمەنی منداڵییەتی گیاندارانندا بەراورد بکرێ بۆ نموونە (تەمەنی منداڵییەتی هیچ گیانلەبەرێکی رووی زەمین ناگاتە تەمەنی منداڵییەتی مرۆۋ) هەڵبەتە بەرەچاوکردنی تێکرای دەورەی ژیانی هەریەکێکیان.(هەرگیانلەبەرێ بگری لە فیلەوە تا باڵندەو پەرندە، منداڵییەتی ڕێژەیەکی کەم لە دەورەی تەواوی ژیانی دەگرێتەوە بۆ نموونە ڕێژەی منداڵییەتی پشیلە (١-٢٤)ە هی سەگ (١-٢٠)ە کەچی منداڵییەتی مرۆۋ دەگاتە (١-٢) بەو حەساوەی تێکرای تەمەنی(٦٠ ساڵە) یانی قۆناغی کامڵ بوون و پیری دوو قۆناغی کورتن لە چاو قۆناغی منداڵییەتیدا) جا بەم پێیە بوونی ئەدەبی منداڵان بە پێی قۆناغەکانی منداڵییەتی پێویست و زەرورییە، قۆناغی

پـــێش چـــوونە قوتابخانـــە(٠-٦) قۆنـــاغی نەوجـــەوانی(٦-٩) و قۆنـــاغی هەرزەکاری(٩-١٢)و قۆناغی جەوانی و لاوی(١٣-١٨) ساڵان.
زۆرجار ئەوە سەلمێنراوە کە نووسین بۆ منداڵان ئەستەمەو، لە راستیدا قورسترە لـە نووسـین بـۆ گـەورە. بەڵام بۆچـی؟ "چـونکە نووسـەر بـە خـۆی گەورەیـەو لـە دنیایـەکی جیـاواز لـە دنیـای منداڵانـدا دەژی و، لـە منداڵییـەتی خـۆی دوور کەوتووەتەوەو رەنگە هەر بیریشی چووبێتەوە." ئا بەمجۆرە "نووسین بۆ منـداڵان لە جیهانی تایبەتی خۆیاندا وەکو ئەوە وایە بۆ خەڵکانێکی غەریب و بێگانەی خەیاڵی لە دەرێی زەویدا بنووسیت." دیارە ئەمە وا دەخـوازێ کـە "نووسـەر لـە جیهانی خۆی بێتە دەرێ و تا دەتوانێ خۆی بە جیهانی منداڵدا بکات." لێ چۆن ئەمە دەکرێت؟ "هەندێ کەس سوورن لەسەر ئەوەی کە پێویستە نووسەر دابەزێ بۆ ئاستی منداڵ. بەڕای من ئەمە بیرۆکەیەکی هەڵەیە، ئەمە زیاتر لـەوە دەچێت کەسێکی گەورە بێت یاری منداڵانە بکات، واتە لاسایی بکاتەوە، هەڵبەتە ئەمە کارێکی ئاسایی نییە و ئەو کارە ئەدەبییەش کە ئەنجامی ئەوەبێت، ئاسایی نابێت."
نەسین پێی وایە نووسین بۆ منداڵان بەر لەهەر شتێك پێویستی بە تەکنیکە، واتە نووسـین بـۆ منـداڵان جـۆرە تـەکنیکێکی هونەرییـە و مـرۆڤ دەتـوانێ بـەزەبری مومارەسە فێری بێ و مەعلانی لێ پەیدا بکات، وەکو چۆن دەتوانێ بە مومارەسـە فێـری نووسـینی نمایـشنامان ببـێ. لێ نەسـین بـیری دەکەوێتـەوە ودەڵێـت: "مـن مەبەستم ئەوە نییە کە هەرکەسێك مومارەسەی پەیدا کرد ئیدی نمایشنامەی چاك بەرهەم دێنێ، یان کتێبی منداڵانی چاك دەنووسێت، بەڵکو مەبەستم ئەوەیە کـە مومارەسـە زەرورییـە بـۆ بەرهـەمهێنانی کتێبـی چـاك." هـەروەها "نوسـینی درامایـەك بـۆ منـداڵان مانـدووبوونی دووقـاتی دەوێ، بۆیـە پێتڤییـە توانـاو بەهرەیـەکی تـەکنیکیت هـەبێ بـۆ نووسـینی نمایـشنامەو نووسـینی دیکـە بـۆ منداڵان، دەنـا لەوەیـە بـۆت بـێ و بە رێکـەوت شـانۆنامەیەکی باش بۆ منـداڵان

بەرهەم بێنیٚ... لەگەڵ ئەمەشدا ئێمە دەمانەوێت خۆمان لە رێکەوت بپارێزین تا فێر بین بە هوشیارییەوە بنووسین."

## *پۆرترێتی نەسین:

دەموچاوی نەسین (کە ناوی راستەقینەی محەمەد نوسرەت)ە تەنانەت لە پیریشدا هەر دەموچاوێکی منداڵانەی بێگەرد بوو. خۆشترین خواردن بە لایەوە : لۆبیاو ماسی بوو. جگەرەو چایی زۆر دەکێشاو دەخواردەوە. هەمیشە گلەیی لە قەڵەوی و قورسی خۆی دەکرد. بەهۆی ساڵانی دوورو درێژی ناو زندانانەوە، دەستی راستەی پەکی کەوتبوو و نەیدەتوانی بە ئاسانی پێی بنووسێت. بۆیە رەشنووسەکانی بە تەباشیر لەسەر تەختە رەش دەنووسی و پاشان لەسەر ئامێری چاپ(تایپ) پاکنووسی دەکردنەوە. ئەمە جگە لەوەی کە ژنی دووەمی (مارال)لە ساڵی ١٩٥٢وە بەزۆری یارمەتی دەدا لە چاپکردن و چاککردنەوەی نووسینەکانیدا.

وادیارە نەسین کەسایەتییەکی دوو فاقی هەبووە، لە بەرهەمەکانیاو لە ئەدەبەکەیدا هێرشبەرێکی گەورە بووە، کەچی لە ژیانی ئاساییدا شەرمنێکی کەمدووی بەسەبرو زۆر حەلیم بووە، لیٚ لەگەڵ ئەوەشدا خەڵکانێك لە زمانی تیژی کە هەرگیز لە قەڵەمەکەی کەمتر نەبووە، دەرباز نەبوونە. بۆ نموونە دەگێڕنەوە دەڵێن جارێکیان سکرتێرەیەکی نووسەرێك لە یەکێك لە میهرەجانەکاندا لێی دەپرسێت: — من چاوەڕوانی یەشار کەمالم و نایناسم، چۆن بیناسم؟!

نەسین یەکسەر وەڵامی دەداتەوە:

- کە ناشیرنترین پیاوت بینی لە فرۆکە دابەزی و بە زمانێکی تورکی خراپ قسەی کرد، بزانە کە ئەوە یەشار کەماڵە...

ئەوەش روویداو وەختیٚ یەشار کەمال پێی گوت کە چۆن منی ناسیوە، سکرتێرەکە راستی مەسەلەکەی پیٚ گوتبوو، ئیدی یەشار کەمال لە قاقای

پێکەنینی دابوو و گوتبووی:–کەواتە نەسینی ئەدەبسز لێرەیە!نەسین دایکی خۆی زۆر خۆشدەویست و لە بارەیەوە دەڵێت: "هەر شتێکی چاك لەمندا، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو و لە چاکی دایکمەوەیە."و باسی ئەوە دەکات کە چۆن ئەو ئافرەتە چاکەی لە دڵ و دەروونیدا چەسپاندووەو دەڵێت: "دایکم نەخوێنەوار بوو بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ناسك و هەستیارو دڵ و دەروون چاك بوو، جا لەبەر ئەوەی دایکان باشترین ئافرەتێن دنیان، بۆیە دایکم باشترین ئافرەتی دنیا بوو." ڕۆژێك گوڵێکم لە باخچە کردەوەو بەپەلە چووم پێشکەش بە دایکم کرد، کە زۆر شاد بوو و گوتی: بابچین گوڵی دیکەش بکەینەوە.. چووینە باخچەکەوەو گوڵێکی نیشاندام و گوتی:– بڕوانە چەند جوانە. گوڵیش ڕۆحیان هەیە و بۆ خۆ دەژین، ئەگەر گوڵێك بکەینەوە، ئەوا بوونەوەرێکی زندوو ،زندەوەرێك دەمرێت، جا باشتر وایە هەر بە چڵەکەی خۆیەوە بمێنێ، چونکە لە ناو ئینجانەدا ئەم جوانی و تەڕی و تازەییەی نابێ[٢]!"

لێ نەسین هەر زوو و لەتەمەنی یازدەساڵیدا سۆزی ئەم دایکە باشەی لە دەست دا و لە یەکێك لە قەسیدەکانیا بەمجۆرەی دەلاوێنێ:

"جوانترینی هەموو دایکان
جوانترینی هەموو جوانان!
لە سێزدە ساڵیدا مێردی کرد
لە پازدە ساڵیدا منی بوو،
لە هەرەتی گەنجیدا مرد
لە بیست و شەش ساڵیدا..."

لێ بابی هەشتاو چوار ساڵ عومری ڕانی، پیاوێکی دیندار بوو، لەگەڵ ڕاو بیرو بیرکردنەوەی کوڕەکەیدا نەبوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە تەنگانەدا فریای دەکەوت و منداڵەکانی دەلاواند. نەسین لە قەسیدەیەکیدا بە ناوی ( لە یادی بابمدا) ستایشی هەڵوێستەکانی دەکات. نەسین زۆربەی کاتی خۆی لە هەتیوخانەدا بەسەر دەبرد کە بە خۆی بۆ پەروەردەی منداڵانی هەتیوی

دامەزراندبوو، ئەمەی لە سوڕانەوەو دانیشتن و چەنەبازی لەگەڵ نووسەران و ڕۆژنامە نووساندا لە مەیخانەو کۆڕەکان پێ باشتر بوو.. ئیدی نەسین تا دوا ڕۆژەکانی ژیانی و کۆچی دوایی لە ٧-٧-١٩٩٥ هەر جددی بوو. هەمیشە مەرگ و نووسین کەڵکەڵەی بەردەوامی بوون و لە گوتەیەکیدا دەڵێت: " بۆیە دەنووسم، چونکە بیر لە مردن دەکەمەوە." و "مرۆڤی هوشیار کە بیر لە مردن دەکاتەوە، جوانترین کار دەکات." بەڕاستی داهێنەران نە دەتوانن مەرگ بسڕنەوەو نە دەتوانن دوای بخەن، لێ دەتوانن بە گژیدا بچنەوەو سامی بشکێنن، ئەگەر شتێکی نەمریان بەرهەمهێناو جاویدانی پێبەخشین. بێگومان عەزیز نەسین لە جوملەی ئەم نەمرانەیە.

## *نەسین لە بواری ڕۆژنامەوانیدا:

نەسین پاش ئەوەی دەسبەرداری سوپا بوو تا خۆی بۆ ئەدەب تەرخان بکات، ناچار بوو بۆ ماوەیەك لە بوارێن وێنەگری، ژمێریاری، فرۆشیاری دەستگێڕدا کار بکات،بەتایبەتی پاش بەربوونی لە زندانان. لێ نزیکترین کار لە خۆی و لە ئەدەبەکەیەوە کاری ڕۆژنامەوانی بوو، گوتارەکانی یەجگار ئاگرین بوون، زۆرجار بوونەتە مایەی داخستنی ڕۆژنامان و حەپسکردنی خۆیشی، یەکێك لەوانە گوتارێکی بوو دژی شای ئێران و مەلیك فاروق، کە لە سۆنگەیەوە بۆ ماوەی شەش مانگان زیندان کرا. ئەمە ناوی هەندێ لەو ڕۆژنامانەیە کە کاری تێدا کردوون و بەناوی خۆی و ناوی خوازراوەوە کە گەییوەتە (٢٠٠)ناو بەرهەمی تێدا بلاّو کردووەتەوە.

١- لە ساڵی ١٩٣٩دا لە گۆڤاری (یدیگون)دا نووسەر بووە.

٢- لە ڕۆژنامەی (ئەقشام)دا زنجیرە وتارێکی بەناوی (گونەدەکی) بلاّو کردووەتەوەو ڕەخنەی توندو تیژی بە زمانی گوندەکییەکی ساویلکەوە لە بارو

دۆخی خراپی گوندەکان گرتووەو ئەمەش بووەتە مایەی راگرتنی رۆژنامەکەو حەپسکردنی خۆی لە ساڵی ١٩٤٢دا

٣- لەگەڵ سەباحەدین عەلی نووسەردا گۆڤاری(مارکو پاشا)ی لە ساڵی ١٩٤٦دا دەرکردووە، کە گۆڤارێکی سیاسی سەتیر بوو،و زۆر کەسی لەخۆی خڕکردەوە، لێ تەمەنی کورت بوو، بەهۆی گوتارە ئاگرینەکانی نەسینەوە داخرا و بە خۆیشی حەپس کرا.

٤- لەسەرەتای پەنجایەکانی سەدەی بیستەمدا وەکو نووسەر لە گۆڤاری (ئاق بابا)ی هەفتانەدا کاری کردووە.

٥- چیرۆکەکانی لە هەردوو گۆڤاری (میللەت) و (مرۆڤی نوێ)دا بڵاو کردووەتەوە.

٦- رۆژنامەی (تان- فەجر)ی دەرکردو پاشان داخرا.

***پەسننامە دەربارەی نەسین:**

"ئەوە چل و سێ ساڵە ئاق بابا دەردەچێت، گەلێك لە گەورە نووسەرانی تورکی جێی خۆیان تێدا گرتووە وەکو: ئەرجومەن ئەکرەم، عوسمان جەمال، رەشاد نوری،ومەحمود پسەر... لێ شتاقیان وەکو نەسین نەبوون، هەرکە دەستی دەدایە قەڵەم بە ئاسانی لەمەڕ ئەو بابەتەی بەردەمی دەنووسی و سەرکەوتووانەش دەینووسی."

**زیا ئورتاج**

**سەرنووسەری گۆڤاری (ئاق بابا)ی هەفتانە**

***

"گەورەترین تەنزنووسی تورکیایە. لە ئێراندا ناسراوەو زۆر بەرهەمی کراون بە فارسی... خەڵکی بەتاسەوە بەرهەمەکانی دەخوێننەوە، چونکە ژیانی ئەوان عەکس دەکاتەوە... بەخۆی دەڵێت:"کارەکانم بۆیە بەم رادەیە ئێرانییەکان رادەکێشێت، دیارە لێکچوونێکی زۆر لە نێوان هەردوو کۆمەڵگەی تورکی و

ئێرانی هاوچەرخدا هەیە.. هەروەها دەبێ دان بەوەدا بنرێ کە خەڵکی لە هەردوو تورکیاو ئێرانی ئەمڕۆدا لە ڕەوش و باروودۆخێکی چوون یەکدا لەباری کۆمەڵایەتی و ئابوری و سیاسیدا دەژین و بگرە هەمان گیرو گرفت و کێشە ڕووبەڕوویان دەبێتەوە."

تەمین باغچەبان

نووسەرو وەرگێڕی ئێرانی

***

"تەنزنووسەو لە زۆربەی هەرە زۆری ئەدیبانی تورکیا ناسراوترە، چ لەبەر تەوس و توانجە توندەکانی و چ لەبەر زۆری بەرهەمەکانی. یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی نووسینی نەسین ئەوەیە کە ڕووداو و ڕۆژانە مەسەلەکان وەردەگرێت و مامەڵەیان لە تەکدا دەکات، کە ناکۆکییەکانی کۆمەڵگەی تورك دەنوێنێ و، جا چ لە چیرۆکەکانیدا و چ لە کارە ئەدەبییەکانی دیکەیدا وێنەیەکی تەنزاوی پێکەنینئامێزی ئەو ڕۆژانە شتە ناکۆکانە دەگرێت..."

اکمل الدین احسان

توێژەرو وەرگێڕی میسری

***

"ڕەنگە زۆر زەحمەت بێ، لە کۆی ئەدەبی جیهانی ساڵانی چلەکان و شێستەکانی سەدەی بیستەمدا ، نووسەرێکی دی بدۆزرێتەوە بە ڕادەی عەزیز نەسینی بلیمەتی نووسەری تورکیا دیارو بەناوبانگ بێ... دەبێ بۆ هۆی ئەمە ، جگە لە بەهرە خودییە هەرەگەورەکەی نەسین، لە مێژووی ڕەوشی تورکیای تازەدا بگەڕێین، ئەو ڕەوشەی کە ئەم هونەرمەندە دەگمەنەی بەرهەم هێنا و ئەو سەرچاوە زندووەی تەنزو تەنزنووسی بۆ دابین کرد."

خاتوو.ل.ئو.ئەلکایڤا

توێژەری روسیایی

***

"نەسین کۆمەڵێك خەسڵەتی لە خۆ گرتووە کە زۆر زەحمەتە لە یەك کەسدا هەبن، تێکۆشەرێکە لە پێناوی مافی مرۆڤدا،کەسێکە تەنزنووسە، فەیلەسوفە، خەباتکارە دژی هەر توندرەوییەکی نەتەوەیی و ئاینی، ئەو توندرەوییەی هەمیشە حوکمرانان بۆ پەراوێزکردنی هاوولاتیان بەکاری دێنن، نەسین ئاشقی ژیان بوو، لێ لە مردن نەدەترسا، نەسین سنوورو کەوشەنان ناناسێت، بەرهەمەکانی هەموو کۆمەڵگەی مرۆڤ دەگرنە خۆ."

**گونتەر فالراف**

**نووسەری ئەڵمانی**

***

## *ئەو خەڵاتانەی نەسین وەریگرتوون:

ئەوەی غەریب و سەیرو مایەی گاڵتە پێکردن و تەوس و توانجە ئەوەیە کە نەسین بە پێچەوانەی ئەدیبان و هەڵکەوتوانی جیهانەوە، لە هەندەراندا شۆرەت و ناوی پەیداکرد و خەلاتانی وەرگرت، بەر لەوەی تورکیای ولاتی خۆی ئەم کەسایەتییە ئەدەبییەی خۆی بناسێت، ئەمەش لیستێکە لەو خەڵاتە ئەدەبییانەی بە رەنجی خۆی و بەرهەمی خۆی وەریگرتووە:

١-(گەلای زێڕین) ١٩٥٦،ئیتاڵیا. لەسەر چیرۆکی(فیلەکەی حەمدی)کە زۆر تەنزنووسی دیکەی دنیا لە ١٢٧ دەوڵەتی دنیاوە بەشداری ئەم پێشبڕکێیەیان کردبوو.

٢-(گەلای زێڕین)١٩٥٧،ئەڵمانیا، لەسەر چیرۆکی( ئاهەنگی کردنەوەی کارگەی تازە).

٣-(ژیشکی زێڕین)١٩٦٦،بولغاریا، لەسەر چیرۆکی (خزمەتێکی نیشتمانی) لە فیستیڤاڵی رێزگرتنی تەنزنووس ئەلکوکونستانتینۆف و ٣٠٠نووسەری دنیا

بەشداری پێشبڕکێیەکەیان کردبوو، خەڵاتی یەکەم بە نیوەیی درا بە نەسین و نووسەری ئەڵمانی ئەریش کاستنەر.
٤-رۆژنامەی (میللەت)،تورکیا، لەسەر شانۆنامەی( سێ قەرەقۆز).
٥-گۆڤاری (تیمساح)١٩٦٩،مۆسکۆ، لەسەر چیرۆکی (خەڵکی رادەبن).
٦-(کۆڕی زانیاری تورکی)١٩٧٠، لەسە چیرۆکی(چیچو)
٧-(لوتس)١٩٧٤،یەکێتیی نووسەرانی ئافرۆ ئاسیایی.
٨-(خیتری پیوتر)١٩٧٩،بولغاریا.
٩-فیستیڤاڵی(ئەو نووسەرەی گەل هەڵیبژارد)١٩٨٥-١٩٨٦،تورکیا.

تێبینی:مامۆستای ئەدیب جەلال زەنگابادی بۆ ئەم باسە شازدە سەرچاوەی بەپێزی عەرەبی و فارسی و ئینگلیزی و تورکی و ئینتەرنێتی بەکار هێناوە ،کە بەندە لەبەر هەندێ هۆی تەکنیکی نەمتوانی لێرەدا تۆماریان بکەمەوە، جا هەرکەسێك ئەو سەرچاوانەی مەبەست بێ دەتوانێ بگەڕێتەوە سەر ئەو سەرچاوەیەی کە بەندە باسەکەم لێوەی وەرگێڕاوە کە بریتییە لە:
گۆڤاری(گولان العربی) ژمارە(٨١) شوباتی ٢٠٠٣ل١٧٧-١٨٥.

(١)

یەکێك لە خۆ خلافاندنو سەر گەرمی بەندییان چیرۆك گێڕانەوەیە. لە زۆربەی قاوشەکاندا یەکێك هەڵدەکەوت کە شەوانە چیرۆکی بۆ بەندییەکان دەگێڕایەوە. هەر کە دنیا تاریك دەبوو، و بەندییەکان شیڤیان دەخوارد، لە بێکاریدا لە دەوری کاکی چیرۆك بێژ خڕ دەبوونەوە... بە گوێ گرتن لە چیرۆكو سەربوردەی سەر گەرم کەر کاتی پڕ خەمو خەفەتی زیندانیان فەرامۆش دەکرد.

چاکترین حەکایەتخوانو چیرۆك بێژ دەچوونە قاوشی یەك. بەندییانی ئەم قاوشە بە زۆری پارەدارو دەوڵەمەندو رێك و پێك بوون. چاکتر ئەرکی چیرۆك بێژیان دەکێشا. لە رووی خۆراك و جێگاو جگەرەو شتی دییەوە خافڵیان نەدەکرد. چیرۆك بێژیش بۆ ئەوەی پتر خۆی خوشەویست بکاتو زیاتر سەرنجی بەندییەکان رابکێشتو ئالودەیان بکات، زۆر بە تاسوقەوە چیرۆکەکەی دەگێڕایەوە تا بەندییەکان شریتی عومری رابوردوویان لە بیر بچێتەوە.

یەکێك لەم چیرۆك بێژانە لە راستیدا حەشری دەکرد. بەندییە ئەبەدییەکانیش تا ئێستا وێنەی ئەویان نەدی بوو. دەیان بگرە هەزاران رۆمانی خوێندبووەوە و هەمووی ئەز بەر بوو. جا چ رۆمان گەلێکیش: بێ نەوایان، ژنی نانەوا، ئاسنگەران، سێ پیاوی جەنگاوەرو...

هەر چەند شەوێك، یەكێك لەم ڕۆمانانەی بۆ بەندییەكان دەگێڕاوە. هەندێكیان دەیان جاروبگرە پترش ئەم چیرۆكانەیان خوێند بووەوە، یان لە چیرۆك بێژانیان ژنەوتبوو.. بۆیە حەزیان دەكرد شتێك لە عوسمانیش ببیەن.

چیرۆك گوتن تا نیوە شەو درێژەی دەكێشا، لە سەعات دوانزەی تەواودا چیرۆك بێژ، لە جێیەكی ناسكدا چیرۆكەكەی دەبڕیو پاشماوەكەی بۆ سبەی شەو دەهێشتەوە.

بەندییەكان كە بە تەواوی مەستو خۆشحاڵ دەبوون، بە ڕەزامەندییەوە لە چەپڵەیان دەدا و دەچوونە ژێر جێگاوەو لێی رادەكشان. ئەم چیرۆك بێژە یەك عەیبی هەبوو، چونكە لە سەر هیرۆیین راهاتبوو، هەركە هیرۆیینی لێ دەبڕا، دەكەوتە وڕێنە! بۆیە بەندییەكان ناچار بوون تێوەی ژەنن و لە خەوی هەستێنن.

ڕۆژێ یەكێك لە بەندییەكان پێنج سەد لیرەی لێ گوم بوو. ئەم مەسەلەیە دەنگی دایەوە، گشت بەندییەكانی قاوشی یەكی پەستو نیگەران كرد. تاكو ئەو ڕۆژە شتی وا لە قاوشی یەكدا ڕووی نەدا بوو، بەندییانی قاوشی یەك هەموو بەرچاو تێرو خانەدان بوون، دزییان بە گەورە ترینو نەگریس ترین خیانەت دەزانی. بەلای ئەوانەوە دزی ئابرومەند هەرگیز دزی لە دزانی دی ناكات. گشت بەندییەكان گومانیان لە كابرای چیرۆك بێژ بوو.. چونكە ئەو بابایەكی تلیاك كێش بوو، وجگە لەو پارەیەی كە بەندییەكان پێیان دەدا چ دەرامەتێكی دی نەبوو. كابرای چیرۆك بێژ كە بەمەی زانی گوتی:

- برادەران، وەرن بم پشكن. بێ شەرەف بن ئەگەر ئەمە نەكەن. ردێن چەرموی قاوشەكە، لێفە و دۆشەكی كابرای چیرۆك بێژی هێناو لە ناوەندی ژوورەكەدا فڕێی دا... برادەران پارەكەیان لە نێو نوینەكانیدا دۆزییەوە، خۆشیان بە پاڵ كردە دەرەوە.

ئەو شەوە هەموو بەندییەكان بە نیگەرانی سەریان نایەوە، جێی چیرۆك بێژەكە دیار بوو، و دەبووا بەهەر نرخێك بووە چیرۆك بێژێكی دی پەیدا بكەن.

## (٢) منداڵێك كە هەشت ساڵ بەر لە دایكی و یەك ساڵ بەر لە باوكی هاتۆتە دنیاوە!...

سبەی بەیانی بەندییەكان هەموو بە چەشنی سەرخۆش وڕو وكاس بوو بوون، تاقەتیان نەبوو لە نێو جێگاكانیان بێنەدەرەوە.

وەختێ كە ماموری زیندان هات بێداریان بكاتەوە، ریش سپی زیندان هێشتا لە نێو جێگاكەیدا راكشا بوو، گوتی:

– قوربان وازمان لێ بێنە. چ سەر مەخە سەرمان، گەلەك بێ حەواسین. دوێ شەو نە نووستووین.

ماموری زیندان یەكێكی كوڵەبنە بوو. هەموو پێیان دەگوت بستە باڵا. ئاگاداری پێشهاتەكە بوو، وەڵامی دایەوە:

– ئێوە ئێستا هەستن، قەولی پیاوان بێ ئەگەر لە بنی عەرزیشا بووە حەكایەتخوانێكی چاكتان بۆ پەیدا بكەم.

بەندییەكان بە نابە دڵی هەستان. بەرنامەی رۆژانەی زیندان بە بێ تاقەتی و تەمەڵییەوە دەستی پێكرد. كەس تاقەتی شوخیو قسە كردنی نەبوو.دوای نیوەڕۆ بەندیی تازەیان هێناو بەسەر قاوشەكانا دابەشیان كردن.كابرای كوڵەبنە، گەنجێكی رەقەڵەی رەنگ هەڵبزركاوی بۆ قاوشی یەك هێناو بەردێن سپی قاوشەكەی گوت:

– ئەم كوڕە بابایەكی تازە كارە... بە باشی نازانم بینێرمە قاوشەكانی دی. ئەمشەو لەلای خۆتان گلی بدەنەوە، جێگاكەی عوسمانی بدەنێ تا سبەینێ تەگبیرێكی دەكەم.

بەندییانی قاوشی یەك رازی نەبوون بابایەكی غەریبە بێتە ژوورەكەیان.لێ كە چاویان بە قەڵافاتی ترساوی كەوت كە وەكو بێ نێو ئاو دەلەرزی و زاتی نەدەكرد سەیری ناوچاوی كەس بكات، دڵیان پێ سووتا. ردێن سپی قاوشەكە بە نا بەدڵییەوە گوتی:

- دانیشە بابە گیان.. مەترسە.. هیچ خەمت نەبێ.

بەندییە تازەکە لەو جێیەی کە بۆی دەست نیشان کرا دانیشت. یەکێك لە بەندییەکان جگەرەیەکی دایە. گەنجە تازە هاتووەکە جگەرەکەی وەرگرت. چونکە شقارتەی پێ نەبوو چاوەروانی کرد تا یەکێکیان شقارتەی بداتێ. بەهەر حاڵ جگەرەکەی داگیرساند. ردێن سپی قاوشەکە پرسی:

- لێفەو راخەرت هەیە؟

- نەء.

- تۆ کێیت وچ کارەیت؟

کوڕە گەنجەکە وەڵامی نەدایەوە...

ردێن سپی لێی پرسییەوە:

- تاوانت چییە؟

گەنجەکە دیسان وەڵامی نەدایەوە. یەکێك لە بەندییەکان بە تەوسەرە گوتی:- هەڵبەتە تاوانی نەکردووە!...

دوو سێ کەس پێکەنین. کوڕە گەنجەکە بێ سڵ کردنەوە گوتی:

- گوتتان، تاوانم چییە؟

- بەڵێ، براله، خۆ بە خۆڕایی بۆ ئێرەیان نە هێناوی؟

تەواوی بەندییەکان بە بێدەنگی و تاسەوە چاوەڕێی وەڵامی بەندیی تازە بوون. ئەویش بە کورتی گوتی:- هیچ!

هەموو، تێکڕا لە قاقای پێکەنینیان دا. بەندیی یەکەم گوتی:

- نەمگوت تاوانی نییە!...

بەندییەکی دی بەتەوسەوە گوتی:

- بەستەزمانە لە مزگەتدا دەریان هێناوەو بۆ ئێرەیان هێناوە!..

دیسان بە دەنگی بەرزپێکەنین. ردێن سپی قاوشەکە گوتی:

- کوڕی باش، من بە قەد تەمەنی تۆ حەپسیم کێشاوە، تا ئەمڕۆ نەمدیوە کەسێك بڵێ من فلان خەتام کردووە بۆیە زیندان کراوم، هەموو هەر دەڵێن بێ گوناحین!...

بەندییەکەی تەکی کە جگەرەکەی پێ دابوو گوتی:

- برادەر گیان خەجاڵەت مەبە... هەمووومان هەر گیرۆدەی یەك نەگبەتین، دەمانەوێ وەخت بە سەربەرین و مژول بین. چ شەرمیش نییە پیاو بکەوێتە زیندانەوە، ئەم گرفتارییانە دێنە ڕێی هەموو پیاوێك. بڵێ بزانین مەسەلە چییە؟

بەندیی تازە دیسان ورتەی نەکرد. وەك بڵێی هیچ قسەیەکی پێ نەبێ.

ردێن سپی قاوشەکە پرسی:- بەلای کەمەوە بڵێ بزانین نێوت چیە؟

- زیندە!...

- ئەمە نێو نییە؟ ئەی نێوی باوکت چییە؟

کە بەندییە تازەکە وەڵامی نەدایەوە، یەکێك لە بەندییەکان گوتی:

- دیارە دەبێ باوکی نەبێ! بێ کەس و کارە!...

کابرای گەنج هاتە وەڵام:- بۆنەء، باوکم هەیە... نێوی مردەیە.

- چیت گوت؟

- عەرزم کردن نێوم زیندەیە و نێوی باوکیشم مردەیە.

ردێن سپی قاوشەکە بە نارەزاییەوە گوتی:

- ئەوە مەزاقمان پێ دەکەی کوڕۆ؟

- نە بەخوڵلای... هەر ئەوەیە کە عەرزم کردن، من بابایەکی زیندووم کە لە مێژە مردووم!...

سەدای پێکەنینی بەندییەکان بەرز بووەوە، ردێن سپی قاوش گوتی:

- بەم عومرە گەییم شتی وام نەبیست...

یەکێك لە بەندییەکان گوتی:

- ئێ ڕاست دەکات، چما ئێمە کە ئێستا زیندووین، ئەمە ژیانە؟

یەکێکی دی گوتی:

– ناشوکری مەکە برادەر... لە ئێمەش خراپتر هەن. مەسەلێکی مەنشورە کاتێ کە زەلامێکیان بردە پای قەنارە، برادەردەکەی پێی گوت خەم مەخۆ لەمەش خراپتر هەیە... کابرای مەحکوم گوتی:– گەوجە لەمە خراپتر چییە؟ برادەرەکەی گوتی: بەڵێ خراپترش هەیە، جاران کە یەکێکیان ئیعدام کردبا بەر لە ئیعدام کردنەکەی قازوقیان تێ دەبڕی!

بەندییەکان لە ژێر لێوەوە گوتیان:

– هەزار شوکر کە ئێمە هێشتا زیندووین.

ردێن سپی قاوشەکە گوتی:

– کاکی زیندە وێ دەچێ بەسەرهاتی تۆ زۆر سەرنج راکێش بێ... بڵێ بزانم چیت بەسەر هاتووە؟!...

زیندە ناچار بوو سەر بهوردی خۆی بگێڕێتەوە، گوتی:

– ئێوەگەل، چاك یان خراپ بۆ خۆتان دەژین، بەلاّم من، من لە خانەی زیندوواندا نیم!...

بەندییەکان تەماشای یەکیان کرد، بە ئیشارەت یەکدییان حاڵی کرد کە یارۆ شێتە... ردێن سپی قاوشەکە پرسی:

– یانی تۆ ئێستا زیندوونیت؟!

– بە خوڵلای نازانم چۆنتان بۆ باس بکەم.. ئێوە زەلامێك لە بەردەم خوتاندا دەبینن، وایە؟

– بەڵێ... دەی بینین.

– نەکەونە فێڵی چاوتانەوە، لە راستیدا ئەوە من نیم.

یەکێك لە بەندییەکان بە کەم حەوسەڵەییەوە گوتی:

– یارۆ کردوینی بەفیلیم، وڕینە دەکات.

ردێن سپی قاوشەکە بە ئیشارەتی دەست بێدەنگی کردن‌و گوتی:

– ئەم بابایە، پیاوی ئەم قسانە نییە، ئێمە خۆمان رۆژگارمان خەتم کردووە، قەرەباڵغی مەکەن بزانم مەسەلە چییە

یەکێك لە بەندییەکان پرسی:

– بە قسەی تۆ بێ، تۆ ئێستا لیرە نیت؟

– راستە.. یانی هەمو نیم...

یەکێك لە بەندییەکان بە تەوسەوە گوتی:

– ئەم برادەرەیان بە هەڵە بۆ ئێرە هێناوە... دەبووا بۆ شێت خانەیان ببردایە!

زیندە نیگایەکی تەوس ئامێزی تێ سرەواندو گوتی:

– کە گوێت لە بەسەر هاتەکەم بێ ئەوجا باوەڕدێنی کە زۆر ساغم.

ردێن سپی بە گلەییەوە گوتی:

– باشە زووتر باسی بکە بزانم چییە؟

(زیندە)، هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا و دەستی بە گێرانەوەی بە سەر هاتی ژیانی خۆی کرد:

– کە یەکەم جار زانیم مردووم، تەمەنم دەساڵ بوو.

یەکێك لە بەندییەکان پرسی:

– چۆن زانیت مردوویت؟

– ئەو گوندەی کە تیای لە دایك بووم، ئەوسا قوتابخانەی دەوڵەتی تێدا نەبوو. تەنیا حوجرەی تێدا بوو، حوجرەکەی مەلا داود، ئەو مەلا داودە لەسەر شێوازی کۆن قورئانی بە منداڵان دەگوتەوە. دوای هاتوچۆیەکی زۆر دەوڵەت ناچار بوو قوتابخانەیەکی تازە بابەت لە گوندە-کەماندا بکاتەوە. چونکە بابی منیش یەکێك بوو لە ناوداران، دەوڵەمەندی گوندەکە، بڕیاری دا نێوم لە قوتابخانەکە قەید بکات، ئەوە بوو رۆژێ دەستی گرتمو چووین بۆ قوتابخانە.

سەرنجی بەندییەکانی راکێشا، حاڵی بوون کە ئەم تازە بەندییە شێت نییەو بەسەر هاتەکەشی دڵگیرە. بە کرپیەکی تەواوەوە گوێیان بۆ قسەکانی شل کرد.زیندە زۆر شیرینو ئارام دەدوا، بێ ئەوەی گوێ بەقسەی بەندییەکان بدات درێژەی بە حەکایەتەکەی دا.

- بەڕێوەبەری قوتابخانەکە ئاشنای بابم بوو... زۆر بە گەرمیو رووخۆشییەوە دەستی بابمی گوشی و چاك و خۆشی لەگەڵ کرد. بابم گوتی:

- دەمەوێ نێوی کورەکەم لە قوتابخانەکەی ئێوەدا قەید بکەم.

بەڕێوەبەر گوتی: کارێکی زۆر چاکە... ماشەڵڵا کورەکەت گەورە بووە، کەمێکیش دوا کەوتووە، ناسنامەکەی کەرم بکە با نێوی بنووسم. کە جەنابی بەڕێوەبەر، نێوی ناسنامەی برد، بابم هەڵوەستەیەکی کرد و گوتی: فەرمووتان ناسنامە؟.. ناسنامەی بۆ چییە؟ جەنابی بەڕێوەبەر گوتی: بەڵێ، ناسنامەی پێویستە. بابم دیسانەوە خۆی گێل کرد وپرسی: ناسنامەی بەندەت دەوێ؟ و دەستی بە بەرکیا کرد تا ناسنامەکەی خۆی دەربێنێ. بەڕێوەبەری قوتابخانە گوتی: نەخێر قوربان ناسنامەی منداڵەکەم دەوێ... بابم دەستی بە پێکەنین کردو گوتی: منداڵێکی بستو نیوی، ناسنامەی بۆ چییە؟ جەنابی بەڕێوەبەر دیسان پێکەنی و گوتی: بێ ناسنامە ناتوانین نێوی کەس لە قوتابخانە تۆمار بکەین... بابم نارەحەت بوو، و گوتی: ناسنامەکەیم گوم کردووەوکاتم نییە بیبەم دانەیەکی دی بۆ دەربێنم. بە ناسنامەکەی من ناو نووسی بکە دوایی ناسنامەکەی خۆی دێنم!

بابم کە دوکانداری شارە دێیەکە بوو، لێرەشا هەر چەنەبازی دەکرد! هەر چەندە جەنابی بەڕێوەبەر دەیگوت نابێ، بابم ناچووە ژێر بارو پێی دادەگرت کە جەنابی بەڕێوەبەر ناسنامەکەی بابم لە بری ئەوەکەی من قبوڵ بکاتو دەیگوت: جەنابی بەڕێوەبەر لە ئەنجاما هەموو شتێکی من دەبێ بەهی ئەم کوڕە!.. زەوی.. خانوو.. باخ.. دوکان، تەواوی ژیانی من دەبێ بەهی ئەو، ئیدی کو ناتوانێ سوود لە ناسنامەکەی من وەربگرێ؟

جەنابی بەڕێوەبەر بە خۆرایی خۆی ئەزیەت دەدا کە قەناعەت بە بابم بکات... چمکی چاکەتەکەی بابم گرتو بە ئەسپایی گوتم:

- بابە با بچینە لای مەلا داود... حوجرەکەی ئەو چاکترە...

بابم گوتی:- راست دەڵێی کورم، ئەو ناسنامەی ناوێ. دایەرەی دەوڵەت حەوسەڵەی گەڕەکە!

جەنابی بەڕێوەبەر کە نەی دەویست دڵی بابم بڕەنجێ گوتی: ئەمە گرفتێکی ئەوتۆ نییە، چ زەحمەتێکی تێدا نییە، عەرزوحاڵێ بنووسە بۆ دایەرەی ئامار و بە دوو سێ رۆژان ناسنامەکەی تەواو دەبێ... مەخابنە ئەم منداڵە بخەیتە حوجرە.
لە قوتابخانەکە هاتینە دەرێ و یەکراست چووین بۆ بەر مزگەوتی گوند، عەرزوحاڵ چییەك لەوێ بوو، گوێی لە قسەکانی بابم گرت، عەرزوحاڵێکی بۆ دایەرەی ئامار نووسی، ئەوجا پەنجەکەڵەی دەستی چەپی بابمی گرت و بە ئەستامپاکەیدا سووی و پایینی عەرزوحاڵەکەی پێ پەنجە مۆرکرد...
عەرزوحاڵمان بردو چووین بۆ دایەرەی ئامار... وای، وای چ حەشرێ بوو، هێندە قەرەباڵغ بوو سەگ ساحێبی خۆی نە دەناسییەوە.
بابم گوتی:– رۆڵە گیان، ئەگەر دەمزانی ناسنامە دەرکردن ئەمەندە هاسانە تا ئێستا حەوت زەمان بوو ناسنامەم بۆ دەرهێنا بووی.
بابم عەرزوحاڵەکەی نیشانی ئەم و ئەو داو پرسی کە مراجەعەتی کوێ بکەین. دوای سەرو سۆراغێکی زۆر ئەو مامورەمان دۆزییەوە کە کارەکەی ئێمەی بە دەست بوو... نزیکەی پازدە ساڵ بەسەر ئەو رۆژەگارەدا تێ پەڕیوە، کەچی هێشتا قەلافاتی ئەو مامورەم هەر لەبەر چاو ماوە و تاکو ئێستا بنیادەمێکم نەدیوە لەو بچێت... کە دەڵێم بنیادەم... لاتان وایە چۆن چۆنی بوو؟
هێندە لاوازو داتەکیوو بوو، یەك یەك پەراسوکانیت بژماردبا. سەری رووتاوە، چاوەکانی بە قوڵا چوو بوون، لێوە ڕەشبەکانی دڵی بنیادەمیان تێك دەدا، یەك سەعاتی رەبەق لەبەردەم ئەو پیاوەدا وێستاین، من بە نیگەرانی و ترسەوە دەمڕوانییە سەروسیمای و زاتم نەدەکرد لە جێی خۆ ببزووم... بە ئەسپایی لە بابم پرسی: بابە ئەوە ناواخنی ئەم زەلامەیان دەرکردووە؟ بابم مۆڕیەکی لێکردمو:وس ڕۆڵە یارۆ بژنەوێ تووڕە دەبێ.
دوای ماوەیەك بە دەنگێکی گڕی ئەوتۆ کە لەو قەلافاتە ناهات لە بابمی پرسی: چیت دەوێ؟ بابم زۆر بە ڕێزەوە گوتی: قوربان عەرزوحاڵێکمان هەیە. بە هەر

دوودەست زەرفەکەی بۆ درێژ کرد و لە سەری رۆیی: ناسنامە بۆ کوڕەکەم دەردێنم...

مامورەکە، عەرزوحاڵەکەی وەرگرت. ماوەیەك سەیری کرد. چەناگەی خوراند، دوو سێ جار عەینەکەکەی بەرزونزم کردەوە و گوتی: ئا... ئا... ها... ئا... ئەوجا پرسی: ناسنامەکەی خۆت کوا؟ بابم دەست بەجێ ناسنامەکەی خۆی دەرهێناو دای پێی، مامورەکە ناسنامەکەی باوکمی وەرگرت، ماوەیەك ئەم دیو و ئەو دیوی کرد، تەماشای پەڕەکانی کرد، دەنگێکی تایبەتی لە دەمییەوە دەرهێنا. چەند جارێ عەینەکەکەی بەرز کردەوە، پەردە ڕەشەکەی پشت سەری لادایە لاوە. لە ژوورەکەدا دۆسییەو تۆماری ئەستور لەسەر یەکدی هەڵچنرا بوون... دەستی بە هەڵدانەوەی پەڕەی تۆمار و دۆسییەکانِ کرد. ماوەیەك ژێرو ژووری کردن. تۆمارەکان بە ئەندازەیە ئەستوورو قەبە بوو بوون کە یارۆ نایتوانی بەرزیان بکاتەوە، زۆری نەما بوو بە عەردیدا بکەوێ. لە یەکێك دەچوو کە لەگەڵ یەکێکی دیدا بە شەر هاتبێ. بە هەزار حاڵ دۆسییەکانی بەرز کردنەوە، ماوەیەك لەگەڵ تۆمارەکاندا زۆرانبازی کرد.. کەوتە هەناسە بڕکێ.. بە ئەسپایی بە بابم گوت: بابە دەکرێ کۆمەکی پێ بکەین... ئەم کابرا مردەڵەیە تاقەتی نییە تۆمارەکان بەرز بکاتەوە. باوکم دەستی گوشیمو بە ئەسپایی گوتی: دەیەوێ بە دووی سابیقەدا بگەڕێ!.. ئێمە خەتو خوێندەواریمان نییە کە یارمەتی بدەین...

کابرای مامور کە لە تەواوی کونەکانی لەشییەوە ئارەقەی دەردەدا، بە هەزار حاڵ یەکێك لە تۆمارەکانی هێناو لەسەر مێزەکە داینا، بە سیمای شەکەتەوە کەوتە پەڕە هەڵدانەوەی دۆسییەکە... دۆسییەکان هێندەیان گەردو تۆز لێ نیشتبوو کە مامورەکە هەر پەڕەیەکی هەڵدەدایەوە یەك دنیا تۆزی لێ هەڵدەستا. چاوم بڕی بووە پەنجە لاوازکانی کابرای مامور، لە پڕ پەنجەی لە جێیەك راگرت و گوتی: ئەها... دۆزیمەوە.

ئەوجا وەکو یەکێك کە فەتحێکی گەورەی کرد بێ و پەردەی لە سەر نهێنییەکی مەزن لادابێ رووی کردە بابم و پرسی: تۆ ناوت (رەشیدە)؟

بابم گوتی: بەڵێ.. وایە.

مامورەکە سەری لە قاندو گوتی: لە ساڵی ١٨٩٧ دا لە دایك بوویت؟ بابم گوتی: بەڵێ.. وایە.

مامورەکە هێشتا هەر سەری دەلەقی، پرسی: لە گەڕەکی ئاشەکە.. کۆڵانی تاوس کاشی، ژمارە هەشتی کۆن و ژمارە بیست و هەشتی نوێ دا دادەنیشیت و لە ساڵی ١٩١١ دا (هاجەر) خانت خواستووە؟

بابم بەوپەڕی خۆشحاڵییەوە گوتی: زۆر تەواوە.. چۆن دەفەرموون وایە، حەمدو سەنا بۆ خوا.. هەزار شوکرکە زوو دۆزرایەوە. کابرای مامور بەسەر سامییەوە پرسی: بۆ کوڕەکەت نێو ناوە (زیندە)؟ بابم بە پێکەنینەوە گوتی: هەموو منداڵەکانی پێش ئەومان مردن، لەبەر ئەوە نێومان لێ نا زیندە.

سەرم لەوە سوڕما بوو کە کابرای مامور ئاگای لە تەواوی زیندەگیمان بوو، تەنانەت نێوی دایکمی دەزانی. بە ئەسپایی بە بابم گوت:

– بابە ئەم کابرایە عیلمی غەیبی هەیە؟

بابم گوتی: ووس بە کوڕە، ماموری دەوڵەت پێویستە لە هەموو شتێ ئاگادار بێ. ئەمانە لە دۆسییەکەدا نووسراوە...

ماموری ئامار مڵچە مڵچێکی تایبەتی لە دەمییەوە دەرهێنا، سەری بە راست و چەپدا لە قاندو گوتی: قوربان گیان ئێمە ناتوانین ناسنامە بە بابایەکی مردوو بدەین، لە کوێ بینراوە ناسنامە بە بابایەکی مردوو بدرێ؟ کوڕەکەی تۆ لە مێژە مردووە.

کە گوێم لەم قسانەی مامورەکە بوو، دەستم بە گریان کرد... بابم کە زۆر تووڕە بوو بوو کێشای بە سەرمدا و گوتی: زەڕە زەڕ کوڕە.. با بزانین ئەم برادەرە چی دەڵێ، ئەوجا رووی کردە مامورەکە و بەهەمان توڕەییەوە لە سەری رۆیی:

قوربان ئەوە خەیاڵتان لە کوێیە؟ ئەمە کوڕەکەمە کە لێرەدا وێستاوە، کەچی ئێوە دەفەرموون لە مێژە مردووە؟

من بە هۆنە هۆن وەڵامم دایەوە: بابە من مردووم و تۆش نازانی؟ ئەمجارەیان بابم بە هەردوو دەستان کێشای بە سەرماو گوتی: ووس بە هەتیوو... بێڵە بزانین مامور چی دەڵێ...

ماموری ئامار تۆمارەکەی لە بەردەم بابم راگرت و گوتی: سەیرکە کاکە من لە خۆوە قسان ناکەم، لێرەدا نووسراوە کە ناوت رەشیدە و کوڕی محەمەدی. لە ساڵی ١٨٩٧ دا لە دایك بوویت و لە ساڵی ١٩١١ دا هاجەرەت خواستووەو خوا کوڕێکی پێ بەخشیون ناوی زیندەیە.

بابم تەواوی قسەکانی کابرای ماموری سەلماند... ئەمجا نۆرەی ماموری ئامارە کە توڕە ببێ: باشە کە هەموو شتێ راست و دروستە ئیدی چی دەڵێی؟.. بابم گوتی: مەسەلەی مردنی منداڵەکە راست نییە. ماموری ئامار پتر کەللەیی بوو: کە کارەکە لە قازانجتان بێ راستە، خۆ ئەگەر زیانتانی تێدا بێ نادروستە...

بابم هەوڵی دەدا قەناعەت بە مامورەکە بکات، گوتی: جەناب مەسەلە قازانج و زیان نییە، دەمەوێ منداڵەکەم بنێرمە قوتابخانەی دەوڵەتی و جەنابی بەڕێوەبەر داوای ناسنامەکەی کردووە.

مامورەکە مستێکی قایمی بە دۆسییەکەدا ماڵی و هاواری کرد: شەجرە نامەی تۆ لەم دۆسییەدایە.. لە دۆسییەکەدا نووسراوە کە کورەکەتان مردووە... ئێمە ناسنامە بە مردوو نادەین و بڕایەوە.

سەدای گریانم بەرزتر بوو، و گوتم، بابە گیان بۆچی پێت نەگووتم کە مردووم؟

بابم گوێچەکەی سویمەوەو گوتی: بێدەنگ دەبی یان بتکوژم هەتیو! ئەوەی لە دۆسییەکەدا نووسراوە راست نییە تۆ زیندوویت و نەمردوی! گوتم: ماموری دەوڵەت درۆ ناکات.. هەڵبەتە شتێك هەر هەیە؟!

بابم تفێکی رۆکردە سەر زەوی و گوتی: گوێی مەدەرێ بۆ خۆی دەڵێ.

مامووری ئامار لە قسەکانی بابم پەست بوو، و نەڕاندی: تەوس بە مامووری دەوڵەت دەکەی؟

بابم کە زانی هەڵەی کردووە و لەوانەیە تووشی دەردی سەرییەك ببێ، شێوازی قسەکرنەکەی گۆڕی و بە پارانەوەوە گوتی: قوربان من بە ئێوەم نەبوو، لەگەڵ کوڕەکەی خۆمم بوو.. من هەڵەی وا ناکەم بە تایبەتی لە رووی پایە بەرزێکی وەکو جەنابتان.. ئەستە غفیروڵڵا.. ببورە. ئەگەر بەدحاڵییەك رووی دابێ داوای لێ بوردن دەکەم.. کابرای مامور کە ئاگری لێ دەباری و رەنگ و رووی مردووی لێ نیشتبوو، کەمێ هێور بووەوە و گوتی: ئێوەی کلاش خوار هەموو کارێکتان هەر کەڵەکە! بۆ ئەوەی منداڵەکانتان عەسکەری نەیان گرێتەوە لەگەڵ کوێخادا دەست تێکەڵ دەکەن. تەمەنیان کەم و زیاد دەنوسن وهەزار فڕوفێڵ دەکەن. هەم بۆ خۆتان و هەم بۆ ئێمەش سەریەشە دروست دەکەن..

بابی بێچارەم، مات و مەلول نەیدەزانی چ وەلامێکی مامووری ئامار بداتەوە.. چۆن دەیتوانی مەرگی کوڕەکەی کە لە تەکیا وەستاوە قەبوڵ بکا؟ ماموورەکەش سوور بوو لەسەر قسەکەی خۆی. بابم پرسی: قوربان ئێستا دۆسییەکان راست دەڵێ، بە ئەرك نەبێ سەیرێکی بکە بزانە کوڕەکەم کەنگێ مردووە؟

قسەکانی بابم بە جۆرێ دڵی داخورپاندم، تەواو باوەڕم هات کە بە راستی راستی مردووم و ئاگام لێ نییە! لە پڕمەی گریانم دا. بابم بە سەریا کێشام و گوتی: بێدەنگبە کورە، با بزانم کاکی مامور چ دەڵێ: مامووری دایەرەی ئامار ماوەیەك دۆسییەکەی ژێرو ژوور کرد و گوتی: لە ساڵی ١٩١٥دا، وەختێ کە یەکەم جەنگی جیهان دەستی پێکردوە چووەتە خزمەتی سەر بازی...

بابم بەسەر سامییەوە قسەی ماموورەکەی بڕی: کێ چووەتە سەربازی؟! ماموورەکە بە خوێن ساردییەوە گوتی: کوڕەکەت دەڵێم... کە لە بەرەی جەنگدا شەهید بووە..

بابم کە ئەبڵەق بوو بوو، هاواری کرد: قوربان بەندە لە ساڵی ١٩١١ دا هاجەر خانم خواستووە.. خۆ ئەگەر لە یەکەم رۆژەوە منداڵمان بوو بێ ئەوا لە ساڵی

١٩١٥ دا تەمەنی چوار ساڵ بووە.. چۆن منداڵی چوار ساڵان براوە بۆ سەربازی و لە جەنگ دا شەهید بووە؟

لەم ماوەیەدا کە بابم لەگەڵ مامورەکەدا سێ و دووی دەکرد، کۆمەڵێك لە پشتمانەوە وێستا بوون و چاوەڕێی نۆرەی خۆیان بوون. لە قاقای پێکەنینیان دا.. مامورەکە پتر نارەحەت بوو.. بە تورەییەوە دۆسییەکەی داخستەوە و گوتی:

هەر ئەوەیە، لەوە پتر سەرم قاڵ مەکەو لاکەوە با فریای کاری مەردم بکەوم!

بابم بە پاڕانەوەوە گوتی: قوربان بۆ خاتری خوا جارێکی دی بە دۆسییەکەدا بچۆوە، لەوانەیە هەڵە بێ. مامورەکە بە نابە دڵییەوە دۆسییەکەی کردەوەو ماوەیەکی دی پەڕەکانی هەڵدایەوە گوتی: هەق بە تۆیە.. هەڵە بوو.. لە کۆنا گوتویانە هەڵە دەگەڕێتەوە...

وەختی شام کردنی بەندییەکان بوو.. فەڕاشەکان سینی گەورە گەورەیان بە سەرسەرەوە بوو، هێدی هێدی بە ڕاڕەو و قاوشەکاندا دەڕۆیین.. لە دەرگای ژوورەکانیان دەداو هاواریان دەکرد: چەند کەسن؟..

بەندییانی قاوشی یەك کە کەوتبوونە ژێر کاریگەری حەکایەتەکەی زیندەوە، دڵیان گیرابوو، ونەیان دەویست شام بخۆن، ولێ ردێن سپی قاوشەکە بێدەنگییەکەی شکاندو گوتی:- کوڕینە شام عەشقە... ئەمەی زیندە دەستی داوەتێ بە ٣-٤ ساڵی دی تەواوی ناکات.. سفرەکە رابخەن با شیوەکەمان بخۆین.. با پاشماوەی حەکایەتەکە بۆ دوای شام بمێنێ..

ئەوجا ئیشارەتی بۆ زیندە کرد و گوتی:- تۆش وەرە شیوەکەت بخۆ و هلاکیت دەربکە تا دوای شام زمانت باشتر بگەڕێ!

دوو سێ بەندیی بەپەلە سفرەکەیان راخست.. نان و قاپەکانیان لە ناوەندی سفرەکەدا دانا، هەموو شتێکیان ئامادە کرد و تێکڕابە تاسەوە هەڵیان کوتایە سەر خواردنەکە!

بەدەم پێکەنین و شۆخی و گاڵتەوە شامیان کرد.. چای گەرم و پڕ رەنگیان نۆشی، لەسەر قسەی ردێن سپی قاوشەکە هەر کەس کە پەتۆو سەرینی زیادەی

هەبوو هێنای لە ناوەندی قاوشەکەدا داینا.. جێیەکی گەرمو نەرمیان بۆ زیندە ساز کرد تا خەیاڵی ئاسودە ببێ.
ئەوجا جێگایان لێ راخستو چوونە ژێرییەوە و راکشان تا زیندە پاشماوەی حەکایەتەکەیان بۆ بگێڕێتەوە. زیندە هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا و گوتی:- کە مامورەکە دانی بە هەڵەکەیدا نا، ئێمە زۆر خۆشحاڵ بووین. هەموو بێدەنگ بووین تا قسەکانی مامورەکە کە دەیویست مێژووی راستەقینەی لە دایک بوونەکەی من بڵێ، چاکتر بژنەوین. ماموری ئامار دوای ئەوەی کۆکەیەکی بۆ کرد گوتی: بەڵێ راستە، کوڕەکەت لە ساڵی ١٨٩٦ دا لە دایك بووە، کە لە ساڵی ١٩١٥دا چووە بۆ بەرەی جەنگ نۆزدە ساڵ بووەو کوژراوە.
بابم کە کۆنترۆڵی خۆی لە دەست دا بوو، هاواری کرد و گوتی: باشە کە کوڕەکەم لە ساڵی ١٨٩٦ دا لە دایك بووە، ئەدی خۆم کەی لە دایك بووم؟
مامورەکە سەیرێکی دۆسییەکەی کرد و گوتی: تۆ لە ساڵی ١٨٩٧ دا لە دایك بوویت!. بابم پاشەو پاش کشایەوە نێو قەرەباڵغییەکەی پشتمانەوە و گوتی:- خەڵکینە ئێوە بیستووتانە باوك ساڵێ لە دوای کوڕەکەی لە دایك ببێ؟!
قاقای خەڵکەکە چوو بە ئاسماناو مامورەکەیان گاڵتە باران کرد.. مامورەکە کە تەواو شەکەت بوو بوو، هاواری کرد: خەتای من چییە لە دۆسییەکەدا وا نووسراوە، من چ تەخسیرێکم نییە..
یەکێك لە نێو حەشاماتەکەوە گوتی: قوربان خوا ئەقڵی بە بنیادەم داوە.. لە کوێ بووەو دەبێ باوك ساڵێ لە دوای کوڕ لە دایك ببێ؟! مامورەکە نەیدەویست خۆی بخاتە ئەم گێژاوەوە، دۆسییەکەی داخستەوە و گوتی: من نە غەیب زانم و نە مامانی ژنی ئەم پیاوە بووم تاکو بزانم کەنگێ کوڕەکەی لە دایك بووە. دۆسییەکە وا نووسراوە.
بابم بە توڕەییەوە گوتی: دەچم لەلای سەرۆك شکایەت دەکەم...
مامورەکە بە پێکەنینەوە گوتی: کوێت پێ خۆشە بچۆ... سڵاوی ئێمەش بگەیەنە!..

بابم دەستی گرتمو کشان کشان بەرەو ژووری سەرۆکی بردم.. من لە ئاقیبەتی کارەکە دەترسام، وەکو هەوری بەهار ئەشکم هەڵدەرشت... بابم گوێی بادام و گوتی: بیبڕەوە توخمە سەگ! یارۆ لە زیندوو بوونی خۆی بە گومانە چ جای زیندوو بوون یان مردوو بوونی تۆ!

بابم لە دەرگای ژووری سەرۆکی دا. چووینە ژوورەوە. هەموو شتێکی بۆ سەرۆک گێڕایەوە. سەرۆك، مامورەکەی داواکرد. دوای ماوەیەك ماموری ئامار بە خۆی و دۆسییە گەورەکەیەوە هات. سەرۆك لێی پرسی: شکایەتی ئەم برادەرە چییە؟.. مەگەر ئەحواڵی کورەکەی لە دۆسییەکەدا تۆمار نەبووە؟

مامورەکە گوتی: بۆنەء قوربان.. تۆمار بووە.. دۆسییەکەی لە بەردەم سەرۆك دا واز کرد و درێژەی پێدا: سەرنج بفەرموون.. چەند جارێکم بۆ خوێندەوە.. تێ ناگات، دەیەوێ بە زۆر ناسنامە بۆ مردوو وەربگرێ.

ئەمجا نۆرەی سەرۆك دایەرەیە. نیگایەکی ئەوەندە تورەی بڕییە بابم وەك ئەوەی بابم پیاو کوژ بێ یان کڵاوەکەی جەنابی سەرۆکی فڕاند بێ. لە کاتێکا کە لە تورەیی دا دەلەرزی، پرسی: گوتت دەیەوێ ناسنامە بۆ مردوو وەربگرێ؟ ئەمە چ کەڵەکێکە؟ دۆسییەکەم بدەرێ با بزانم..

مامورەکە، دۆسییەکەی بردە پێشترەوە و عەینەکە زەرەبینەکەی جەنابی سەرۆکی دایە دەستی و گوتی: فەرموون قوربان سەرنج بدەن. بابی رەشید. دایکی هاجەر. لە ساڵی ١٩١٥ دا لە یەکەم جەنگی جیهانیدا شەهید بووە، ناویمان لە دۆسییەکەدا ئیشارە کردووە.

جەنابی سەرۆك لە بابی پرسیم: باشە کاکە لەمە روونتر نابێ... کوڕەکەت مردووە و ئیدی ناسنامەی چیت دەوێ؟

بابم کە تەواو وڕوکاس بوو بوو گوتی: جەنابی سەرۆك من لە ساڵی ١٩١١ دا ژنم هێناوە، چۆن لە ساڵی ١٩١٥ دا کوڕەکەیان بۆ سەربازی بردم؟..

سەرۆك ئامار، سەرە روتاوەکەی بە دەستە سرەکەی سری و گوتی: ئەم قسەیە راستە!

نووکی قەڵەمە زێڕەکەی خستە ژێر دانی و کەوتە بیرکردنەوە، لە ژێر لێوەوە ورتە ورتی دەکرد و سەری بادەدا. بابم کە ئومێدی پەیدا کرد بووەوە گوتی:
جەنابی سەرۆك تکا دەکەم دەستور بدەن کە هەڵەی دۆسییەکە راست بکەنەوە.
سەرۆك ئامار قسەکەی بابمی بڕی و گوتی لەوانەیە تۆ بێوە ژنێکت خواستبێ و ئەم کوڕە لە مێردی یەکەمی بێ.
من ئیدی تاقەتی ژنەوتنی ئەم قسانەم نەما، بە گریانەوە دەستی بابم گرت و گوتم: با بڕۆین بابە، ناسنامەم ناوێ.. ناچمە قوتابخانەی دەوڵەتیش.. یاڵڵا.. با بڕۆین.
بابم بە توندی دەستی دامە دواوە و شەقاوێك لە سەرۆك چووە پێشەوەو گوتی:
جەنابی سەرۆك دۆسییەکانی ئێوە بوون بە جنوکە.. وڕینە دەکەن.. بۆ ژنەکەی من چەند ساڵە تا مێردی تریشی کرد بێ؟ ماموری ئامار وەکو فەرماندەیەکی بەرندە کە لە مەیدانی جەنگەوە گەڕابێتەوە، سینگی هێنایە پێشەوەو گوتی:
هەڵە مەکە کاکە، دۆسییەکەی ئێمە یەك زەرە بەرز و نزمی تێدا نییە، فەرموو ئەمەش ئەحواڵی ژنەکەت، هاجەری کیژی حەسەن قولی لە ساڵی ١٩٠٦ دا لە دایك بووە..
بابم قسەی مامورەکەی بڕی و گوتی: بە پێی دۆسییەکەی ئێوە ژنەکەی من لە ساڵی ١٩٠٦ دا لە دایك بووە، بەڵام لە ساڵی ١٨٩٦ دا واتە هەشت ساڵ بەر لەوەی خۆی بێتە دنیاوە کوڕێکی بووە! تر.. ر.. ر.. ر
بابم دەنگێکی تایبەتی ئەوتۆی دەرهێنا کە سەرۆك ئامار ومامورەکەش کەوتنە پێکەنین!..
سەرۆك ئامار بە زۆر پێکەنینەکەی بڕیو گوتی: راستە زۆر تێکەڵو پێکەڵە! من سەری لێ دەرناکەم.. هەڵبەتە هەڵەیەك بووەو کراوە، بەڵام لە کوێ، نازانم...
مامورەکە هێشتاش هەر دەست بەردار نەبوو: قوربان دۆسییە هەرگیز هەڵە ناکات!
من لە بابم پرسی: بابە ناشێت تۆ هەڵە بی؟!

بابم بە نابەدڵییەوە مۆڕەیەکی لێکردم و گوتی:- تۆ چەنە لێ مەدە..
سەرۆک ئامار، دیسان ماوەیەک کاغەزەکانو دۆسییەکەی ژێر و ژوور کرد، بەلام سەری لێ دەرنەکرد. دۆسییەکەی لەسەر مێزەکە پەرت کردەوە و گوتی: هیچ کارێکی لەگەڵ ناکرێ، هەر ئەوەیە کە هەیە!!.. بابم کە دەرەقەتی سەرۆک ئامار نەدەهات، داخی دڵی خۆی بە من رشت. مستە کۆڵەیەکی توندی بە سەرما کێشا و گوتی: قوڕ بەسەر، قوتابخانەی دەوڵەتی چی؟ گریمان ١٠-٢٠ساڵ چوویتە قوتابخانە ئاقیبەت وەکو ئەمانە دەردەچیت و هەر لە بڕ ناکەیتەوە...
بابم بە تووڕەیی دەستی گرتم و دوای خۆی دام. لە ژوورەکەی سەرۆک ئامار هاتینە دەرێ، چونکە چ ئیومێدێکمان نەما بەرەو ماڵ کەوتینە ڕێ. بەڵێ هاوڕێیان.. دە ساڵ بووم کە بۆ یەکەمجار زانیم مردوم!
بەندییەک کە لە تەک زیندەوە دانیشتبوو گوتی:
- ئەی ئێستا ناسنامەت نییە؟
- نەخێر، برادەر.
- دواییش نەچوویت ناسنامە دەر بکەی؟
- زۆرم زەحمەت کێشا.. ماوەیەک هەوڵم دا کە ناسنامە دەربکەمبەلام چێ نەبوو، و نەبوو... (لەهەر جێیەک کە قازانجی دەوڵەتی تێدا بێ یەخەم دەگرنو دەڵێن تۆ زیندوویت و هەقی خۆیان وەر دەگرن.. لەهەر جێیەکیش زیانی دەوڵەتی تێدا بێ لەسەر پێیەک دەوەستن و دەی سەلمێنن کە مردووم و هەقەکەم دەفەوتێ! لە راستیدا هەندێ جاران خۆشم گومان پەیدا دەکەم و نازانم مردووم یان زیندوو.)
لەم کاتەدا دەنگی شاوری ماموری زیندان بەرز بووەوە، لە قاوشەکاندا دەنگی جارچییان کاتی نووستنی راگەیاند...
بەندییانی قاوشی یەک کە دڵبەندی سەر بورد و حەکایەتەکەی زیندە بوو بوون، چوونە ژێر جێگاکانیانەوەو خەونیان بەسەبەی شەوەوە دەبینی تا زیندە پاشماوەی حەکایەتە شیرینو سەرنج راکێشەکەی بگێڕێتەوە.

## (٣) ئەقدەس شیرازی

سبەینێی ئەو ڕۆژە زۆری نەما ناکۆکییەکی توندوتیژ لە نێو بەندییەکانی قاوشی یەکدا ڕوویدات لەسەر حەکایەت کردنی زیندە.

هەندێکیان دەیانگوت با زیندە بەیانیانش دوای قاوەڵتی حەکایەت بکاتو سەر گەرمیان بکات. بەڵام هەندێکیان ڕازی نەبوون بە حەکایەت کردنی بەیانیان، چونکە یەکەم لە کاریان دەکاتو دووەم هەر چۆنێ بێ ڕۆژ دەگوزەرێ. شەوان بەلای بەندییانەوە دژوار ودرێژەو لە بڕانەوە نایەت.

لە ئەنجامدا لەسەر قسەی ردێن سپی قاوشەکە بڕیار درا کە زیندە تەنیا شەوان و دوای شیو حەکایەتیان بۆ بکات.

بەم جۆرە هەر کە مامورە بستە باڵاکە شاورەکەی لێداو دەستوری دا کە بەندییەکان بچنە قاوشەکانی خۆیان، بەندییەکانی قاوشی یەك بە غاردان خۆیان بە قاوشەکەدا کرد. ڕزەی زنجیری دەرگا ئاسنەکە هاتە گوێ، سەر ژمێری بەندییەکان تەواو بوو، و سینییە خواردن هێنرا. ردێن سپی قاوشەکە گازی کردن:- ئەهای کوڕ گەل خێرا سفرەکە ڕاخەن و زوو شیوەکەتان بخۆن بەشکو حەکایەتەکە دەست پێ بکات.

بەندییەکان وەك ئەوەی تەراتێنی نان خواردنیان هەبێ بەپەلە هەڵیانە کوتایە سەر سفرەکە.. کە شیویان کرد، ردێن سپی قاوشەکە دەستوری دا کە چای بێنن: ئەهای.. چای چی ١٠-١٥ چای تازەدەم بۆ ئێرە بنێرە.. ئەوجا ڕووی کردە بەندییەکان و گوتی:

- کوڕ گەل خێراتر جێگاکانتان ڕابخەن.. سەرینەکانتان بدەنە پاڵ دیوارەکە تا چایەکانمان بخۆینەوەو زیندە پاشماوەی حەکایەتەکەی باس بکات.

چای چییەکە، چایی هێناو لە بەردەم گەورەترینیاندا دای نا، ردێن سپی قاوشەکە یەکەم پیاڵەی لە بەردەم زیندەدا دانا وگوتی: ڕۆڵەگیان زوو چایەکەت

هەڵدەو دەست بە حەکایەتەکە بکە. شەوو ڕۆژی دوور ودرێژی زیندان دەبێ بە قسەی شیرین ببرێتە سەر.. خێراکە، کات زێڕە.. بیخۆرەوەو دەست پێ بکە.
زیندە چایەکەی هەر بەگەرمی خواردەوە، پیاڵەکەی دایە دەست شاگرد چای چییەکەو دەستی پێکرد:– برادەران گەیی بووینە کوێ؟ ردێن سپی قاوشەکە گوتی:
– لەو شوێنەدا بووی کە لە دۆسییەی ئاماردا وەکو شەهیدێکی جەنگ تومار کرایتو ناسنامەیان پێ نەدایت. ئیدی چی بوو؟!
بەڵێ.. ناسنامەیان پێم نەدا.. قوتابخانەی دەوڵەتی وەری نەگرتم .دایکم خودا عافوی بکات بەر لەمن ٥ منداڵی بوو بوو، هەر پێنجیان مردبوون، هەر بۆیەش منیان نێو نابوو زیندە. بەڵام دەوڵەت منی لە خانەی مردوواندا حسێب دەکرد..
لە گوندەکەماندا مەلا (داود)ێک هەبوو حوجرەی هەبوو. بۆ دەرس خوێندن چوومە نك ئەو... کیژێکی دراوسێمان هەبوو نێوی ئەقدەس بوو... با پیرانی ئێرانیو خاڵوانی شیرازی بوون، ئەو کیژە لە جوانیا هاوتای نەبوو، چاوە ڕەشو گەشەکانی بنیادەمیان شێتو شەیدا دەکرد.. هەر لە منداڵییەوە بۆ یەکدییان دانا بووین.
یەکێك لە بەندییەکان پرسی:
– بۆ یەکدی دانان چییە؟
– ئەو ژنانەی کە یەکدیان خۆش دەوێ، کە سکیان دەبێ قەولو قەرار لەگەڵ یەکدا دەبەستن، ئەگەر منداڵی یەکێکیان کچ بێو هی ئەوی دیکەیان کوڕ بێ بیاندەن بە یەکدی. ئەم جۆرە خوو نەریتانە لە گوند و شارۆچکەکاندا زۆرە...
کاتی لە دایك بوونی ئەم نەوزادانەو کاتی ناوك برینیان لە یەکدیان مارەدەکەنو ئەوانیش ناچارن یەکدیان بوێو ببن بە ژنو مێردی یەکدی! وەل حاسڵ ئەقدەس لە قوتابخانەی دەوڵەتی دا دەیخوێند و منیش لە حوجرەکەی مەلا داود.
چاوەڕێی ئەوە بووم هەر کاتێ ناسنامەم بۆ دەربچێ بچمە قوتابخانەی دەوڵەتی.
گەلێ جاران بە بیانووی دیدەنی ئەقدەسەوە دەچووم بۆ قوتابخانەی دەوڵەتی.

پشتم بە دیواری قوتابخانەکەوە دەداو چەندین سەعات سەیری جستو جۆ و یاری منداڵانم دەکرد... بەڵام چ هەواڵێك لە ناسنامەکەم نەبوو... بابم هێندەی سەر بەم دایەرە وبەو دایەرەیەدا کرد وەڕس بوو، دەستی لە ناسنامەکەم شۆرد... منیش کە گەورە بوو بووم و سەیرم دەکرد حوجرەی مەلا داود بە کەڵکم نایەت ئیدی دەستم لە خوێندن هەڵگرت و شانم دایە بەر کاروباری کشتوکاڵییەوە..

چەند ساڵێ تێ پەڕین، هاو تەمەنەکانم بۆ سەربازی گاز کران، ئیدی کەس ناوی منی نەهێناو ئەنجام لە دۆسییەی دەوڵەتی دا بە شەهیدی جەنگ تۆمار کرا بووم! هاوڕێکانم خزمەتی سوپاییان تەواو کرد و گەڕانەوە سەر کاروکاسبی خۆیان... هەموو ژنیان هێنا، سەروەتو سامانیان پێکەوە نا، منیش بێ ڕێ و شوێن و سەرگەردان... لە خەجاڵەتی خۆمدا نەمدەتوانی بچمە چاخانەکەی نێو ئاوایی. لەو لاشەوە ئەقدەس پێی لێ کرد بوومە کەوشەوەو دەیویست زووتر بیگوازمەوە.

ئەقدەس هەقی بوو، جوانترین کیژی گوند بوو. هاو تەمەنانی ئەو یەکی ٢-٣ منداڵیان هەبوو، ئەویش لەو ناوە بە تەنیا مابووەوە، خوازبێنی کەری زۆری هەبوو، شیر بایی موڵیان دەخستە بەردەم بابی... بابو دایکی ئەقدەس هەموو ڕۆژی دەیان کردە سەرم کە کچەکەیان خەریکە پیر دەبێ، ئەگەر پیاوی مەیدان نیت زوو هەواڵمان لێ بگێڕەوە وئێمەش ڕزگار بکە. بەڵام من هیچم لە دەست نەدەهات.. نە دەوڵەت مۆڵەتی شایی پێ دەدام و نە دڵم دەهات دەست بەرداری ئەقدەس بم.. هێندەم خۆش دەویست، ئامادە بووم گیانی خۆم ببەخشم، بەڵام ئەقدەس لە دەست نەدەم.. ئەقدەسیش منی لە خۆی خۆشتر دەویست.

ڕۆژی کە لە باغەکەی بابم دا کارم دەکرد، ئەقدەس هاتە تەکمو ڕێكو ڕەوان گوتی: بۆ بابو داکت نانێریتە داخوازیمو کارەکە نابڕیتەوە؟

ناچار بووم ڕاستییەکەی پێ بڵێم: تا سەربازی تەواو نەکەم، ناتوانم ژن بێنم..

پرسی: بۆ ناچیت بۆ سەربازی؟.. ناکا نەخۆش بی؟

گوتم: نەخێر لە گوێزی ساغ ساغترم، تەنیا بە هۆی ناسنامەوە کارم گەندە..
ئەقدەس کە چاوەکانی تەژی ئەشك بوو بوون، سەری هەڵبڕی و گوتی: من ئەم قسانە نازانم. باب و دایکم زۆریان بۆ هێناوم. یەك هەفتەت مۆڵەت هەیە یان کارەکە ببڕێنەوە یان مەبە بە بەر هەڵستی بەختی من.. ئەمەی گوت و بە تووڕەییەوە ڕۆیی...
دنیام لەبەر چاو تاریك بوو... کیژێ کە لە جوانیا هاوتای نییەو تەواوی گەنجانی دێ تامەزرۆین، بە هۆی نەبوونی ناسنامەوە لە دەستم بچێت، هەر ئەو شەوە پێم لە بابم کردە کەوشەوە و گوتم ئەگەر ئەقدەسم بۆ نەهێنی سەری خۆ هەڵدەگرم ، خۆم دەکوژم... بابم ناچار بوو بچێتە خواز بێنی ئەقدەس و بە هەرحاڵێ بووە لەلای مەلا مارەی بکاتو ببین بە ژنو مێردو دوای ئەوەی ناسنامەکەم تەواو بوو ژنو میردایەتیمان لە تۆمارگەدا تۆمار بکرێ...
سبەی بەیانی بابم هەواڵی بۆ بابی ئەقدەس نارد کە بێن بۆ ماڵی ئێمە بۆ بڕانەوەی شیربایی و مەرجەکانی شایی... لای عەسر بابو مامەکانی ئەقدەس هاتن بۆ ماڵی ئێمە.. میوانەکان لە حەوشەدا و لە ژێر دار هەنجیرەکەدا و لە دەوری مێزێکی گەورە دانیشتن. ئیدی ئەوەی لە لادێدا عادەت و پیویست بوو لەسەر میزەکە هەڵچنرا بوو. سەعاتی چاڵمە.. مەکینەی درومان.. ئاوێنە.. رادیۆ. ٢-٣ گوڵدان. چەند دەستە جلێك، خاولی حەمام، دوو سێ قالیچەو شتی تری لەم بابەتە.
دوای ئەوەی میوانەکان چاو شەربەتیان خوارەدەوە، قسە کرایەوە.. لەم کۆڕانەدا خانەوادەی زاوا هەوڵ دەدەن بە شانو باڵی کوڕەکەیاندا هەڵبدەن و بووکەکە کەم بکەن.. هەر وەها خانەوادەی بووکێ بە شانو باڵی کیژەکەیاندا هەڵدەدەن تا شیربایی پتر لە ماڵی زاوا بپچڕنەوە. بەم چەشنە هەر لایەکیان هەوڵ دەدەن بۆڕ بە لایەکەی دی بداتو خۆی مەزنو خانەدان بنوێنێ...
ئەو ڕۆژە بابم دەستی بە قسان کرد و گوتی: ئەگەر بمەوێ گشت خەسێتە چاکەکانی کوڕەکەم بگێڕمەوە بە هەفتەیەکی تریش دوایی نایەت.. ئێوە خۆتان

زۆر چاکی دەناسن. زرنگ، بەکار، بەهێز، بە ئەدەب، پڕدیانەت، بێ غەل‌وغەشە. سەری بچێ نوێژی ناچێت، تا ئێستا رۆژووی نە خواردووەو... و... و...!

سەرم داخست بوو، درۆکانی بابم خەجاڵەتیان کرد بووم، بەڵام بابم هەر گوێی لێ نەبوو، دەتگوت تەسجیلی قووت داوە.. و پەیتا پەیتا باسی چاکەی من و خانەوادەکەمانی دەکرد. لە کۆتاییدا گوتی: کچەکەتان لە ماڵی ئێمەدا بەختەوەر دەبێ، ئەگەر ئامادەن کچەکەتان بە کوڕەکەم بدەن ئەوا تاجی سەرمانەو ماڵی ئێمە پێویستی بەکچەکەتانە، ئەگەر ناشی دەن ئەوا ئارەزووی خۆتانە..

قەوم‌و قیلەی ئەقدەس بە قسەکانی بابم پێکەنین، بابی ئەقدەس بە کەمێك رووی گرژی‌و نارەحەتییەوە گوتی: تۆ وەسپی کوڕی خۆت کرد، بەڵام ئاگات لە چاکەی کچەکەی من نییە... لەم ناوچەیەدا هاوتای نییە.. هێندە بە حەیاو شەرمە سێ مانگان بە برسێتی بمێنێتەوە دەم هەڵنایەنێ قسەیەك بکات. هەموو کارێکی کابانی دەزانێ، چێشت لێنان، جل شتن، منداڵ بەخێوکردن، مانگا دۆشین... مەڕ لەوەڕاندن و... و... و...

زۆری نەما بوو بەسەر خەزوورمدا بقیژینم و بڵێم: پیاوی ئاقڵ، خۆ من کچەکەت بۆ کارەکەری نایەنم تا ئەم قسانە بکەیت.. ئەقدەس خۆشەویستی منە.. کۆڵەکەی ماڵی منە.. روناکی ژیانی منە. من ئامادەم بە برژانگەکانم خاکی بەر پێی بماڵم.. ئامادەم درك بە چاومدا بچێ بەڵام بەدەستی ئەودا نەچێ.. چما دێڵم ئەقدەس لە ماڵی مندا دەست بەرەش و سپییەوە بدات؟ مەگەر خوا بەرداره ئەم دەستە سپی و نەرم‌و شلانە کە شاکاری خۆیەتی پیس ببێ؟

بەهەر حاڵێ بوو خۆم گرت‌و قسەم نەکرد.. بابم لە وەڵامی بابی ئەقدەس دا گوتی: ئەمانە هەموو کەس دەیزانن.. کیژەکەی تۆش پارچە گەوهەرێکە بۆ خۆی.

ئەوجا ئیشارەتی بۆ شتەکانی سەر مێزەمە کرد ودرێژەی پێدا:

ئەمانە هی کیژەکەی تۆن، بڵێ بزانم چیت دەوێ؟

بابی ئەقدەس زەردەخەنەیەکی کرد وگوتی: ئەمانە زۆر کەمن، پێویستە ١٠ هەزار لیرەو پارچە ئەرزەیەكو ١٠ مانگاو ٢٠ سەر مەڕ شیر باییمان بدەیتیٚ و گەردانەیەکی زێڕ، چوار جووت بازنی ئاڵتوون، جووتیٚ گوارەش بە دیاری بۆ بووکەکەت بکەیت.

تەوێڵی بابم لە تورەییدا چرچ و لوچ بوو، دیقەتم دا زۆری نەماوە کە کۆڕەکە بشێویٚ و کارەکە تێك بچیٚ، دەست بەجیٚ هەستام و چووم بۆ ئەو ژوورەی دایکم و ژنانی دراوسیٚ لە پشت پەنجەرەکەیەوە وەستا بوون، دامێنی دایکم گرت و بە پاڕانەوەوە گوتم: بابم رازی بکە کە هەر چییان دەویٚ بیدات.

دایکم پەنجەرەکەی کردەوە ولەوێوە هاواری کرد: قەبوڵمانە دەیدەین فەرموو شیرینی بخۆن.

بابم ئیدی نەیتوانی قسە لە قسەکەی دایکم بکات. پێکەنی و گوتی: موبارەکە.. دەنگی چەپڵە ڕێزانی پیاوان و هەڵهەڵەی ژنان بەرزبووەوەو شیرینیان خوارد. بە گوێرەی خوو عادەتی گوند منیان بردە نێو حەوشە تا دەستی خەزورم ماچ بکەم... کە هاتمە نێو حەوشەو بەرەو لای خەزوورم چووم، لە پڕ دەرگای حەوشە کرایەوە، پۆلیسێك هاتە ژووریٚ و پرسی: زیندەی کوڕی ڕەشید کێیە!

بابم گوتی: چ کارێکتان.پێیەتی؟

- سەرۆکی پاسگا کاری پێیەتی.

زانیم دیسانەوە گیروگرفتی بیٚ ناسنامەیی و زیندوو بوون و مردوو بوونەکەم سەری هەڵداوەتەوە!

فیڕەی شاورەکەی بستە باڵا کە کاتی نووستنی رادەگەیاند لە ڕاڕەو وقاوشەکاندا دەنگی دایەوە. بەندییەکان نەیان دەویست بخەون و پێیان دادەگرت کە زیندە پاشماوەی حەکایەتەکەی بگێڕێتەوە، بەڵام ردێن سپی قاوشەکە کە دەیزانی مامورانی زیندانەکە نارەحەت دەبن، داوای لە بەندییەکان کرد کە دەستوری زیندان رەچاو بکەن و زووتر بخەون: بەندییەکان بە ناڕەزایی و روو گرژییەوە چوونە ژێر جیگاکانیانەوە، زۆری نەبرد پرخەپرخیان بەرز بووەوە.

## (٤) سەربازی فیرار

سێیەمین شەو بوو کە زیندە حەکایەتی دەکرد.. بەندییەکان بە ئەندازەیەك تامە زۆری ژنەوتنی پاشماوەی حەکایەتەکەی بوو بوون هەر کە دەنگی شاوری ماموره بستە بالاکە بەرز دەبووەوە، بەرەو ژوورەکەیان غاریان دەدا.. هەرکە سەر ژمێرییان تەواو دەبوو.. کوڕگەل بە پەلە سفرەکەیان رادەخستو شیوەکەیان دەخوارد...چایەکەیان دەخوارد ونـاخوارد خێرا جێگاکانیان رادەخستو ئامادەی بیستنی پاشماوەی حەکایەتەکەی زیندە دەبوون، ئەویش بۆ ئەوەی پتر سەرنجیان راکێشێت و تامەزرۆیان بکات، نەرمە کۆکەیەکی بۆ دەکرد وەك ئەوی بیەوێ شتێك بیر خۆی بێنێتەوە، نێوچەوانی دەگوشی و دەیگوت: بەڵێ برادەران، وەکو عەرزم کردن میوانەکانمان لە ماڵەوە بەجێ هێشت و منو بابم لەگەڵ پۆلیسەکەدا چووین بۆ لای سەرۆك پاسگا، بابم لە سەرۆکی پرسی:- ئەمرێکت بە ئێمە هەیە؟

سەرۆکی پاسگا کە باوکمی دەناسی، بە رێزەوە وەڵامی دایەوە: خەبەریان داوە کە کوڕەکەت سەربازی فیرارە.

دەست بەجێ خۆم لە قسەکەی هەڵقورتاند: جەنابی سەرۆك کێ گوتویەتی کە من فیرارم؟ ئامادەم پارەش بدەم بە مەرجێ بمبەی بۆ سەر بازی...

بابم گوتی: کوڕی من چ خەتایەکی نییە، بە گوێرەی بەڵگەنامەی دەوڵەتی لە تەمەنی سێ ساڵیدا لە یەکێك لە جەنگەکاندا شەهید بووە.. جا کەسێك کەمردبێ چۆن بۆ سەربازی دەبرێ؟

سەرۆکی پاسگا بە گومانی ئەوەی کە بابم لە رووی تەوسەوە ئەم قسانە دەکات، زۆر نارەحەت بوو، وگوتی: ئەم گاڵتانە لە تۆ ناوەشێتەوە.. بابم بە هەمان خوێن ساردییەوە وەڵامی دایەوە: بە گیانی تۆ گاڵتە ناکەم. زۆریش بە راستمە. سەرۆك باوەڕی نەدەکرد. بەڕەقییەوە پرسی: بەم زل و زەلامییەوە وا لە بەردەمی مندا وێستاوە، تۆش دەفەرموی لە جەنگ دا شەهید بووە.. پێم رادەبوێری؟

بابم پێکەنی و گوتی: بەخوا. بە قورئان.. حەحیقەتت عەرز دەکەم... من ئەم قسانەم بە ماموری ئاماریش گوت، بەڵام بە گوێی دا نەچوو.

سەرۆك کەوتە بیر کردنەوە. بورای قسە کردنیم نەداو گوتم: چونکە ناسنامەم نییە، لە قوتابخانەی دەوڵەتیش قەبوڵیان نەکردم.

سەرۆك پاسگا وەڵامی دایەوە: قوتابخانە شتێکی دییە... و سەربازی شتێکی دییە! خزمەتی سەربازی، ئەرکی نەتەوەیی هەموو گەنجێکە... بە هیچ بیانوویەك نابێ لە ئەنجامدانی ئەم ئەرکە رابکەیت. بەم قسانەش کڵاوم ناچێتە سەر.

گوتم: جەنابی سەرۆك وەڵڵا، من لە خوام گەرەکە بمبەی بۆ سەربازی و ناسنامەم بدەیتێ.

سەرۆك گوتی: هەروایە، بۆ سەربازیت دەنێرم و داوییش بیرێ لە ناسنامەکەت دەکەمەوە.

سەیری ئەو بەختە بکە، تەواو لەو کاتەدا کە کاری زەماوەندی من و ئەقدەس لە تەواو بووندا بوو کەوتمە داوەوە. بەهەر حاڵ شاییەکەمان دواخست، ئەقدەس سوێندی خوارد و پەیمانی دا کە چاوەڕوانم بکات، منیش بەخەیاڵی ئاسودە بۆ سەربازی چووم.

زیندە بێدەنگ بوو، ئەو خەمە گەورەیەی کە لە دڵیدا پەنگی خوارد بووەوە، لە ئەشکی چاوەکانیا خۆی نواند.

یەکێك لە بەندییەکان دڕی بە بێدەنگییەکە دا و گوتی:

- هەقیەتێ، لەم وڵاتەدا نایەڵن مرۆڤ بەرەحەتی و ئاسوودەیی بژی. هەموومان دەمانەوێ ساغ و سەلامەت بین، ماڵ و ژیان بۆخۆ پێکەوە بنەین، کاری مەردانە بکەین، بەڵام نایەڵن.

ردێن سپی قاوشەکە قسەکەی پێ بڕی:- واز بێنە با بزانین کارەکە بەرەو کوێ دەچێت؟

زیندە لە سەری ڕۆیی:- بەڵێ، بردیانم بۆ سەربازخانە.. نازانن چ ئارەزوویەکی خزمەت کردنم هەبوو! کاری چل سەربازانم دەکرد، هەر بۆ ئەوەی بچمە دڵی

مەسئولەکانەوە هەر کارێ قورس و زەحمەت بوایە دەمکرد. تا دوا رۆژی خزمەت کەس رەخنەی لێم نەبوو. دوو ساڵانم تەواو کرد. هاورێکانم رەها بوون، من هێشتا هەر سەرباز بووم، دەترسام ئەگەر قسەیەك بکەم یان بیانوویەك بگرم کارم خراپ ببێ. چاوەڕوان بووم خۆیان جزدانی عەسکەرییەکەم بۆ پڕبکەنەوە و بیدەنە دەستم. ئاقیبەت ئەو رۆژەهات. رۆژێ سەر گروبانەکە گازی کردم و گوتی: بچۆ بۆ نووسینگەی جەنابی سەروان، کاری پێتە.

پرسیم: قوربان چ کارێکی پێمە؟!

گوتی: سەبارەت بە رەها بوونتە...

بەترس و لەرزەوە بەرەو نووسینگەی جەنابی سەروان کەوتمە رێ.. لە رووی خۆتان نەبێ جەنابی سەروان پیاوێکی چاك بوو. هەفتەی رۆژێك سەربازەکانی دارکاری دەکرد، تا سەرو کەللەی خلّتانی خوێن نەکردبان دەستی لێ هەڵنەگرتن!..

بەدەم رێگاوە هەرچی نزاو وێردێکم دەزانی خوێندمن و لە خوا دەپاڕامەوە کە بم پارێزی. دەترسام جەنابی سەروان شەوێ باش نەخەوتبێ و داخی دڵی خۆی بەمن برێژی. بەڵام باش بوو بە سەلامەتی تێ پەڕی، وەختێ کە چوومە ژوورەوە قاچەکانم بە توندی دا بە زەویدا و سڵاوێکی سەربازیانەم کرد، جەنابی سەروان بە روویەکی خۆشەوە وەڵامی دامەوەو گوتی: کوڕم هاوڕێکانت هەموو رەها بوون، هەر کارێ دەکەین کە تۆش رەها بکەین رێك ناکەوێ.

خۆم گێل کرد وگوتم: بۆ جەنابی سەروان؟...

- چونکە ناسنامەت نییە ناتوانین وەرەقەت بدەینێ...

سەرم داخست و وەك خەتاکاران چ قسەیەکم نەکرد، جەنابی سەروان درێژەی پێدا: نامەمان بۆ سەرکردایەتی جەنگ نووسیوە، لەوێشەوە بۆ دایەرەی سەرباز وەزیفەیان نووسیوە، دوێنێ وەڵامەکەیانمان پێ گەیی، گوێ بگرە بۆتی بخوێنمەوە. وەڵامی نووسراوی فلان بەروار دەربارەی سەربازی وەزیفە زیندەی

کوڕی ڕەشید بەو شێوەیەی کە دەستمان کەوتووە، ناوبراو لە ساڵی ١٩٣٥ دا لە کاتی ئەنجامدانی ئەرکی پیرۆزی سەربازیدا لە بەرەی دەرسیم شەهید بووە.
بێ سێ و دوو هاوارم کرد: جەنابی سەرۆك ئەمە مەحاڵە...
خۆم لە دەنگی خۆم ترسام، لێ جەنابی سەروان بە هیچ جۆرێ نارەحەت نەبوو. بە پێکەنینەوە گوتی: بەڵێ ئەمە نەبووە و نابێ کەسێك شەهید بووبێ و ئێستا لەبەردەم مندا وێستا بێ.
پتر غیرەت گرتمی و گوتم: بە گوێرەی دۆسییەی دایەرەی ئامار من لە یەکەم جەنگی جیهاندا لە بەرەی چناق قەڵادا شەهید بووم؟..
جەنابی سەروان ڕووی گرژ بوو، بەو خەیاڵەی کە گاڵتەم پێکردووە، مۆڕیەکی لێکردم، لە دڵی خۆمدا گوتم هەر ئێستا بەر شاپ و زللەم دەدات. بەم حاڵەوە زاتم خستە بەرخۆم و گوتم: سەربازێ کە لە ساڵی ١٩١٥ دا شەهید بوو بێ چۆن جارێکی دی لە ساڵی ١٩٣٥ دا شەهید بووەتەوە؟ لێرەوە ئاشکرایە کە هەڵەیان کردووە.
جەنابی سەروان قەدەرێ لێم وورد بووەوەو گوتی:
– ئەوە چییە، شێت بوویت کوڕە؟
بە وریاییەوە وێستام و وەڵامم دایەوە: قوربان حەقیقەتت عەرز دەکەم، بۆ هەر کارێك قازانجی دەوڵەتی تێدا بێ زیندووم، بۆ کارێکیش کە زیانی دەوڵەتی تێدا بێ ئەوا دەمێکە مردووم. جەنابی سەروان سەری لەقاند و گوتی: بچۆوە سەر کاری خۆت تا بزانم چی دەبێ.
لە ژوورەکەی سەروان هاتمە دەرێ. چەند مانگێکی دی سەربازیم کرد، لێ نەمتوانی زیندوییەتی خۆم بسەلمێنم و بەڵگەنامەی تەواو کردنی سەربازی وەربگرم... ئاخری ڕۆژێك جل و جنجۆرەکەیان داوە دەستم و لەسەربازخانەکە کردیانە دەرەوە. دوای ئەم هەموو زەحمەت و نا ڕەحەتییە بڕیارم دا بگەڕێمەوە بۆ دێ...

دوو مانگان بوو کە هەواڵی بابم نازانی... چ نامەیەکیشیم پێ نەگەیی بوو. لەگەڵ ئەوەشدا کە پارەم کەم پێ بوو، هەندێ دیاریم بۆ ئەقدەس و دایکم کڕی. دەستێ جلی چاك و جووتێ پێڵاویشم بۆ خۆم کڕی، بەرەو ئاوایی کەوتمە رێ.
بە درێژایی رێگا بیرم هەر لە لای ئەقدە س بوو، هەرکە ئوتومبیلە کە لە کەنار قەڵای گوندەکەمان راوێستا و رێبوارەکان دابەزین بەرەو ماڵی ئەقدەس کەوتمە رێ. قۆندەرەکانم جیڕەیان دەهات، بە وەی دڵخۆش بووم کە ئەگەر ئەقدەس لە پشت پەنجەرەکەشەوە نەم بینێ ئەوا بە جیڕە جیڕی قوندەرەکانم ئاگادار دەبێتەوەو لە ماڵ دێتە دەرێ. لێ بێهودە بوو، لە بری ئەقدەس بابی هاتە دەرێ، کەمنی بینی گوتی: " بەخێر بێیتەوە رۆڵە...
هەستم کرد قسەکانی دەجۆێتەوە و دوو دڵە لەوەی سەیرم بکات، دڵم داخورپا و بیرم بە لای ئەوەدا چوو کە ناشێت ئەقدەسی بە یەکێکی دی دابێ. چوومە پێشەوە کە دەستی ماچ بکەم.. دەستی بردە دواوەو بە پچڕ پچڕی گوتی: " نامەکەی منت پێ گەیی؟
مات و سەرسام سەیرم کرد وسەرم بادا: " نە"
خەزورم بە دوودڵییەوە گوتی: " تەمەنی درێژی بۆ خۆت بێ..
سیمایم خوێندەوە و زانیم کە بابم مردووە. بێ دەسەڵاتانە دەستم بە گریان کرد وگوتم: لە دنیا دا تەنیا باوکێم هەبوو ئەویشم لە دەست چوو. من ئێستا بیکەس وتەنیا باڵ ماومەتەوە...
خەزورم گوتی: ئەم قسەیە چییە.. ئەی ئێمە چین؟ باوکت نەما خۆ من ماوم.
چەند کەسێکی دی هاتن و بە گریانەوە بۆ ماڵەوەیان بردمەوە. هەر یەکەیان دەیویست و هەوڵی دەدا زیاتر دڵم بداتەوە، منیش بیر و هۆشم لە لای ئەقدەس بوو، و تامەزرۆی دیداری ئەو بووم.
بابی ئەقدەس گوتی: بابت زۆر بە رەحەتی لە دنیا دەرچوو، لەسەرە مەرگیا من بە دیارییەوە بووم، گوتی زۆر دڵم بە کوڕەکەم دەسوتێ، بە داخەوەم نەمتوانی

ناسنامەی بۆ دەربێنم، بەڵام بەڵگەنامەی تەواو کردنی سەربازی دەدەنێ و کاری چاك دەبێ و ئەویش دەتوانێ بە ئاسودەیی لەم کۆمەڵەدا بژی".
دووباره دەستم بە گریان کردەوە، پتر بۆ بەد بەختی خۆم دەگریام کە نەمتوانی بوو بەڵگەنامەی تەواوکردنی سەربازی وەربگرم.
سبەی بەیانی بابی ئەقدەس هاتە ماڵمان و گوتی: " کوڕم باجگری دارایی چەند رۆژێکە بە دوای تۆدا دەگەڕێ.
بەسەر سامی پرسیم: " ماموری دارایی چ کارێکی بە منە؟
خەزورم گوتی: باوکی رەحمەتیت هەندێ پارە بە دایەرەی دارایی قەرزارە، هەر وەها پارەی هەندێ لە بانقەکان قەرزارە، چونکە تۆ تاقە میراتگری ئەوی پێویستە قەرزەکانی بابت بدەیتەوە.
گوتم: یەکەم، پارەم نییە.. دووەم، دوو جاران مردووم، پارەش لە مردووان وەرناگیرێ.
گوتی: وەڵلا رۆڵە گیان پێویستە قەرزەکانی بابت بدەیتەوە تا بتوانی میراتییەکەی وەربگری.. پێشینیان گوتویانە مردن هەقە و میرات حەلاڵ..
چونکە بابم سەروەتێکی زۆری هەبوو، خەزورم نایویست ئەم میراتە بۆ دەوڵەت بێ. خۆی کارەکانی هەڵسوڕاند، پارەیەکی زۆری بۆ پەیدا کردم، تەواوی قەرزەکانی بابم دانەوە. بە ئومێدی میراتەکەی تا بینا قاقام کەوتە ژێر قەرزاری.
وەختێ هەموو قەرزەکانی بابم دانەوە، ئەوجا نۆرە هاتە سەر وەرگرتنی میراتەکەی، چوومە بەر مزگەوتی ئاوایی، چوومە لای عەرزو حاڵ نووسەکە، بەراستی عەرزوحاڵ نووسێکی شارەزا بوو، عەرزوحاڵێکی خۆمانەی بۆ نووسیم.
بە راستی ئەگەر عەرزوحاڵەکە بخرایەتە بەردەم (گا)ش دەست بەجێ دەیزانی کە خاوەنەکەی چی گەرەکە.. عەرز و حاڵەکەم بۆ دایەرەی دارایی برد، قەدەرێ ئەم لاو ئەولام پێ کرد تا ژووری ئەو مامورەم دۆزییەوە کە کارەکەی منی لە لابوو.
ریزێکی درێژ لە بەردەم ژوورەکەیدا وێستا بوون، عەرزو حاڵەکەم بە دەستەوە گرت و چووم لە ریزدا وێستام، ماوەیەك باوێشکم دا تا نۆرەم هات. کابرای مامور

عەرز وحاڵەکەی لێ وەرگرتم، قەدەرێ ئەم دیوو ئەو دیوی کرد. چەند جارێك پشت گوێو چەناگەی خوراند، ئەوجا بە ئیشارەتی سەر مامورێکی دی نیشان دام و گوتی: ئەمە لای من نییە... بیبە ئەوێ! وای.. تف لەم بەختو نێو چەوانە، تاقێکی تەواو ماتەڵ بووم تازە بە ناخێری هەڵە دەرچوو.. چارم نەبوو، چوومە ریزەوە، ماوەیەکی تریش ماتەڵ بوومو باوێشکم دا تا عەرز و حاڵەکەم بە دەستی ئەو برادەرە گەیی. ماوەیەك عەرز وحاڵەکەی خوێندەوە، ئەوجا مۆرەکەی هەڵگرت و ئەوەندە بە توندی بە عەرزوحاڵەکەیدا دا وام زانی عەرز و حاڵەکە پارچە پارچە بوو، و ئیدی لە کەڵك کەوت، مەعلوم نەبوو کە کاکی مامور لە ژنەکەی پڕ بوو یان لە منداڵەکانی تورە بوو، یان لەگەڵ خاوەن خانووەکەیدا بەشەر هاتبوو کە ئەوەندە تورەیەو داخی خۆی بە کاغەزەکەی من دەرێژێ، بەلاّم وەك بڵێی بەوەندەش دڵی ئاوی نەخواردەوە چەند مۆرێکی دی لە عەرز وحاڵەکە دا، دوا مۆری هێندە بە توندی لێدا کە تا ماوەیەك بەسەر عەرز وحاڵەکەدا چەسپ بوو. بە کورتی چەند جارێ ئەم مێز و ئەو مێزیان پێکردم و چەند ژوورێك گەڕام تا کاری ساغ کردنەوەی عەرز وحاڵ و کردنەوەی فایل تەواو بوو.

یەکێك لە بەندییەکان دەنگێکی تایبەتی لە دەمییەوە دەرهێنا تر.. ر.. ر.. ر ئەم دەنگە بە رادەیەك نا ئاسایی بوو کە تەواوی بەندییەکان کەوتنە پێکەنین.

یەکێکی دی پرسی:

– دوای ئەم هەموو بێنەو.. برۆیە ئەوجا کاری ساغ کردنەوەی عەرز وحاڵەکە تەواو بوو؟ بێگومان وەرگرتنی میراتەکە هێشتا تەواو نەبووە؟!.. زیندەش وێڕای گشت نارەحەتییەکی خۆی پێکەنی و گوتی: بەڵێ.. گوێ بگرن بزانن کارم گەییوەتە کوێ.

ردێن سپی قاوشەکە بە ئیشارەی دەست بێدەنگی کرد و زیندە لە سەری رۆیی:– چ مۆرێ ما کە بە عەرز وحاڵەکەمیەوە نەنێن، چ ئیمزایەك ما کە لە سەری نەکەن! چ بەروارێ ما کە لە سەری نەنووسن!.. بە قەد نووکە دەرزییەك جێی سپی بەسەر عەرز وحاڵەکەوە نەما. ناچار بوون پارچە کاغەزێکی دی بدەنە

دەمەوە. عەرز وحاڵەکە هێندە گەورە بوو، وردە وردە شێوەی تۆماری وەرگرت. لا حەولـە وەلا.. کـێ دەتـوانێ بەرگـەی ئـەم هـەموو نارەحەتییـە بگـرێ و قـسان نەکات، وەختێ کە دەمویست قەرزەکانی بابم بدەمەوە دەست بەجێ پارەکەیان لێ وەرگـرتم و تاقـە سـەعاتێ چییە ماتـەڵیان نـەکردم، بـەڵام وەختـێ کـە نـۆرە هاتـە سەرپارە وەرگرتن ئەمڕۆ بڕۆ سبەی وەرەوە هەر تەواو نەبوو.
بەدبەختی گەورە ئەمە بوو کە کاری میرات وەرگرتنەکەم دەبوایە لە شار تـەواو ببـێ. ماوەکیش چـوومە شـار، بـەڕۆژ لـە دایـەرەکانا دەسـوڕامەوە و شـەویشم لـە کاروان سەرا و ئوتێلەکاندا دەگوزەراند. بە ئومێدی ئەو ڕۆژە بووم کە میراتەکـەی بابم وەربگرم و ئەقدەس بگوازمەوە، بەڵام ئەفسوس... هەمووی خـەون و خـەیاڵ بوو.
یەکێك لە بەندییەکان پرسی:- پارەکانیان پێ نەدایت؟
- بۆنە، بەڵام حیسابەکان غەڵەت بوون... ئەوەی کە مـن حسێبم بـۆ گرتبـووەوە نزیکەی ١٥-٢٠ هەزار لیرەی دەکرد، بەڵام هێنـدە ئـەم بەشـە میراتو ئەو مافی دەوڵەت و ئەو بەشە بودجەیان لێ داشکاند لە ئاکامدا مایەوە سەر تـەنیا ٣ هـەزار لیرە.
یەکێك لە بەندییەکان لەپڕ گوتی:- وای...
- وای... بەڵام چ وایەك! ئەگەر لە هەوەڵەوە دەمزانی تـەنیا سـێ هـەزار لیرەم پـێ دەبرێ، نە قەرزەکانی بابم دەدایەوە و نە دوای میراتەکەی دەکەوتم.. ئەو پارانەی کە بۆ دانەوەی قەرزەکانی بابم قەرزم کرد بوون گـەلێك لـەو میراتییـە زۆرتـر بـوون کە وەرم گرت، بەڵام ئیدی کارێك بوو، و لە دەستم چوو، هـیچ چارەیەکم نـەبوو.. وەك دەڵێن کردە پەشیمان نەك نەکردە پەشیمان! ڕاسـتە بـۆ وەرگرتنـی ٣ هـەزار لیرە پتر لە ٥ هەزار لیرەم خەرج کرد بوو، ئیدی لەوەیا بوو بەشە میراتەکەم چنگ بکـەوێو کارەکـەم لـە تـەواو بوونـا بـوو، دوا ئیمـزام کـرد و بەڵگـەنامـەی پارەکـەم وەرگرت و بۆ خەزینەم برد، سەرۆك خەزنە کە چاکی دەناسیم بەڵگەنامەکـەی لێ وەرگرتم، سەیرێکی کرد و گوتی: زۆر چاکە، تەواوە...

ئەم قسەیە هێندەی دڵخۆش کردم، خەریك بوو بکەومە سەما! سەرۆك خەزنە بەدەم پشکنینی پەڕەکانی فایلەکەوە دەیگوت: بەڵگەی قەرزدانەوەی بانق... بەڵگەی سپاردن.. بەڵگەی دارایی... پولەکە شی تەواوە.. دەستوری سەرۆکیشی پێوەیە. زۆر چاکە و چ کەمو کورپیەکی نییە.

لە خۆشیاندا ئۆقرەم نەبوو، بەڵام ئەفسوس خۆشییەکەم زۆری نەخایاند. سەرۆك خەزنە کە فایلەکەی دەپشکنی گوتی: تف

پرسیم: چی بووە؟

– هیچ تەنیا ژمارەی فایلەکەتیان لێرە نەنووسیوە...

– ئەی تەگبیر؟

– دەبێ هەر ئێستا بڕۆی ژمارەی لێ بدەن!

– قوربان توبی خوا، تەگبیرێکی بکە، هێندە هیلاکم وا گیانم دەرهات. ژمارەی بۆ چییە؟

– من ئیمزاکەی دەکەم، بەڵام کاشێرەکە پارەکەت ناداتێ.. خۆت دەزانی پێوەندی بە منەوە نییە.

برادەران، خەنجەرت لێدابام خوێنم لێ نەدەهات، سەرۆك خەزنە بەزەیی پێدا هاتمەوەو گوتی:خاڵە بە خۆڕایی خۆت ماتەڵ مەکە...کاتەکەت لە دەست دەچێ. بڕۆ خێرا ژمارەی لێ بدەو بێرەوە.

بە مۆنییەوە وەڵامم دایەوە:– تا من دەچمە ئەوێ و دەگەڕێمەوە دەبێ بە شەو، چۆنە سبەی بەیانی بێمەوە؟..

سەرۆك خەزنە سەری بادا و گوتی: سبەی ئاخر رۆژە کە دەتوانی پارەکەت وەربگری.. بە گوێرەی یاسا ئەگەر فایلی میرات تا شەش مانگ تەواو نەبێ هەموو پارەکە دەبێ بە موڵکی دەوڵەت، سبەی شەش مانگەکەت تەواو دەبێ. دەبێ ئەمڕۆ ژمارەکە بێنی و سبەی پارەکەت وەربگری..

بێ دەسەڵاتانە دەستم بە داد و بێداد کرد.. سەرۆك خەزنە کە پیاوێکی باش بوو بە روویەکی خۆشەوە گوتی: بێدەنگ بە.. لەوانەیە سەرۆك دایەرە گوێی لە

دەنگت بێ و وا هەست بکات کە لە کاتی ئەنجامدانی فرمانندا سەرزەنشتی مامووری دەوڵەت دەکەیت، ئەوجا وەرە ئەو کەرە لەو قورەی دەربێنە.
بە ئەسپایی پرسیم: ئێستا چارە؟
– هەر ئەوەیە کە گوتم، دەبێ سبەی پارەکەت وەربگری، خۆ ئەگەر فریا نەکەوی و بەر لەوەی پارەکەت وەربگری بانق دابخرێ ئەوا پارەکەت لە کیس دەچێت، راکەو وەختەکەت بە فیڕۆمەدە.
دەستم بە راکردن کرد. پێ پیلکەکانم دوو دوو دەبڕی. یەکێك لە بەندییەکان گوتی: بێچارە چ زەحمەتێکی کێشاوە...
زیندە هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی: هێشتا چیتان دیوە؟.. ئەم گلۆڵەیە سەری درێژە! کە ویستم بچمە قوتابخانە زیندوو نەبووم.. کە بۆ سەربازی بانگیان کردم زیندوو بووم، لە کاتی تەواو بوونا مردوو بووم.. بەڵام کە ویستم بەشە میرات وەربگرم مردوو بووم...
ماوەیەك لە نیوە شەو تێ پەڕی بوو، بەندییەکان مەجبور بوون بخەون.. بە نابە دڵییەوە حەکایەتەکەیان بە نیوە چڵی جێ هێشتو چوونە ژێر جێگاکانیانەوە. لە کاتێکدا هەموویان حەزیان دەکرد گەر تا بەیانیش بووە دانیشن و گوێ لە پاشماوەی حەکایەتەکەی زیندە بگرن. حەکایەتێکی بە لەزەت بوو، بەڵام ناچار بوون تاکو سبەی شەو سەبر بکەن.

## (٥) هەر دەرگایەك بە جۆرێ دەکرێتەوە.

چوارەمین شەو بوو کە زیندە حەکایەتی بۆ بەندییەکان دەکرد. ئەم شەوش بەندییانی قاوشی یەك لەوانی دی زووتر هاتنە ژوورەوە وماموران مژوڵی ژماردنی بەندییەکان بوون.
شەوانی زیندان تاڵ وغەمناکە، کۆمەڵە مرۆڤێکی بێ چارە ونائومێد بە سیمای پڕ لەغەم و داخەوە هەر یەکەیان لە سووچێکدا دانیشتبوون و ئەژنۆیان لە

باوەش گرتبوو.لە قاوشی یەك دا، بەندییەکان کەرەسەی شیویان ئامادە دەکرد، چرایەکی کز بەبن میچەکەوە هەڵواسرا بوو کە بەحاڵ ژوورەکەی روناك دەکردەوە، لە ژوورەوەدا کترییەك ئاو دەکوڵا و قۆرییەکی دوکەڵاوی بە سەرەوە بوو.

بۆنێکی پیس و ناخۆش لە ئاودەستەکەوە دەهات. بۆنی ئەو پیازەی کە لەسەر پەرێمزەکە سوریان دەکردەوە، تێکەڵ بە بۆنی ئاودەستەکە دەبوو و تەبیاتی بنیادەمی تێك دەدا...

دەنگی خشە خشی سۆلی کۆمەڵێك کە بە ڕاڕەوەکەدا هاتوچۆیان دەکرد دەگەییە گوێ.

چەند بەندییەك بە پارچە رۆژنامە ئاگری نێو مەقڵی یەکەیان باوەشێن دەکرد.

شاگرد ئاشپەزێك بە دەنگی بەرز هاواری دەکرد:

لۆبیای گەرم، پیاڵەی بە لیرەیەك....

ردێن سپی قاوشەکە، زیندەی گاز کرد: "وەرە نانەکەت بخۆ..."

زیندە وەکو بێ دەسەڵاتێکی نیوە مردوو لە کەنار سفرەکەدا دانیشت.. بەپەلە شیوەکەیان خواردو سفرەکەیان پێچایەوە... پێش ئەوەی چای ئامادە بێ یەکێك لە بەندییەکانی گوتی: "کوڕگەل بێدەنگ بن، زیندە دەیەوێ دەست بە حەکایەتەکەی بکات".

وەك بڵێی تەواوی بەندییەکان چاوەڕوانی ئەم پێشنیازە بوون، هەر کەس وازی لە کاری خۆی هێناو لەسەر جێگاکانیان دانیشتن. زیندە هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا، دەیویست بەو ئاهە ئاگراوییە تەواوی خەم ودەردەکانی هەڵڕێژێ.

ردێن سپی قاوشەکە گوتی: رۆڵە قسان بکە... با بزانین ئاقیبەتی کارەکەت بە کوێ گەیی.

زیندە سەری لەقاند: "بە چاوان... دەیڵێم.. ئەگەرچی بەم زووانە حەکایەتەکانم تەواو نابێت... لێ بەلای کەمەوە باری سەرشانم سووك دەبێ". ئێستێکی کردوپرسی: "گەیی بووینە کوێ؟".

یەکێك لە بەندییەکان دەست بە جێ وەڵامی دایەوە: "گەیینە ئەو شوێنەی کە دەستت بە راکردن کرد.. دوو دوو پێ پیلکانەکانت دەبڕی بۆ ئەوەی ژمارەی فایلەکەت بێنی.

- راستە... بەراکردن لە دایەرە هاتمە دەرێ، دەمویست تا دەوام هەڵنەگیراوە ژمارەکە وەربگرمو بیهێنم. لەسەر جادەکە چاوەڕوانی تاکسیم کرد، بەڵام کوا تاکسی؟ کام شوفێری شیرپاك و حەلاڵ زادە بۆ منی رادەگری؟ تا ئافرەتی خشکۆکو پیاوانی شیك پۆش وەستا بن من سوار ناکەن.... هەر چەند دەپاڕامەوە، هاوارم دەکرد، جنێوم دەدا گوێیان لێ نەبوو. شەکەت بووم، دوای نیو سەعات شوفێرێکی بەوێڵ کە دڵی پێ سووتا بووم رای گرتو پرسی:

- بۆ کوێ؟

گوتم: دەچمە بازێری کافرۆشەکان.

بە ئیشارەی سەر گوتی: سەرکەوە...

دەستم برد، دەسکی دەرگاکەم گرت و بام دا... بەراست دا... بە چەپدا.. بە جۆرێ بام دەدا ئەگەر پۆلاش با دەچەمی، کەچی دەرگای پیرە تاکسی نەجولا. دەستم بە بۆڵە بۆڵ کرد.

شوفێرەکە گوتی:ئەوە چی دەکەی؟ دە سواربە دەی...

گوتم:- برادەر دەرگاکە ناکرێتەوە... ئاخر چۆن سوار بم؟

گوتی: - بەلای چەپا بای بدە.

گوتم: - بابە گیان بام دا... ناکرێتەوە.

گوتی: - چما نانت نەخواردووە؟! توند بای بدە..

لەم کاتەدا کۆمەڵە گەنجێکی بێکارە، ئەو گەنجانەی کە هەمیشە سەری کۆڵان و خیابانەکانیان گرتووە، کە چاویان بەم دیمەنە کەوت دەستیان بە گاڵتە کردن و پەلار هاویشتن کرد، تێکڕا هاواریان کرد: "بای بدە بابە گیان بای بدە بە جۆرێ بای بدە کە بابت بە چاو ببینی"!.

له لایەکەوه له دەنگه دەنگی گەنجەکان و لەلایەکی دییەوه له داخی دڵی خۆمدا تەواو شێت و دین بوو بووم.. هەر چەندە هێزم بە بەرخۆ دەدا و دەسکی دەرگاکەم بەم دیوو، و بەودیوا بادەدا دەرگاکە نەدەکرایەوە.

شوفێرەکە له پشت ڕێبوارەکەی تەنیشتییەوە دەستی درێژ کردو گوتی: – تۆ دەڵێی ڕاست و چەپت لێ گۆڕاوە.. سەیرکە با بەلای کەمەوە فێر ببی. بە پەنجەیەك دەسکەکەی بەرز کردەوەو بای دا، دەرگاکە تەقەیەکی لێوە هات و کرایەوە. بەپەلە خۆم خزاندە ژوورەوە، لە شەرمەزاریدا دەنگم دەرناهات، شوفێرەکە کەوتە خوتەو بۆڵە، لەبەر خۆیەوە دەیگوت: "خوایە لەم دنیایەدا چەند جۆرە خەڵقەندەت هەیە؟ زۆر شوکور خوایە کە رزقی ئەم بنیادەمە بێ باشارانە دەدەیت".

یەکێك له ڕێبوارەکان له دوای شوفێرەکەوە هەڵیدایە: هەقتە... ئەم گەنجە هێشتا چەپ و ڕاستی خۆی ناناسێت!.

کابرای شوفێر کە دیتی یەکێك لە ڕێبوارەکان پشتگیری دەکات، پتر شولی لێ هەڵکێشاو گوتی: "منی بێ چارە دەبێ دەرسی ڕێبوارەکانیش بدەم... بابە گیان ئەم ئوتومبیلە خارجییانە لە گوڵ ناسکترن.. نابێ زۆرانبازی لەگەڵدا بکرێ. خۆ دەرگای زۆرخانە نییە. هەر چۆنێ بێ بیکەیتەوە... دەبێ زۆر بە هێمنی و لەسەر خۆ بەلای چەپدا بای بدەیت تا دەرگاکە دەکرێتەوە:. من بیرم لەلای وەرگرتنی ژمارەی فایل بوو، گوێم بە قسەی شوفێرو ڕێبوارەکان نەدا، بۆ ئەوەی شتەکە لە کورتی ببڕێتەوە زۆر بە ئارامی و بە ئەدەبەوە گوتم: هەقتانە، بەڵام منیش چ خەتایەکم نییە... کارەکەم گیری خواردووەو بیرم لەلای خۆم نییە. نەمتوانی دەرگاکە بکەمەوە..

شوفێرەکە هەر وازی نەهێناو گوتی: "بابە گیان کەسێ کە دەرگای تاکسییەکی بۆ نەکرێتەوە، مانەوەی لە دنیادا بێ سوودە".

زۆری نەما بوو بکەومە ویزەی و بڵێم: "فلانی تۆ وەرە بنیادەمێکی زیندوو بدۆزەوەو ئەوجا ئەرکەکەی بڵێ"، بەڵام لەوە ترسام کە لە ناوەندی ڕێگاکە دا دام

بگرێ و کارەکەم بەنیوە چڵی بمێنێتەوە.. زمانی خۆم گرت و بێدەنگ بووم.
ئەمجا ڕێبوارێکی دی کە سەرو ردێنی سپی بوو بوو دەستی پێکردو گوتی:
"هۆی ئەوەیە کە سەرنج نادەن! دڵیشیان بە ماڵی خەڵکی ناسووتیٚ".
پڕ بە دڵ حەزم دەکرد بکێشم بەنێو دەمی ئەم پیرەمێردەداو لاڵی بکەم تا
جارێکی دی خۆی لە کاری خەڵکانی دی هەڵنەقورتێنێ، بەڵام فایلەکەم لە دەست
دەچوو.
شوفێرەکە لە وەڵامی ڕێبوارەکەدا گوتی: وەڵڵا باوکە گیان من تەواو هەراسان
بووم.. دەبێ ڕۆژی هەزاران جار ڕێبوارەکان فێری کردنەوەو داخستنی دەرگاکە
بکەم... بریا دەوڵەت قوتابخانەیەکی بۆ ڕێبوارەکان دەکردەوە.
ڕێبوارەکە وەڵامی دایەوە: ڕۆڵە گیان ئەم کارانە پێویستی بەچوونە قوتابخانە و
دەورە بینین نییە، بنیادەم دەبێ تۆزێ هۆش و گۆشی ببێ.
جا وەرەو کەرە لەو قوڕە دەربێنە، تەماشایەکی ڕێبوارەکانی دیم کرد. خوا خوام
بوو یەکێکیان ڕەحمی بتلیسێتەوەو بڵێ: "دە بەسە بابە... ئەوەندە ئەم بێچارەیە
سەر کۆنە مەکەن". لێ ورتە لە کەسەوە نەهات. هەر دەتگوت لەوێش نین.
تۆزێکی دی ڕۆییشتین، ڕێبوارێکی بە تەمەن بە شوفێرەکەی گوت: ڕۆڵە من
لێرەدا دادەبەزم. شوفێرەکە وێستا، زۆر بە بەبێ ئەدەبییەوە گوتی: "خێراکە
ماتەڵ مەبە".
ئەوجا نۆرەی کابرای بە تەمەنە کە گیرۆدە ببێ. دوای ئەوەی چەند جارێك
دەسکی دەرگاکەی بەلای چەپدا بادا، هیلاك بوو،وگوتی: ڕۆڵە گیان دەرگاکە
ناکرێتەوە.
شوفێرەکە بە تووڕەییەوە گوتی: "بەلای ڕاستدا بای بدە باوکە گیان..."
ڕێبوارەکە گوتی: "تۆ ئێستا بەو برادەرەت گوت بە لای چەپدا بای بدە، کەچی بە
من دەڵێی بە لای ڕاستدا....".
– لاحەولە وەلا..کەس قسەی ڕاستودروستی بە گوێدا ناچێت.بابە لە دەرەوە
دەبێ بەلای چەپدا بای بدەی‌ولە ژوورەوە بەلای ڕاستدا..

ڕێبواری بە تەمەن کە چەند چرکەیەك لەمەوپێش لەگەڵ شوفێرەکەدا وەکو باوك وکوڕ وابوون، هاواری کرد: "جا خەتای من چییە، تاکسییەکەت فریشقەیە".
چەند ئۆتۆمبیلێ لە دوامانەوە ریز بوون ودەستیان بە هۆڕن لێدان کرد.
شوفێرەکە بە تەوسەوە وەڵامی دایەوە: پیرەمێردی خەڵەفاو کادیلاکت دەوێ، ئەمەش لە ئێوە زیادە. دەی خێرا دابەزە، پۆلیس دێت و سزام دەدا.
ڕێگا پەنگا بووەوەو تاکسییەکە زۆر بە زەحمەت و لەسەرخۆ دەچووە پێشێ، لە شوفێرەکەم پرسی: "ئەمە چ وەعزێکە؟ بۆ شەقامەکان گیراون؟ ئەمە وڵات نییە؟"
شوفێرەکە بە تووڕەییەوە مۆڕەی لێکردم وگوتی: چ پەلەتە، نیازی کوێت هەیە؟
گوتم: کاری دایەرەم هەیەو زۆر بە پەلەم، ئەگەر تاکو سەعات پێنج تەواو نەبێ، ئەو پارەیەی کە دەبێ وەری بگرم لە کیسم دەچێت.
شوفێرەکە لە قاقای پێکەنینی داو سەعاتەکەی نیشان دام: ئەوە تۆ لە کوێی برادەر... سەعات شەش و نیوە.
کێشام بەسەری خۆمداو گوتم: "ماڵوێران خۆم، ئەم هەموو تەوس و توانجەم قەبوڵ کرد، ئەم هەموو پاڕانەوەیەم بێ سوود بوو... جا تازە خێرا یان سووك بڕانێن دەرگا بکرێتەوە یان نەکرێتەوە بە من چی. من تەنیا سبەیم بە دەستەوە ماوە کە ژمارەی فایلەکەم وەربگرم. دایەرەکانی دەوڵەتیش هێندە لە یەکدی دوورن کە لە ڕۆژێکدا ناکرێ ژمارە وەربگرم و پارەکەشم وەربگرم.
بەندییەکان کە بێدەنگ بوو بوون لە پڕ کەوتنە جم و جۆڵ، یەکێکیان بە دەنگی بەرز گوتی: دەوەرە تەگبیری بکەن. ئەوانی دیش بە یەك دەنگ وەڵامیان دایەوە: "هێ..ی ...ی وەستا.. چۆنی تەگبیر بکەین.. "
زیندە دەمی وشك بوو بوو، پیرەوەرییە تاڵەکان بەرادەیەك کاریان تێ کرد بوو کە نایتوانی درێژە بە حەکایەتەکەی بدات. ڕدێن سپی قاوشەکە هاواری کرد: ئا.. ئا.. ها..ی چای چی چەند چایەکی گەرم بێنە..
شاگرد چای چییەکە بە ڕاکردن هات.. لە بەردەرگاکە وێستاو بە دوو دڵییەوە گوتی:- قوربان نیوە شەوە.. شتەکانمان پێچاوەتەوە.. ئەگەر دەفەرموون...

ردێن سپی لە ژێر لێوەوە هەندێ جنێوی داو گوتی: "نە پێویست ناکا برۆ..شاوری ماموره بسته بالآکه له پارەوەکاندا دەنگی دایەوە وکاتی نووستنی راگەیاند. ردێن سپی قاوشەکە گوتی: کوڕینە بچنە ژێر جیگاکانتانەوە، ئێستا ئەو هەتیوە دێت و قسەیەك دەکات. با پاشماوەی حەکایەتەکە بۆ سبەی شەو بمێنێ.

بەندییەکان بەپەلە چوونە ژێر جیگاکانیانەوە وخۆیان کردە خەوتوو.

## (٦) مەڵێ ئالیهە بڵێ بەڵا.

تەواوی بەندییەکان لە قاوشەکەدا کۆبوو بوونەوە.. زووتر خواردنیان ئامادە کرد بوو، چاوەڕێ بوون سەر ژمێرییان تەواو بێ، ماموران دەرگاکان داخەن وبڕۆن، تا دەست بەجێ سفرەکە رابخەن و شیوەکەیان بخۆن و حەکایەتەکەی زیندە بژنەون.

هەرکە دەرگا ئاسنەکەی زیندان داخرا، سفرەکەیان راخست بە بێدەنگی شیویان خوارد. دەتگوت گشت بەندییەکان لە بیری ئەنجامی سەرگوزشتە وبەسەرهاتەکەی زیندە دان، حەزیان دەکرد تا زووترە ئەوە بزانن کە زیندە میراتەکەی وەرگرت یان نا؟

زیندە لە قاقای پێکەنینی داو گوتی:

– ئێوە چەند خۆش باوەڕن؟ زۆریش پەلەتانە، پێشینیان گوتوویانە ئەگەر سەبرت بێ بەرسیلە بە ترێ دەبێ.

یەکێك لە بەندییە ئەبەدییەکان لەو سەری ژوورەکەوە هاواری کرد:

– زووتر حەکایەتەکەت بکە..

– بە چاوان.. لە کوێ بووین؟ ئا لە نێو تاکسییەکەدا بووم کە زانیم سەعات شەش و نیوە. بەڵام دایەرە سەعات پێنج هەڵدەگیرێ و دەبوایە بەر لە سەعات پێنج بگەمە ئەوێ. هیچ چارەیەك نەبوو، دەبوو چاوەڕوانی سبەینێ بکەم.

سبەینێ بەیانی زوو لەماڵ هاتمە دەرێو بەرەو دایەرە کەوتمە ڕێ تا زووتر ژمارەی فایلەکەم وەربگرمو بیبەم بۆ لای کاشێر. هەر کە گەییمە بەر دایەرە لەم و لەوم پرسی کە لە کوێ ژمارەی فایل دەدەن؟! گوتیان بچۆ هۆڵەکە و لە پرسگا بپرسە... چوومە پرسگا، دوو کیژی نەشمیلە لەوێ دانیشتبوون، یەکێکیان کلاڵفە خورییەکی لە مەچەکی ئالاند بوو، ئەوی تریشیان دەی کردەوەودەیکرد بە گلۆڵە. چونکە نەیان دەویست ببم بە بەر هەڵستی کارەکەیان، لەبەر پەنجەرەکە دا وێستام وچاوەڕوان بووم لێ ببنەوە ولێم بپرسن: چیت دەوێ؟ بەلاّم ئەوان سەرقاڵی کاری خۆیان بوون و هەر ئاوڕیشیان لە من نەدایەوە!

کات دەڕۆیی و پارەکەم لە کیس دەچوو. دڵم وەکو سەماوەر لە کوڵوجوشا بوو.

کچەکان سەرگەرمی قسەکردن بوون، یەکێکیان گوتی:

باشە بە بیری تۆ "ئەعزەم" ئەو پاڵتو فەرووەی لە کوێ بوو؟

دووەمیان گوتی: چ بزانم خوشکێ! خۆی دەڵێ بە قیست کڕیومە..

– نە گیانە، باوەڕ ناکەم، وابزانم یوسف بۆی کڕیوە.

سەبرم سوا، بۆ ئەوەی سەرنجیان رابکێشم، کاغەزەکانم لەبەر دەمیانا دانا، کەچی ئاگادار نەبوونەوە.

یەکێکیان دەیگوت: موچەکەی ئەعزەم بەشی ئەو شتانە ناکات.

دووەمیان گوتی: ئێمە هەقمان چییە، لە کوێی بوو، کێ بۆی کڕیوە.

– ئا.. وا.. ئەم قسانە چییە؟ هەموویان وەکو من و تو سادەنین.

– پێستی سروشتی نییە، دەست کردە.

– دەست کرد بێ یان سروشتی، دیارە زۆر گرانە، بۆ من و تۆ ناتوانین لەم پاڵتۆیانە بکڕین؟

کردنەوەی کلاڵفە خورییەکە تەواو بوو. یەکێك لە کچەکان گۆڤارێکی بە دەستەوە گرت و کەوتە پەڕە هەڵدانەوە. زاتم دایە بەر خۆم و گوتم:

– ببورە، خا.. خا.. نم.. ئەم ژمارەیە..

دیسان گوێیان بە قسەکەم نەدا، کیژی یەکەم گوتی:

- سێ ساڵە ئەم پاڵتۆیەم لە بەردایە.
دووەم گوتی: من چوار ساڵە. چما ئێمەش ژن نین، حەز ناکەین هەموو ساڵێ پاڵتۆکانمان بگۆڕین؟
ئەم جارەیان بە دەنگی بەرز گوتم: ئەرێ خانم ئەمە بۆ کوێ ببەم...؟
کچی یەکەم چاوێکی بە کاغەزەکانم دا خشاند و گوتی:
- لە ڕاڕەوەکەدا، ژووری چوارەم بە دەستە چەپدا.
چوومە ژووری چوارەم، بە ئەسپایی دەرگاکەم کردەوە، چوومە ژوورەوە، پیاوێك سەری خوار کرد بووەوە وفایلەکانی ڕێك دەخست، هەر بەو دەقەوە هاواری کرد: سەگباب ئەوە لە کوێ بوویت؟
لە بەردەرگاکەدا وێستام. کابرا سەری بلند کرد ومنی بینی، هەوەڵ جار بزەیەکی فێنکی بە ڕوومدا داو ئەوجا بە ڕوو گژی پرسی: بۆ بەبێ مۆڵەت دێیە ژوورەوە؟ ئێرە دایەرەیە.. پێویستە لە دەرگا بدەیت و مۆڵەت وەربگری.
بە شەرمەوە وەڵامم دایەوە: کاری بە پەلەم هەیە. فەڕاشەکە لەبەر دەرگا نەبوو.
بە تووڕەییەوە نەڕاندی بە سەرما: ئەی ئێمە لێرە پیاز پاك دەکەین. نابینی سەد فایلم لەبەر دەستدایە. بێنە بزانم چیت دەوێ؟
کاغەزەکانم لەسەر مێزەکەی دانا، هێشتا ورتەم نەکرد بوو، گوتی:
- ئەها.. بچۆ بۆ لای کاك برایم.
- کاك برایم کێیە؟
- چۆن نای ناسیت؟ کاك برایم لەم دایەرەیەدا لە گای قەش دیارترە. ئافرەتێك کە لە تەنیشت میزەکەی ئەو دانیشبوو، گوتی: لە ڕاڕەوەکەدا بپرسە نیشانت دەدەن.
هاتمە دەرێ لە ڕاڕەوەکەدا چەند کەسێك کە لە دەرگاوان دەچوون لەسەر کورسی دانیشت بوون. بە بۆنەی میراتییەوە لەم ماوەیەدا هێندە هاتووچۆی دایەرەکانم کرد بوو، ئاشنای سیمای دەرگاوانەکان بوو بووم. پیاوێك لە بەردەرگای یەکێك

لە ژوورەکان دانیشتبوو، خەریکی تەزبیحا-ت بوو.. ترق.. ترق.. چوومە لای و پرسیم:

- ئەریٚ فەرمان بەرتان هەیە بە نێوی کاك برایم؟

یارۆ بە جۆریٚ بە ڕووما هاتەوە، هەر ژێوان بوومەوە.. دەتگوت سەر زەنشتی دایەرەکەم کردووە. برادەران ئێوە نازانن، هەندیٚ لەم دەرگاوانانە چ پلەو پایەکیان هەیە! لە سەرۆك دایەرەیەك پتر دەستیان دەڕوات.. پڕ بەدڵ حەزم دەکرد ناسنامەم هەبوایە و ببوایەم بە دەرگاوان لە یەکێك لە دایەرەکاندا.. لەم وڵاتەی ئێمەدا هیچ کارێك لە دەرگاوانی چاکتر نییە. کە پیاو دەرگاوانی سەرۆك دایەرەیەك یان بەڕێوەبەرێکی گشتی یان وەزیرێك بیٚ ئیدی نانی دەکەوێتە ڕۆنەوە.

هەندێکیان ئەوەندە دژوارن پیاو حەز دەکات ئیزراعیل ببینیٚ بەڵام ئەوان نەبینیٚ. خۆش بەختانە ئەو دەرگاوانەی من پرسیارم لێکرد لە چاکەکان بوو. ماوەیەك پشت گوێی خوراند، تاوێك چاوی هەڵگۆفت، دوو سیٚ جار باوێشکی داو ئەمجا وەڵامی دایەوە:

- کام کاك برایمت دەویٚ؟

- بۆ چەند کاك برایمتان هەیە؟

- زۆر.. زیاد لە نیوەی فەرمانبەرانی ئەم دایەرەیە برایمیان ناوە.

ئەوجا دەستی بە ژماردنیان کرد:

- سەرۆکی دایەرەکە نێوی برایمە. پێی دەڵێن برایم مەمەدی، برایمێکی دیمان هەیە مێردی زوڵێخا خانە. برایمێکی دی قەمورە، یەکێکی دی شێتە.

گوتم: وەڵڵا نازانم کارەکەی من لەلای کامیانە!

- بڵیٚ بزانم کارەکەت چییە، تا پێت بڵێم بۆ کویٚ بچیت.

- لە ڕاستیدا کاری میراتم هەیە. خوا مردووی هەموو لایەك ببەخشێت.. بابم عومری درێژی بۆ تۆ جیٚ هێشتووە، هەموو ئیشەکەم تەواو بووە تەنیا ژمارەیەکی کەمە کە ببیەم و پارەکەم وەربگرم.

دەرگاوانەکە هەستایە سەر پێ. دەستی خستە سەر شانم و گوتی: ها.. ها.. ها.. ئێستا حاڵی بووم.. خۆ لە هەوەڵەوە ئەمەت گوتبا.. دەبێ بچیت بۆ لای برایم درۆزن.

- برادەر ئەوە پێم رادەبوێری؟

- رابواردنی چی؟.

لە سیمایا دیار بوو کە بابەتی رابواردن نییە، پرسیم:

- ووتت برایم درۆزن؟

- بەڵێ.. تۆ نەشارەزایت.. لە ڕاڕەوەکەدا، دوا دەرگا بە دەستی راستدا.

- خوا دەست بە باڵتەوە بگرێ برادەر خوا حافیز...

بەرەو ئەو ژوورەی کە نیشانی دام چووم. لە دەرگام دا و چوومە ژوورەوە. کابرایەکی لاوازی رەقەڵە بە حاڵ لە پشت دەفتەرو فایلەکانەوە دەبینرا. سڵاوم کرد و پرسیم:

- ببورن، ئێوە کاک برایمن؟

- چیت دەوێ؟

- ژمارەیەکی میراتیم دەوێ.

- کاک برایم چووە بۆ لای ئالیهە خان..

پرسیم: ئالیهە خان لە کوێیە؟

کوت و پڕ تووڕە بوو، و هاواری کرد

- من چوزانم لە کوێیە؟!

- ببورە، مەبەستم ئەوەیە لە کوێ کار دەکات؟

- سکرتێری جەنابی سەرۆکە.

- ژوورەکەی جەنابی سەرۆک کامەیە؟

دەمی داچەقاند، هەر بەو دەقەوە، بە پەنجە ئیشارەتی کرد و گوتی:

- لێرەیە، کوڕی باش ئەمە پرسی ناوێ، بچۆ نهومی دووەم نیشانت دەدەن.

بەپەلە هاتمە دەرێ.. کات بەخێرایی دەڕۆیی، من بەپەلە دەڕۆیشتم، یەکێك لە بەرانبەرمەوە بەپەلە دەهات و هێندە بە توندی شانی بەرم کەوت، کاغەزەکانم پەرت و بڵاوبوونەوە و خۆشم گرموڵە بووم، ئەوەی کە شانی لێدا بووم گوتی:
"هێواش.. مامە.. خۆ ئاگرت پێ نییە؟..

بە هەزار حاڵ هەستامەوە.. کاغەزەکانم کۆکردەوە، بۆ ئەوەی لەگەڵ یارودا یەخانگیر نەبم و کارەکەم لە دەست نەچێ گوتم:

– ببورە.. دوای لێ بوردن دەکەم.

بەڵام ئەو لە عوزر خواییەکەی من شێت گیرتر بوو، و هاواری کرد:

– پێویست ناکات تەوازۆبخوازی. وەکو بنیادەم بڕۆ بە ڕێوە.

بەخۆم گوت، "بەلاّ دەبارێ." بۆ ئەوەی خۆم لە شەڕی لادەم بە نەرمییەوە گوتم:

– کاکە خەیاڵم بڵاوە.. ماندووم.. بە دەستی خۆم نەبوو. لە بەیانییەوە تا ئێستا من لەم ڕاڕەوانە دا دێم ودەچم.

خوا کاری ڕاست بێنێ. ئەویش کۆتایی پێ هێناو گوتی:

– وەڵڵا منیش پەلەمە.. هێندە سەر کەوتووم و دابەزیووم شێت بووم. جگەرەیەکی داگیرساند. یەکێکیشی بە من دا وگوتی:

– من بە دوای ئالیهە خاندا دەگەڕێم...

بە خۆشییەوە گوتم: منیش بە دوای ئەودا دەگەڕێم. تۆ چ کارت پێیەتی؟

– ئەی تو؟

– من ژمارەی فایلم گەرەکە.

– بۆ چما ئەو دەفتەرداره؟

– نەخێر کارم بە کاك برایمە.. کا برایمە چووەتە لای ئەو..

– منیش کارم بە کاك ڕەمزی هەیە، دەڵێن چووەتە ژوورەکەی ئەو. لە پارەوە تاکو ئێستا بەدوی یەك فایل دا وێڵم و هێشتا هیچم بە هیچ نەکردووە.

لە یەکدی جودا بووینەوە.. کە گەییە نیوەی قالّدرمەکە لە دواوە بانگی کردم:
"ئەگەر ئالیهە خانت دۆزییەوە، منیش ئاگادار بکەوە.

لە پلەکانی سەرەوە دەنگی ئافرەتێك هاتە گوێ.

– منیش بەداوی ئالیهە خاندا دەگەڕێم. گەر دۆزیتەوە منیش ئاگادار بکەوە.

پیرەمێردێکیش لە ڕاڕەوەکەوە هاواری کرد: "منیش کارم بەو هەیە." کە گەییمە نهۆمی دووەم، دیار بوو کە کۆمەڵێك بە دوای ئالیهەخان دا دەگەڕێن. بە پرسیار ئالیهە خانم دۆزییەوە. لە دەرگام داو چومە ژوورەوە... سێ ئافرەت لە پشتی مێزەوە دانیشتبوون، پرسیم:

– ببورن، ئالیهە خان کامتانن؟

ورتە لە کەسیانەوە نەهات.. پرسیم: "کاك برایم لێرە نییە؟"

یەکێکیان بە نازەوە سەری بەرز کردەوە، زەردەخەنەیەکی کرد وپرسی:

– چیت دەوێ؟

– ژمارەی فایلم دەوێ..

ئەو کچەی وەڵامی دامەوە سەری بە ژوورەکەی تەکیا کێشاو گازی کرد:

ئالیهە کاریان بە تۆ هەیە.. کاك برایم بۆ کوێ چوو؟

دەنگێکی تەوس ئامێز لە ژوورەکەی تەنیشتەوە بەرز بووەوە:

– چوو بۆ حیسابات...

لە ئافردتەکانم پرسی: "حیسابات لە کۆییە؟"

– لە نهۆمی چوارەمە...

لەوێ هاتمە دەرێ و چووم بۆ نهۆمی چوارەم... بەر دەرگای حیسابات ئەوەندە قەردبالغ بوو سەگ خاوەنی خۆی نەناسییەوە.. لەهەر لایەکەوە جۆرە دەنگێك دەهات. یەکێك هاواری دەکرد: خەزنە لە کوێیە؟

دووەم: سەرۆك بۆ کوێ چووە؟

سێیەم: بۆ مەردم سەرگەدان دەکرێت؟

چوارەم: یەك هەفتەیە بە خۆڕایی دەسوڕێمەوە.

چای چییەکە، کە چەند پیاڵەیەکی خستبووە نێو سینی یەك و هاواری دەکرد:

– هۆپ.. نەسوتێن.. تەڕنەبن..

پیرێژنێك کە دەستی منداڵێکی گرتبوو، پرسی: ببورن، ئاودەست لە کوێیە؟ ئەم منداڵە تەنگاوە...

یەکێکم دۆزییەوە کە لە دەرگاوان دەچوو.. چوومە لایەوەو پرسیم:

- کاك برایمت نەدیوە؟

بێ ئەوەی وەڵامی من بداتەوە، دەرگاکەی کردەوە و چووە ژوورەوە..

من لەبەر دەرگاکە مامەوە.. دوو پیاوی پیر لە تەنیشت منەوە بە دەنگی بەرز قسەیان دەکرد و پێدەکەنین:" ماشەڵلا سەیرکە چ هەوایەکە.. دەشڵێن لە دایەرەکاندا کار نییە؟ فەرمانبەرەکان لە بەیانییەوە تا عەسر بێکارن! بێگومان ئەم حەشامەتە بە خۆرایی بۆ ئێرە نەهاتوون.. هەڵبەتە کاریان هەیە؟

مەعلوم نەبوو بە راستیان بوو یان گاڵتەیان دەکرد، لە پاڵە پەستۆی خەڵکەکەو لە بۆنی ئارەقەی گیانی مەردم دا دڵم تێك هەڵدەهات. بریارم دا بە هەر نرخێ بووە رێیەك لە نێو حەشاماتەکەوە بکەمەوە وبچمە دەرەوە.

لەو کاتەدا کە هەوڵم دەدا رێیەك پەیدا بکەم و بێمە دەرێ، ژنێکی قەڵەو خۆی بە سەرما دا و گوتی:" کاکە تۆزێ ئاوم بدەرێ.. خەریکە دەمرم...

هاتمە کەنارەوە گوتم:" ئاوی چی؟ .. هەوانییە چ جای ئاو". ژنە قەڵەوەکە دەستی لە گەردنم توند کرد: ئەوەندە بە دوای سەرۆکی حیساباتا گەرام ئاوی پێم داهات، خەریکە دەمرم.

بە تۆبزی دەستی ئەو ژنە قەڵەوەم لە گەردنی خۆ هەڵگرت. لە پاڵ دیوارەکەدا دامناو گوتم:" خانم گیان.. من لە تۆ بەد بەخت ترم.."

ژنە قەڵەوەکە بە پەرێشانییەوە دەیویست خۆی بخاتە باوەشم، کەلێنێکم دۆزییەوە و بۆی دەرچووم، دوای ماندوو بوون و گەڕانێکی زۆر ژووری حیساباتم دۆزییەوە و بەبێ مۆڵەت وەرگرتن چوومە ژوورەوە.. ئافرەتێك میکیاجەکەی دەموچاوی تازە دەکردەوە.. پیاوێکیش لە پشت رۆژنامەیەکەوە پەنهان بوو بوو و سەرگەرمی مۆتالا بوو. چونکە ئافرەتەکە خەریکی ئارایشت

کردن بوو، بڕیارم دا لە کاکی ڕۆژنامە خوێن بپرسم.. چوومە لایەوەو گوتم: "ببورە، ئێرە حیساباتە؟!"

ڕۆژنامەکەی هێنایە خوارەوە، سمێڵ بابر وعەینەك لە چاو کە بە ئاشکرا لە توڕەیی دا دەلەرزی. لێوەکانی لە ژێر سمێڵییەوە بزواند وقیژاندی:

– مەگەر کوێری کابرا، تابلۆی بەر دەرگاکەت نەدیت؟

– دیتم قوربان، ئالیهە خان بۆ ئێرەی ناردم. کارم بە کاك برایمە.

– کاك برایم چوو بۆ هۆڵی کۆنفڕانس... بڕۆ بۆ ئەوێ.

پرسیم: هۆڵی کۆنفرانس لە کوێیە؟

– چوزانم کابرا.. بڕۆ لە پرسگا بپرسە...

هاتمە دەرێ، دوای ئەم هەموو شەرە شەقە، تازە دەبێ بچم لە پرسگا بپرسم واتە هەمان شوێن کە لە هەوەڵەوە دەستم پێ کرد بوو. لە ڕاڕەوەکەدا تووشی پیرەمێردێك بووم، داوای کۆمەکم لێ کرد. پێکەنی وگوتی: "هێشتا لە هەوڵی ڕێگا دایت. من سەرم لە نێو ئەم دایەرەیەدا سپی کرد و بە هیچ شوێنێ نەگەییم، چاکتر وایە بچیتەلای بەڕێوەبەری گشتی دایەرەو شکایەتی خۆتی بۆ بکەیت، بەڵکو کارێکت بۆ بکا ئەگینا...

یەکڕاست چوومە بەر دەرگای ژووری بەڕێوە بەری گشتی، ویستم بچمە ژوورەوە، یەکێك لە دواوە چاکەتەکەی گرتم، توڕی دامە ئەو لاوە وگوتی:

– بۆ کوێ...؟ سەرت داخستووە و دەتەوێ بچیتە ژوورەوە؟!

– دەمەوێ بچمە لای بەڕێوە بەری گشتی...

یارۆ رادیۆیەکی بچووکی بە دەستەوە گرتبوو، هەر بەو دەقەوە کە گوێی لەمن دەگرت، گوتی:

– بەم ئاسانییە.. ئەی ئێمە لێرەدا چ کارەین؟

زانیم دەرگاوانی بەڕێوە بەری گشتییە.. هەڵم داێ و گوتم:

– ببورە ئاگام لێ نەبوو.. مۆڵەتم بدە بچمە خزمەت جەنابی بەڕێوەبەری گشتی...

دەرگاوانەکە هەموو هەست و نەستی لەلای رادیۆکە بوو، گوێی لە تەراتێنی فوتبۆڵ دەگرت. هاواری کرد: "یاڵڵا گۆڵ بکە بێ ناموس.. تف... "ئەوجا رووی کردە من وگوتی: نەخێر مۆڵەتت نادەم...

– بۆ چی؟..

– جەنابی بەرێوەبەری گشتی لێرە نییە...

– دەتوانم چاوەڕوانی بکەم؟

– نەء، تا ئاخری دەوام تەشریف نایەنێ... سبەی وەرەوە لێرە دەبێ.. کەوتمە پاڕانەوە: براگیان، بە قوربانت بم کارەکەم پەلەیە.. وەختەکەم لە کیس دەچێ و بەد بەخت دەبم. یارمەتیم بدە بەڵکو ئەوڕۆ دەگەمە خزمەتی. دەتوانم لە کوێ بیبینم؟!

وەك بڵێی دڵی پێ سووتام، گوتی: "چووەتە ستودێوی وەرزش کە سەیری تەراتێنی فوتبۆڵ بکات بچۆ لەوێ بیدوزەوە."

لە دایەرە هاتمە دەرێ، بەهەر زەحمەتێ بوو خۆم گەیاندە ستودێو. هێندە قەرەباڵغ بوو دەرزیت هەڵدابا بە عەردی نەدەکەوت.

– چۆن لەم قەرەباڵغییەدا جەنابی بەرێوەبەری گشتی وەدۆزم؟

ئیدی خۆم بە نێو حەشاماتەکەدا کرد، پێی ئەم و ئەوم دەشێلا، جنێویان دەدامێ، دەڵەکیان دەدام، خۆم گەیاندە کەنار مێزەی هەواڵ نێرەکان.. دڵنیا بووم کە ئەوان جەنابی بەرێوەبەری گشتی دەناسن. گەنجێك سەرگەرمی نووسین بوو، لێی چوومە پێشەوە و پرسیم: "ئەرێ جەنابی بەڕێوەبەری گشتی لە کوێیە؟"

بە دەست ئیشارەتی بۆ ژوورێکی سەرەوەی خۆی کرد، یەکراست بە پلەکاندا بەسەر کەوتم، پاسەوانێك لەبەر دەرگا وێستا بوو، پرسی: "ها، بۆ کوێ؟"

– کارم بە جەنابی بەڕێوەبەری گشتی هەیە..

هێندەیان دەڵەکە دابووم، چاکەتەکەم تیکە تیکە بوو بوو، ئەگەر پشتێنم نەبایە پانتۆڵەکەم دەکەوت.

پاسەوانەکە قەدەرێ لە قەد و باڵام وورد بووەوە، گوتی:

- کاری چیت هەیە؟
ئەگەر بمگوتبا ژمارەی فایلم دەوێ، موحەقەق لەو بانەوە دەی خستمە خوارەوە، خۆم گیڤ کردەوە وگوتم: "مەسەلەیەکی گرنگە... نهێنییە و دەبێ بە خۆی بڵێم..."
پاسەوانەکە باوەڕی کرد، دەرگاکەی کردەوە و چووە ژوورەوە... تا مۆڵەت وەربگرێ، منیش لە دووی ئەوەوە خۆم بە ژوورێ دا کرد. زەلامێك لە پشت مێزەکەوە دانیشتبوو. تەلەفۆنی دەکرد. پاسەوانەکە تەمەنایەکی عەسکەریانەی کرد وگوتی: "قسەیەکی نهێنی هەیە..."
من پشتینەکەم بە دەستم گرت و سڵاوم کرد. بەڕێوەبەری گشتی پرسی:
- چییە؟
حەکایەتی فایلەکەم لە نوکەوە بۆ گێڕایەوە و گوتم قوربان دوو دانە ساڵە من بەدوای ئەم فایلە دا غاردەدەم. بەڕێوەبەری گشتی کە لە تووڕەیی دا دین بوو بوو، ئەمری بە پاسەوانەکە کرد:" بیکە دەرەوە" پاسەوانەکە قۆڵی گرتم، دەیویست لە ژوورەکە، وەدەرمنێ. بەڵام من ئامادە نەبووم هەروا بە ئاسانی ئەم هەلە لە کیس خۆ بدەم.. دەستم بە هاوار وفریاد کرد:
- ئەمە چ وەزعێکە؟ ئەمە چ وولاتێکە؟ منی بێچارە دوو دانە ساڵە سەر گەردانی نێو دایەرەکانم. ئێوەش سەیری تەراتێنی فوتبۆڵ دەکەن.. من هاوارم دەکرد. سەرۆك جوێنی دەدا. پاسەوانەکەش مرخێش مرخێش دەیویست بمکاتە دەرەوە. کەسمان هۆشمان لای ئەوە نەبوو کە میکرۆفۆنەکە وازە ودەنگمان لە بڵند گۆ گەورەکانەوە دەچێتە نێو هۆڵەکەو تەماشا ڤانان گوێیان لێ دەبێ.
لە لەحزەیەکدا، کۆنترۆڵ و زەبت و ڕەبتی هۆڵەکە خرۆشا. حەشاما تەکە وەکو شارە میرۆلە هریان کردە ژوورەکەی بەڕێوەبەرەوە. تەراتێنەکە بە نیوە چڵی مایەوە. خەڵکەکە مێز و کورسییان شکاند. بوو بە شاور لێدان. بوو بەو ڕۆژەی قەرە وەیسی تێدا کوژرا. بوو بە فەرتەنەیەك هەر مەپرسە.
بەندییەکانیش تێکڕا گوتیان:" هەر مەپرسە.."

زینده له سەری رۆیی:– چەند پۆلیسێك هاتنه ژوورەوه كه بۆ شێت خانەم بەرن. زۆرم پیێ داگرت لێ بیێ سوود بوو. پاسەوانەكان شل كوتی عەمریان كردم. بەنیوه مردوێتی بۆ شێت خانەیان بردم.
شێت خانەی چی! لەوێ قورەكه هێندەی تر خەست بووەوه. بۆ ئەوەی رزگاربم، بەسەرهاتی خۆم و مردنەكەمم بۆ دكتۆرەكان گێرایەوه. ئەوانیش بە گومانی ئەوەی كه بە راستی دینم، عەمریان دا كه بمخەنه ژوورێكی تەنیاوه.
بەڵێ گەلی براینه ئەمه نموونەیەكی راستەقینەی یاسا و دادی وولاتی ئێمەیه. هەر كەسێك قسەی راست و ماقوڵ بكات شێته و دەبیێ ببرێ بۆ شێت خانه..
منی بێچاره كه دەمویست بچمه قوتابخانه دەیانگوت مردوویت. كه كاتی سەربازیم هات گوتیان زیندوویت. بۆ دانەوەی قەرزەكانی بابم زیندوو بووم، بۆ وەرگرتنی بەشه میراتی یەكەم مردمەوه. كه داوای ناسنامه دەكەم دەڵێن تۆ مردگی. كه دەمەوێ مافی خۆ وەربگرم دەمخەنه شێت خانەوه..
ماموره بسته بالآكه فوی به شاورەكەی دا كرد. كاتی نووستنی راگەیاند.. بەندییەكان خزانه ژێر جێگاكانیانەوه و پاشماوەی حەكایەتەكه بۆ سبەی شەوێ مایەوه.

## (٧) بۆ هەندێ كەسان دین دەبن؟

شەوانه كه دنیا تاری دەبوو، مامورەكان بە زەحمەت بەندییەكانیان دەكردە ژوورەوه. به تایبەتی ئەو رۆژانەی هەوا خۆش ودنیا هەتاو بوایه، بەندییەكان هەوڵیان دەدا پتر له نێو حەساری زیندانەكەدا وەمێێن. كەچی بەندییانی قاوشی یەك هەركه گوێیان له یەكەم شاور دەبوو، به غادان بەر و ژوورەكەی خۆیان دەچوون. بەپەله  شیویان ئاماده دەكرد. جێگایان رادەخستو ئاماده دەبوون كه پاشماوەی حەكایەتەكەی زینده بژنەون!
بەندییەكان دەیانویست بزانن كه زینده كو له شێت خانه هاته دەرێ و كەوته زیندانەوه...؟

کە سفرەکەیان کۆکردەوە، یەکێك لە بەندییەکان جگەرەیەکی داگیرساند و دایە زیندە وگوتی: "زووتر دەست بە حەکایەتەکە بکە."
زیندە گوتی: بە چاوان هەر ئێستا...
تەواوی بەندییەکان کڕ بوون. زیندە مژێکی لە جگەرەکەی داو گوتی:
- لە شێت خانەدا هەر کەس داد وبیدادی کردبا و بیویستبا هەقی خۆی وەربگرێ و بیسەلمێنێ کە ئاقلە رەنج بێ وەر دەبوو، بۆ بێدەنگ کردنی بەلایەکی وایان بەسەردا دەهێنا هەر بە راستی راستی شێت دەبوو. بەم چەشنە، منیش جلەوی خۆم پێ ناگیرا وهەمیشە جنێوم دەدا وهات و هاوارم دەکرد.
ردێن سپی زیندانەکە چایەکی بۆ زیندە داناو گوتی:
- چاکت دەکرد، بە لای کەمەوە دڵت فێنك دەبووەوە.
زیندە لە قاقای پێکەنینی دا:- هەردڵ، گیانیشم فێنك دەبووەوە. ئەو ئاوە ساردەی بە منیاندا دەکرد، بکرایتە دەریاوە دەی بەست!...
یەکێك لە بەندیەکان پرسی: چما سەهۆڵاویان بە سەرتدا دەڕشت؟
- بۆی ناوێ. کە من داد و بیدادم دەکرد، پزیشکەکانیش دەیان ویست فێنك ببمەوە و حەرارەتم کەم ببێتەوە... ئیدی بە فراویان پێدا دەڕشتم.
یەکێك لە بەندییەکان کە لە ژوورەکەدا پاڵ کەوتبوو، هاواری کرد:
- بابە وازی لێ بێنن بزانین چی دەڵێ.
زیندە لە سەری رۆیی: لە لایەکەوە بە فراویان بە سەرما دەکرد و لە لایەکی دییەوە بە شەق بەر دەبوونە وێزەم. منیش پەیتا پەیتا جنێوم دەدا و باب ودایکیانم نە دەبوارد... رۆژێ سەراپایان لە ئاو هەڵکێشام، جلێکی سپیان لە بەرکردم و بردیانم بۆ لای پزیشکی شێت خانە. کە چاوم بە پزیشکەکە کەوت دڵم خۆش بوو. و لە دڵی خۆمدا گوتم" "بێگومان ئەمەیان قسەی ماقوڵ وەردەگرێ."
سڵاوم لە حازری کرد و گوتم: "جەنابی دکتۆر وەڵڵا.. بە خوا من شێت نیم."
پزیشکەکە بەدەم زەردەخەنەوە گوتی:جا کێ گوتوویە تۆ شێتی؟

ئافرەتێکی شۆخ و شەنگ و سپی پۆش کە لە تەك پزیشکەکەوە وێستا بوو، بە لە بزێکی شیرین گوتی:

– جا کام شێتی ئەم دنیایە خۆی بە شێت دەزانیٚ؟

پزیشکەکە مۆڕەیەکی لە پەرستارەکە کرد و بەروو گرژییەوە گوتی:

– تۆ دەخلٚت نەبیٚ.. شرینقەی تایبەتی حازرە؟

– بەلٚیٚ حازرە..

پەرستارەکە دەرزییەکەی هێنا. رۆژی رەش بە چاو نەبینن. دەرزییەکە گەلێك لەو دلیوانەی کە دایکم کۆنە لیفەکانی پیٚ دەدروەوە ترسناکتر وئەستورتر بوو.

لەپڕ تێکڕای بەندییەکان گوتیان: دەوەرە، ئەم بارە راست بکەوە.. ئەوجا بە دەنگی بەرز پێکەنین و زیندە درێژەی بە قسەکەی دا:

– کە چاوم بە دەرزییەکە کەوت یا فاین خەریك بوو لە ترساندا لە هۆش خۆ بچم. هاوارم کرد: جەنابی دکتۆر بە قەبری بابم من شێت نیم.. پێم دەلٚێن تۆ مردوویت. ئاخر مرۆڤی مردوو شێت نابیٚ!.. کە ئەم ناماقولٚییەم کرد، ئیدی کاکی دکتۆر هاتە سەر ئەو باوەڕەی کە نەك هەر شێتم، بەلٚکو شێتێکی پەتریم. رووی کردە پەرستارەکە و گوتی:

– دەرزییەکە دانیٚ.. بچۆ بلٚیٚ با دووسیٚ مامور بێن. کەمەر بەندەکانیش بێنن... ویستم هەلٚێم.. بە قەلٚەمبازێك خۆم گەیاندە بەر دەرگاکە، پەرستارەکە قیژەیەکی ئەوتۆی کرد خەریك بوو پەردەی گوێم بدڕیٚ..

دەرگاکە کرایەوە دوو مامور بە غاردان هاتنە ژوورەوە. قۆلٚیان توند گرتم. هەولٚم دەدا قۆلٚم لە دەستیان دەربێنم و هەلٚێم کەچی کارەکە گەندتر بوو. پەرستارەکە بورایەوە.

پزیشکەکە بە خۆی دەرزییەکی گەورەتری دەرهێنا. دەرزییەکە هێندە گەورە بوو بۆ ئەوە دەشیا کەمنی بە دیوارەکەوە پیٚ دابکوتن.

شایەتمانێکم هێنا و خۆم راپسکاند، بەڵام بێ سوود بوو. مامورەکان وەکو مەڕی قوربانی بە عەردیانـدا دام. پزیـشکەکە پانتۆڵەکـەی هێنامـە خـوارەوە و دەرزییەکەی برد. ئێدی ئاگام لە هیچ نەما، هاوارێکم کرد و بورامەوە.

دوای چەند رۆژێك کە بەهۆش هاتمەوە، پەرستارەکە بۆی گێڕامەوە کە لەو ماوەیەدا هەر بانگی ئەقدەسم کردووە... سەیرم کرد فایدەی نییەو کەس نایەوێ گوێ لە قسەم بگرێ. ملم دایە خەت و بڕیارم دا کە بەکردەوە بۆ دکتۆرەکانی بسەلمێنم کە شێت نیم.

دوای ماوەیەك دەست و پێیان کردمەوە. کاری گسك دان و پاك کردنـەوەی ژوورەکان کەوتە ئەستۆی من. هێندە بە دڵو گیان کارەکانم ئەنجام دەدا شێت خانەکە بوو بوو بە گوڵ. پزیشکەکانیش دۆستانە دەیان دوواندم. چونکە دەیان بینی کە ئەگەر من کار نەکەم وەزع خراپ دەبێ، و هەموو رۆژێ چیرۆکم بۆ دەگێڕانەوە و سەرگەرمم دەکردن... پزیشکەکان پارەیان دەدامێ و دەستیان دەگرتم.

رۆژێ بە سەرۆکی شێت خانەکەم گوت: "جەنابی دکتۆر بە لای کەمەوە لە لای خۆتان دام بمەزرێنن و مۆچەیەکم بۆ ببڕنەوە...

سەرۆکی شێت خانەکە گوتی: ئەگەر ناسنامەت هەبێ، ئەم کارەت بۆ دەکەم.

گوتم: جەنابی دکتۆر من ناتوانم تا ئاخری تەمەنم بە خۆڕایی کار بۆ ئێوە بکەم، کەواتە بە لای کەمەوە رێم بدەن با بڕۆم.

سەرۆك گوتی: جا کێ رێی لێ گرتوویت فەرموو بڕۆ...

وا مزانی بەراستییەتی، هەر هەستام و کەوتمە رێ. سەرۆك گوتی:

– بۆ کوێ؟

گوتم: تۆ گوتت بڕۆ.. منیش دەمەوێ بڕۆم.

پزیشکەکە گوتی: من وام نەگوت.. ئەگەر ناسنامەت هەیە دەبێ.. ئەگینا پێویستە فیرار بکەی... کە فیرایشت کرد ئێمە لە تۆماری شێت خانەکەدا دەنووسین شێتێکی بەرباد فیرای کردووە.. ئەو ساکە پێویست بە ناسنامەش

ناکات.. هەرکە هەلت بۆ هەڵکەوت یەك دەنك مەوەستە. بەڵام بە کەس نەڵێی کە من فێرم کردوویت..

– نەخێر جەنابی دکتۆر، خۆ من شێت نیم تا بە خەڵکی بڵێم...

کە لە ژوورەکەی دکتۆر هاتمە دەرێ، لە دواوە گازی کردم: هەر کە لێرە دەرچوویت، هەوڵ بدە هەر چۆنێ بووە تەگبیری ناسنامەیەك بکەیت..

گوتم: جەنابی دکتۆر نام دەنێ، چی بکەم؟

گوتی: بچۆ دادگا و عەرز وحاڵێ بدە. دادگاش دوای لێکۆڵینەوە ناسنامەت دەداتێ..

تا ماوم خۆشەویستی ئەم پزیشکە فەرامۆش ناکەم. بیرم دێت رۆژێ کە لەگەڵ برادەرەکانیدا گاڵتەی دەکرد، قاوەم بۆ بردن. پزیشکەکان باسی مرۆڤی ئاسایی و چۆن هەندێ کەس شێت دەبن، دەکەن. تاکو ئێستاش قسەکانیان لە گوێم دا دەزرنگێتەوە.. سەرۆکی شێت خانەکە دەیگوت:

– مرۆڤی ئاسایی وەکو مەنجەڵێك وان کە لەسەر ئاگر دانرا بێ، کە ئاوی مەنجەڵەکە دێتە کوڵ و جۆش لە قەراخەکەیەوە دەڕژێ، تەنانەت مەنجەڵی هەڵم پەست لە سەرەوە کونی بۆ کراوە تا بەشێ لە هەڵمەکەی لێوە دەربچێ و نەتەقێ.. ئادەمیزادیش وان. پێویستیان بەوەیە هەندێ جاران خەم و دەردی دڵیان هەڵڕێژن. ئەگەر ئەم دەرگایە نەبێ دڵیان دەتەقێ و بۆیە کاری نا ئاسایی دەکەن و بە قسەی ئێمە رەفتاری وا دەکەن کە دوورە لە رەفتاری مرۆڤی ژیرو ئاقڵەوە.. و نابێ کەس عەیب لەم کەسانە بگرێ..

هەر ئەو شەوە رام کرد. بەو تۆزە پارەیەی کە پزیشکەکان پێیان دابووم خۆم گەیاندە شار. سبەی بەیانی زوو چوومە نك یەکێك لە عەرزوحاڵ نووسەکانی بەر پۆستە خانە، حاڵی خۆم بۆ باس کرد و داوام لێ کرد عەرز وحاڵێکم بۆ دادگا بۆ بنووسێت. کابرای عەرز وحاڵ نووس، عەرز و حاڵێکی ئاگرینی وای بۆ نووسیم قورئان بە حەقت هەر کەس بیخوێنایەتەوە فرمێسك دەزاییە چاوی. هەر کەسێ عەرز وحاڵەکەمی بە دەستەوە گرتبا دەسووتا.

عەرز و حاڵەکەم دا بە دادگا. ژمارەیەکیان دامێ و گوتیان جوابت لێ دەگێڕینەوە. ئیدی چاوەڕوانی کۆ بوونەوە بووم. بۆ کار دۆزینەوە کەوتمە نێو کوچە و بازاڕەکان. بەلاّم کوا کار؟.. ناسنامە دارو خوێنەوارە حێلەکان بێ کار بوون.. ئیدی کێ کار بە بابایەکی مردوو دەدات.. دەست مایەکەشم لە تەواو بوونا بوو... حەیران و سەرگەردان رۆژم بە شەو دەسپارد و نەمدەزانی لەم گەورە شارەدا چی بکەم.

بابم بە رەحمەت بێ لەگەڵ مردووی حازری دا، دۆستێکی گیانی بە گیانی هەبوو. چوومە کنی و باسی ژیان و گوزەرانی خۆم بۆ کرد. دۆستەکەی بابم هەندێ پارەی بە قەرز دامێ و بریار بوو هەر وەختێ بەشە میراتییەکەم وەرگرت قەرزەکەی بدەمەوە.

خوا حافیزیم لە دۆستەکەی بابم کرد و بەرەو ئەو چاخانەیەی کە شەوان لێی دەنووستم، کەوتمە رێ. وێستگاکە زۆر قەرەباڵغ بوو، شۆفیرەکان هاواریان دەکرد: یالّلا.. مەیدانی رێگای ئاسن.. بە خۆڕایی.. ئەوەی نەیەت پەشیمانە.. خێرا کەن ٢٠ لیرەش دەدەین.. هەم خزمەتی نیشتمان دەکەن و هەم ٢٠ لیرەشتان دەست دەکەوێ! بە خۆڕاییە کوڕینە، لەبەر خاتری نیشتمان وەرن!...

سەرم سورما، خێرە وا بە بەلاش خەڵکی دەبەن و ٢٠ لیرەشی دەدەنێ! بابم بە رەحمەت بێ هەمیشە دەیگوت: "ڕۆڵە گیان ئەگەر شتێکیان بە خۆڕایی دایتێ نەخەڵەتا بی وەری بگری، چونکە گەلێك پتر لەوەی دەت دەنی سوودت لێ وەردەگرن"

هەر چەندە قسەکەی بابم لە یاد بوو، وەلێ مەنجەڵی تەماحم هاتبووە کوڵ و جۆش. شانم هەڵتەکاند و لە دڵی خۆمدا گوتم: "قسەکەی بابم کۆنە، ٢٠ لیرە دەدەن و بە خۆڕایی دەم بەن.. با بچم بزانم چ باسە!..

سواری ئۆتومبیلی خۆڕایی بووم و بەرەو رێگای ئاسن رۆییشتم.. لە رێگادا لە زەلامێکی تەنیشت خۆمەوە پرسی: "ئەرێ کێ پارەکەمان دەدات؟"

کابرای تاین مۆڕەیەکی لێکردم و گوتی: "پێشەوای حیزب دەیدا.. نە لە قسەکەی حاڵی بووم و نە بە جوانیشم زانی بپرسم پێشەوای حیزب یانی چی، سەرم لە قاند و گوتم: هەر کەسێك بێ دیارە مرۆڤێکی چاکە بۆیە بە خۆڕایی دەمان بات..."

کە گەیینە وێستگای رێگای ئاسن، جمەی دەهات، قەرەباڵغییەکی وەها بوو دەرزیت هەڵدابا بە عەردی نەدەکەوت. کۆمەڵێك کوڕو کاڵ ئاڵایان بە دەستەوە گرتبوو. مندالان سروودیان دەگوت. هەندێکی دی هورایان دەکێشا و چەپڵەیان دەقوتا. "بژی نیشتمان"، "پایەدار بێ حیزبمان" گوێی بنیادەم لە هات و هاواردا کەڕ دەبوو. تا من کەوتمە خۆ، بە دەڵەك دان خستمیانە نێوە راستی حەشاماتەکەوە. هەرچی هەوڵ و تەقەللام دا بێ سوود بوو. سەیرم کرد چ چارێك نییە، خۆم دایەدەم حەشاماتەکەوە، وەکو پوشەکەی دەم شەپۆلی دەریا بەم لاو بەو لادا دەی رەتاندم. قیروسیا چی دەبێ با ببێ. چی دەکەن با بیکەن. لە دوێنییەوە هیچم نەخوارد بوو. لە برسانا قوڕەی سکم دەهات، لە شەکەتیدا لاقەکانم دەلەرزین!

هێندە بێ حەواس بووم کە پێم لە عەردی دەبرا، دەکەوتمە سەرشانی خەڵکەکە. پیچەکی ما بوو لە هیلاکی و لە برسانا ببورێمەوە. لە زەلامێکی تەك خۆمەوە پرسی: برادەر ئەم رێیە لە کوێ دا کوتایی دێت؟

لە کابرا وایە من باسی مەسەلەی رامیاری دەکەم. گوتی:

– مەبەستت ئەوەیە کە ئامانجمان لە مەیدانی رامیاری وولاتدا چییە؟

گوتم: تۆبە.. خوا نەکات.. مەبەستم ئەمەیە کە خەریکە لە هیلاکی دا پەکم بکەوێ...

کابرا لەوە دەچوو دەمێ بێ قسانی نەکردبێ و خوا خوای کەسێکی بوو کە گوێی لێ بگرێ. بێ ئەوەی گوێ بە قسەکەی من بدات گوتی:

– سوپاس بۆ خوا بارودۆخی وولاتەکەمان زۆرچاکە.. رێیەکی راست و دروستی گرتۆتە بەر. هەموو دەزانن وولاتی ئێمە بە خێرایی بەرەو پێش دەچێت. هەوەڵ

خوا و ئەوجا بە هیمەتی رێبەرانی چاك، وولاتمان بەرەو بەرزی و پێشەکەوتن دەڕوات...

بەتوڕەییەوە قسەکەیم بڕی و گوتم: "بابە کێ ئەم شتانە نازانێت؟! منداڵی ساواش دەزانن وولاتمان بە خێرایی بەرەو پێش دەچێ. مەبەستم ئەمەیە کە ئەم شەقامە لە کوێ دوایی دێ و ئێمە بۆ کوێ دەڕۆین؟!

کابرا نیگایەکی گوماناوی تێ بڕیم و گوتی: چما نازانیت؟ دەچینە پێشوازی پێشەوای حیزب. بۆ ویستگای رێگای ئاسن دەچین.. بە پەلە گوتم: جا ماقوڵە ئەمە نەزانم؟..

– ئەی بۆ دەپرسیت؟

– لە راستیدا شارەزانیم.. یەکەمجارە بەشداری دەکەم.. زۆر قەرەباڵغە.

کابرا گوتی: جا جارێ چیت دیوە! دە هێندەی دی لەوێن، لە وێستگای رێگای ئاسن.

کوێخای گوند، هەر کەسە و ٢٠ لیرەی داوەتێ، خۆ ئەگەر پتری دابا قەرەباڵغییەکە گەلێك پتر دەبوو. وورد ودرشتی دێهاتییەکان دەهاتن.

بەدەم قسەوە گەییشتینە رێگای ئاسن. چاوشەکان دەهۆڵ و زوڕنایان لێدەدا. کۆمەڵێك لە ناوەندی مەیدانەکە دا هەڵدەپەڕین. بە جۆرێ هاتبوومە سەر کەیف و زەوق ئەگەر برسیم نەبوایە بێ سێ و دوو خۆم پێدا دەکرد. زۆرم حەز دەکرد نێوی ئەو زەلامە بزانم کە چوو بووین بۆ پێشوازی... بەلام دەترسام بپرسم... دەترسام بە جاسوسم لە قەڵەم بدەن و بمگرن. بە تایبەتی کە بەڵگەنامە و ناسنامەم نەبوو. لەم کاتەدا یەکێك چووە سەر سەکۆی وێستگاکە ودەستی بە قسان کرد:

– برادەران.. ئاگاتان لێ بێ، ئەوڕۆ جەژنێکی گەورەی ئێمەیە، پێشەوای حیزب دێت بۆ سەردانی لقی شارەکەمان. ئێمەش دەبێ کارێکی وا بکەین کە ئابڕوی حیزب و وولاتەکەمان بپارێزن. پێویستە هەر کەسێك ئەرکی خۆی بە جوانی و بێ هیچ عەیبێ ئەنجام بدات. ئەوانەی کە ماموری زەبت و رەبتن ئەرکیان گرنگ

ترە. جا بۆ ئەوەی ماموران ئەرکی خۆیان چاکتر بزانن. فەرموو با بێنە هۆڵەکەوە تا کاکی سەرپەرشتیار کارەکانیان دیاری بکات.
کابرا زۆری قسان کرد، من تا کو ئێستا قسەی وا چاکم نەژنەوتبوو کە قسەکانی تەواو بوو، کۆمەڵێك هریان کردە هۆڵەکەوە. منیش بێ ئەوەی بە هیچ بزانم دوایان کەوتم. دوو کەس کە لە تەك منەوە دەڕۆیشتن قسەیان بۆ یەکدی دەکرد، یەکەمیان گوتی: پێویستە پارەکەمان لە هەوەڵەوە وەربگرین.. چەند رۆژێ لەمەوپێش کە بۆ پێشوازی رابەرێکی تری حیزب هاتبووین پارەکەیان خواردین و...
دووەمیان گوتی: ناکا ئەمجارەش کڵاومان بکەنە سەر...؟
یەکەمیان گوتی: نە بابە کوێخا سویندی بە سەری ژنەکەی خواردووە کە پارەی هیچ کەسێك نەخوات، بەڵام وریایی چاکترە!
چووینە نێو هۆڵی وێستگای رێگای ئاسنەوە.. سەیرم کرد ٤٠،٣٠ سەر بەران وگاو وشتر ئامادە کراون کە لە بەر پێی پێشەوای حیزبا سەر ببڕێن. سەر پەشتیاری ماموران چووە سەر مێزێك و دەستی بە قسات کرد:
– برادەران بێدەنگ بن. دەیقەیەك گوێ بۆ قسەکانی من بگرن، بەرنامەی پێشوازی ئەوڕۆمان لەگەڵ پیشوازییەکانی جاراندا جیاوازە.. پێویستە هەموو کارەکان پوختەبن.. هەر کەسێك کاری خۆی ئەنجام نەدات بەر پرسیار دەبێ...
یەکێك لە نێو قەرەباڵغییەکەوە هاراوی کرد: باشە گۆشتی قوربانی دەدەنە ئێمە یان نا؟
– بێگومان دەتان دەینێ.. گوشتێ ئەم قوربانیانە هی ئێوەیە.
کابرا گوتی: بەڵام هەفتەی پێشوو دەست خەڕۆتان کردین و تاقە پشکێ گوشتتان نەداینێ.
– راستی یەکەی ئەو قوربانیانە نەخۆش بوون، شارەوانی نەیهێشت گۆشتەکە دابەش بکەین.
یەکێکی دی هاواری کرد: کەی پارەکانمان دەدەنێ؟

سەر پەرشتیاری مامورەکان وەلامی دایەوە: هەر کە ئاهەنگەکە تەواو بوو، دەتان دەینێ..

– قەبوڵی ناکەین.. دەبێ لە هەوەڵەوە پارەکەمان بدەنێ.

سەر پەرشتیارەکە گوتی: ئێمە تا ئێستا چەند جارێکمان تاقی کردوەتەوە، ئەگەر لە پێشەوە پارەکە بدەین کەس تا کۆتایی ئاهەنگەکە نامێنێتەوە.

یەکێك لە نێو قەرەباڵغییەکەوە گوتی: کە ئاهەنگەکەش تەواو بوو، ئێوە فێڵمان لێدەکەن، بۆیە لە پێشەوە پارەکەمان دەوێ. خۆ ئەگەر قەبوڵیشت نییە ئەوا دەگەرێینەوە.

کۆمەڵێك دەستیان بە هوراکێشان کرد، کۆمەڵێکی دی دەستیان بە چەپڵە لێدان کرد. ئاخری بریاردرا کە نیوەی پارەکە پێشەکی بدرێ و نیوەکەی تری بۆ دوای ئاهەنگەکە بمێنێ.

سەر پەرشتیارەکە پارەی بە چەند کەسێك داو، بەوانی دی گوت:

– دوای بەرنامەکە دەتان دەمێ...

ئەوجا لە سەر رونکردنەوەی بەرنامەکە رۆیی وگوتی: برادەران، ژیان هەر پارە نییە، تۆزێ بیر لە نیشتمان بکەنەوە، لەبەر خاتری ئەو شەهیدانەی کە لە رێگای نیشتماندا گیانیان بەخت کرد. کەمێ تێبکۆشن. خەمی پارەکەتان نەبێ و وابزانن لە گیرفانتانایە. لە رێگای پاراستنی ئابرِوی حیزبدا خەبات بکەن. دوای چەند دەیقەیەکی دی ئوتومبیلەکە دێتە ژوورەوە. دەبێ ئەرکی خۆمان بە چاکی ئەنجام بدەین. ئێوەی لاوان کە هەوێنی حیزبن دەبن بە دوو بەشەوە. کۆمەڵێکتان پێویستە ئوتومبیلەکەی پێشەوای حیزب بخەنە سەر دەست و کۆمەڵەکەی دی دەبێ یاوەرانی پێشەوای حیزب بخەنە سەر شان. حاڵی بوون؟ کاك داودخان هەر یەکێکتان دەنێرێتە لایەك، نەکەن جێگاکانتان بگۆرِن، پێویستە هەمووتان پەیرِەوی دستورەکانی داودخان بکەن و بە موو لێی لا نادەن...

ئەوجا رووی کردە داودخان وگوتی: هاورِێ زۆر وریا بە... لاواز ورەقەڵەکان بنێرە با بچنە ریزەوە وهورا بکێشن وچەپڵە لێ بدەن. ئابرِومان نەبەیت ها...

لە دڵی خۆما گوتم: "بۆ ئەوەی خۆم بنوێنم و پارەی چاك وەربگرم پێویستە بڕۆمە نێو ئەوانەی کە ئوتومبیلەکەی پێشەوا دەخەنە سەر دەست و بەرزی دەکەنەوە... بێ سێ ودوو چوومە نێو ئەوانەوە. لە وێشدا کۆمەڵێك خەریکی باس کردنی پارە بوون ودەیانگوت: دەبێ یەکی پەنجا لیرەمان بدەنێ.
داودخان کە سەرقاڵی دابەشکردنی خەڵکەکە بوو، کە چاوی بە من کەوت قۆڵی گرتم وبۆ دەرەوە: بڕۆ بە کاری خۆتەوە فیسقە گولە. تۆ لە کوێ دەتوانی ترومبێل هەڵگری؟
گوتم چۆن ناتوانم. سەیر مەکە لەڕ ولاوازم. هەوەڵ خوا وئەوجا غیرەتی خۆم. ئوتومبیل هەر هیچ نییە، عەنتەرناشیش هەڵدەگرم... هەر کارێ قورسە بە منی بسپێرن.. وەلێ داودخان گوێی بە قسەکەم نەدا و ئیشارەتی کردمێ کە بچمە ریزی هوراکێشەکانەوە. کە داودخان رۆیی، خۆم کردە نێو ئەو کۆمەڵەوە کە بریار بوو یاوەرانی پێشەوای حیزب بخەنە سەر شان. خۆ ئەگەر ئوتومبیلم پێ هەڵنەگیرێ، خۆیان دەتوانم..
یەکێکی دی هات کە ئەرکی ئێمە روون بکاتەوە، گوتی: برادەران باش گوێ بگرن، بزانن چی دەڵێم. کۆمەڵێك ژن و پیاوی بەرێز لەگەڵ پێشەوای حیزیدا بۆ شارەکەمان تەشریف دەهێنن، ئێوە دەبێ ئەوانە بخەنە سەر شانتان، ئاگاتان لێ بێ کە ژنەکان نەخەنە سەر شانتان. ماوەیەك لەمە پێش کە پێشەوای حیزبی خەنیم هاتبوو یەکێك لەم گەوجانە لە دواوە سەری خستبووە نێو لنگی ژنێك و خستبوویە سەر شانی. ژنی بێچارە هێندە ترسا بوو کە لە هۆش خۆی چوو. بەڵام یارۆ دەست بەردار نەبوو بوو، وەکو ورچێ کە بنیادەمی راوکردبێ ژنەی هێنا بوو، وبردبووی و بە عەردی دا دابوو.
هەندێ لە پیاوەکانیش رازی نین کە بچنە سەر شانی هیچ کەسێك. هەقتان بەسەر ئەوانەشەوە نەبێ. کەس بە تۆبزی نەخەنە سەرشانتان وا نەزانن گونییە گەنمە ویەکسەر لە زەوی بەرزی بکەن و بکەونە رێ. زۆر بە ئەدەبەوە مۆڵەتی لێ وەربگرن، ئەوجا شانی بۆ نەوی بکەون کە سەرکەوت ئەوجا بکەونە رێ.. کورتە

باڵاکانتان مرۆڤی باڵا بەرز هەڵنەگرن. چونکە ئەمە دەبێتە مایەی پێکەنین وگاڵتەوئابڕومان دەچێت.. حاڵی بوون؟

هەموو بە یەك دەنگ وەڵامیان دایەوە: بەڵێ قوربان.

کە هەموو بێدەنگ بوون، سەر پەرشتیار مەبەستێکی تازەی بیر کەوتبووەوە، دووبارە دەستی بە قسان کردەوە: بابەتێکی دی هەیە کە زۆر گرنگە و پێویستە وریای بن، لەوانەیە هەندێکیان قۆڕ بن، ئاگاتان لەوانە بێ کە سەرتان بەر جێی ناسکیان نەکەوێ... ئیدی چ قسەیەکم نییە، بچنە دەرەوەی وێستگاکە و لە جێی خۆتان بوەستن.

چووینە دەرەوە، لە ژێر ئاڵا هەڵکراوەکاندا وێستاین، زۆری نەبرد دەنگی هۆڕنی ئوتومبیل بەرز بووەوە. دەهۆڵ و زوڕنا کەوتە گەڕ. ئوتومبیلەکە داخڵی وێستگاکە بوو، وێستا. گەورەکانی حیزب دابەزین. مەڕو گا بە عەردیا دران.

سەر دەستەکەی ئێمە دەستوری دا: بۆ پێشەوە بەرەو گەورەکان... برادەران بۆ هەڵگرتنی یاوەرانی پێشەوای حیزب هەڵمەتیان برد، من کە گیان داهێزراو، برسی وماندوو بووم، کەوتمە دواوە... کە گەییمە جێ سەیرم کرد کەس نەما بوو، لە دڵی خۆمدا گوتم: خوایە، چار چییە؟

تەماشای دەورو بەری خۆم کرد، پیاوێکی زەلامم بینی، زۆر پۆشتە و پەرداخ بوو، بۆینباخی بەستبوو، لەبەرخوارنگاکەدا وێستا بوو دەستی خستبووە کەمەری. ئیدی زانیم یەکێکە لە گەورەکانی حیزب، بەرەو پیری چووم. قەد وبالای سێ هێندەی من وگەردنی چوار هێندەی گەردنی من بوو. دە سەیری کەرێتی من بکەن، بیرم نەکردەوە کە ئەم کابرایەیان بۆ نەبردووە. بە ئەسپایی چووم و لە پشتییەوە وێستام.. بە سڵ کردنەوە دانەویمەوە. ناوی خوام هێنا و خۆم خستە ناو گەڵییەوە، هەڵمدایە سەر شانم.. هەر لە خواوە بوو کە ئەو هەموو هێزەم کەوتبووە بەر. ئەگینا هەر لە زەویش بۆم بەرز نەدەکرایەوە.. بەو هیوایەی کە بکەومە بەر چاوی پێشەوای حیزب و پارەی باشم بدەنێ و ناسنامەیەك دەربێنم، دوو ئەوەندەش با هەر هەڵم دەگرت!

دوو– سێ کەس هاتن بە لامەوە، دەیانویست لێمی وەربگرن. گوتم: لاکەون... سەخڵەتم مەکەن.
پێشینیان راستیان گوتووە ئێسقان لە سەگ نا سە نرێ. ئەگەر لە بری ئەم سێ کەسە یەك فەوج سەربازیش هاتبان نەیان دەتوانی ئەو کابرایەم لێ بسەنن.
بەدبەختی من لەوەدا بوو کە زەلامەکەی سەرشانم وەکو بنیادەم بە رەحەتی دانانیشت. ئیدی هەر لەقە فرتێی بوو، دەیویست بێتە خوارەوە. هاواری دەکرد: "کوڕە.. وازم لێ بێنە.. دامگرە.. بۆ ئەم کارەدەکەی؟!
بەڵام من گوێم لێ نەبوو، بریارم دابوو تا ناوەندی مەیدانەکەی بەرم و لە پاڵ پەیکەرەکەی ئەتاتورکدا کە تەواوی پێشەوا وگەورەکانی حیزب لە وێندەرێ وەستا بوون، دای بنەم... بۆیە گوتم: قوربان بە خۆڕایی خۆت هیلاك مەکە.. تا نەت گەیەنمە پاڵ پەیکەرەکە مەحاڵە دات بگرم... یارۆ بە توڕەییەوە گوتی: کاکە من حیزبی نیم. من گارسۆنی خوارنگای وێستگاکەم.. وامزانی ئەمە بە فێڵ دەڵێ و دەیەوێ تاقیم بکاتەوە...
گوتم: ئەستەغفروڵڵا.. ئەمە چ قسەیەکە.. ئەوەندەش نەزان نیم کە دۆستی خۆمان نەناسم. ئێمەش بەشی خۆمان دنیامان دیتوە... گارسون چ حەددی هەیە وەکو تۆ پۆشتە و پەرداخ بێ...
بەڵام دیسان هاواری کردەوە: وەڵڵا.. بە خوا.. من گارسۆنی خوارنگام... وازم لێ بێنە وئابڕوم مەبە...
کە بینی هەڕەشە و گورەشە دادی نادات کەوتە پاڕانەوە:
– برادەر من کارم هەیە.. تو سەری خۆت وازم لێ بێنە.. میوانمان هەیە.. ئەگەر من نەبم کارەکان خراپ دەبێ. بەڕێوەبەری خوارنگاکە قاوم دەدات.. بیکە بە خاتری خوا.
دیسان گوێم نەدایێ و خیراتر بەرەو مەیدانەکە کوتام.. ئەمجا کابرا دەستی بە جنێودان کرد:

– گەماڵ بابی ئەحمەق.. وازم لێ بێنە، دام بگرە هەی ناپیاو... وردە وردە جنێوەکانی خەست تر دەکرد. غیرەتم جوڵاو گوتم:

– بزانە کاکە، تۆ ناتوانیت هەڵم بخەڵەتێنی.. من بەڵێنم بە حیزب داوە و ئامادە نیم دەست بەردارت بم.

یارۆ کە بینی بە هیچ جۆرێ ناتوانێ لە دەستم قوتار بێ وەکو پیاو لە سەرشانم دانیشت. ورگی هێندە زل بوو لەم لاو لەو لای سەرمەوە شۆڕ بوو بووەوە. وردە وردە هیلاك تر دەبووم. لە برساناو لە هیلاکی دا لاقەکانم دەلەرزین. سەیرێکی ئەم لاو ئەولای خۆم کرد تا موسوڵمانێ بدۆزمەوە بزانم چەند دەیقەیەك یارۆم لێ وەرگرێ تا پشوویەك بدەم... بەڵام تەواوی برادەران رۆیی بوون. بە هەزار حاڵ رێم دەکرد، بە ئاشکرا هەناسە بڕکێم پێ کەوتبوو، هانکە هانك دەڕۆییشتم.

ئاخری گەییمە مەیدانەکە، دوو–سێ هەنگاوم مابوو بۆ پەیکەرەکەی ئەتا تورك. نازانم پێیان دایە بەر پێم یا پێم هەڵنووتا، یان هێزم تیا نەما، کەوتم. یارۆی کۆڵم لە بەرانبەر پەیکەرەکەی ئەتاتورکدا بە دەما کەوت...

زیندە بێدەنگ بوو. یەکێك لە بەندییەکان پرسی:

– ئەی پارەکە، وەرت گرت یان نا؟

– نە بابە، پارەی چی؟ تۆزێکیش قەرزار بووین. بەر پرسیارانی حیزبی شار گارسونەکەیان دەناسی، لەم کارەی من زۆر توڕە بوون، بە خەیاڵی ئەوەی کە من پیاو خراپم و ویستوومە گاڵتەیان پێ بکەم، یەخەیان بەر نادام. دوای هەزار سوێند وکەلام، دوای یەك سەعات پاڕانەوەو عوزرخوایی. ئەمجاش بە چەند شەق و زللەیەك وازیان لێ هێنام. ماندوو ومردوو کەوتمە ڕێ.. لە برسانا سکم قوڕەی دەهات.. ویستم تۆزێ نانی وشك پەیدا بکەم وبیخۆم.. کە گەیشتمە بەر نانەواخانەیەك ویستام، دەستم بە گیرفانم دا کرد، دڵم داخورپا، جزدانی پارەکەشیان دزی بووم. ئەو پارەی کە بەو هەزار حاڵەی لە دۆستەکەی بابم قەرزم کرد بوو. ئامەردێك بۆ خۆی دزی بووی.. دوایی زانیم کە ئەو رۆژە گیرفانی گەلێ کەسێ بڕی بوو.. بەهەڵەداوان بەرەو پۆلیسخانە کوتام. سکاڵام کرد کە پارەکەم

بـۆ بدۆزنـەوە. مـاموری پـۆلیس بـەر لـە هـەموو شـتێ نـاوی پرسـیم و داوای ناسنامەی لێکردم، ئەوجا پرسی: تۆ کێی؟ لە کوێوە هاتووی؟ بۆ کوێ دەڕۆیت؟
بەندییەکان گوتیان: جا وەرە کەر لەو قوڕەی دەرێنە...
چەند دەیقەیەك لە نیوە شەو تێ پەڕی بوو. بەندییەکان لە شەکەتیدا چاویان هەڵنەدەهات... هەر کە زیندە لە حەکایەت کردن بووەوەو پاشماوەکەی بۆ سبەی شەو دانا، هەموو چوونە ژێر جێگاکانیانەوە و هێندەی پێ نەچوو پرخ و هوریان بەرز بووەوە.

## (٨) ماموره بستەبالاکە یان هاوار دەکات یان شاور لێدەدا.

" هی.. ی.. ی.. بچنە ژوورەوە.. ف.. ی.. ر.. ر.. ر.. ر.. ! خێرا بچنە ژوورەوە.. ف.. ی.. ر.. ر.. ر..!
چونکە رۆژی دیدەنی بـوو، بەندییـەکان نـەیان دەویـست هـەروا بـە ئاسـانی مل بدەنە خەت. ماموره بستە بالاکەش پەیتا پەیتا شاوری لێدەدا.
لە رۆژانی وادا ئەو کەسانەی کە دۆست و ناسیاو نەیەن بۆ لایان غەمیان زۆر زۆر دەبێ.. زینـدە وەعزی لـە گشتیان خـراپ تـر بـوو.کەسـی نـەبوو کە بـۆ دیـدەنی بێت... کەس هەر نایزانی لە کوێیە. لە پەنای دیوارەکەدا دادەنیشت وشیعری بە قەد و بالای ئەقدەس دا هەڵدەگوت و هێدی هێدی ئەشکی هەڵدەڕشت.
کە ردێن سپی قاوشەکە بە باوەشـی پـڕ لـە میـوە وجگـەرەوە گەڕایەوە و بینـی زیندە دەگری، بە سوعبەتەوە نووکە پێیەکی تێوە ژەند وگوتی:
– هەستە قەشمـەر.. پیاو ناگری.. خێـرا هەستە فرمێسکەکانت بسرە با کەس نەت بینێ ئەگینا دەبیت بە گاڵتەجاڕ، خێراکە تا کەس نەهاتووەتە ژوورەوە..
زینـدە بـە قـوڵی چاکەتەکەی چاوی سـڕی و بـە تـوڕەیی، زەردەخەنەیـەکی کـرد. بەندییـەکان هاتنـە ژوورەوە، کیـسە و پرپاسـکەکانیان لـە ناوەنـدی ژوورەکـەدا

هەڵڕشت.. بە دەم پاقلاوە و میوە خواردنەوە سەر گەرمی ئامادە کردنی شیوبوون..

دوای شیوخواردن، بەندییەکان کە ئەو شەو، لە شەوانی رابوردوو خۆشحاڵتر بوون لە دەوری زیندە خڕ بوونەوە، داوایان لێکرد پاشماوەی حەکایەتەکەیان بۆ بگێڕێتەوە. زیندە وەکو ئەو بۆکس وەشێنانەی کە بەر لە دەست پێکردنی تەراتێن ماوەیەك خۆ گەرم دەکەنەوە و لەسەر ئەژنۆیان دادەنیشن، ماوەیەك قسەی جۆراو جۆری بۆ کردن.. یەك دوو نوکتەی خۆشی بۆ گێڕانەوە. کە برادەران تەواو تامەزرۆی ژنەوتنی پاشماوەی حەکایەتەکە بوون، دەستی بە گێڕانەوەی بە سەرهاتەکە کرد:

- بەڵێ برادەران، خۆ پیشوازییەکەی پێشەوای حیزبتان لە بیر ماوە؟ پارەیان نەدامێ، گیرفان بڕەکانیش جزدانەکەیان لێ دزیم. منی گێل و گەوج چوومە پۆلیسخانە و بە ناخێرم شکایەتم کرد. پۆلیس لە بری ئەوەی شکایەتم بپرسن و دزەکە بدۆزنەوە، یەخەی منی کلۆڵیان گرت کە کێم... لە کوێوە هاتووم و کوا ناسنامەکەت.. ئیدی بە هەزار حاڵ تا لە شکایەتەکەم ژێوان بوومەوەو لە چنگی پۆلیس رزگار بووم.یەکراست چوومەوە کن دۆستەکەی بابم. حاڵ و بەسەرهاتەکەم بۆ گێڕایەوە.. دۆستەکەی بابم دڵی دامەوە وگوتی: خۆت نیگەران مەکە، بابت مردووە، خۆ من ماوم. ئەوقاتێکت بۆ دەگرم و بە هەر نرخێ بووە بەشە میراتییەکەت بۆ وەردەگرم.

لەگەڵ دۆستەکەی بابم دا چووینە کن ئەوقاتێك و مەسەلەکەمان بە دوور ودرێژی بۆ گێڕایەوە. دوای ئەوەی گوێی لە قسەکانمان بوو گوتی:- هەق بە ئێوەیە و لە زەرفی یەك دانە مانگدا رای دادگات دەدەمە دەست.

هەندێ پارەی کاشی لە دۆستەکەی بابم وەرگرت و فایلی بۆ کردمەوە. هێشتا رۆژی دادگا دیار نەبوو، چ جای رای دادگا... هەر کاتێ دەچوومە نووسینگەکەی دەیگوت: مانگێکی دی وەرەوە.

شەش مانگ تێ پەری تا یەکەم جەلسەی من چێ بوو.. رۆژی دادگا ئەقدەس و بابیشی هاتبوون. کە لە دادگا دا چاوم بە ئەقدەس کەوت گوڕێکم هاتەوە بەر. ئەقدەس هات لە تەکمەوە دانیشت و بە ئەسپایی گوتی: ئازیزەکەم، بە تەمای ئەو خوایە ئەوڕۆ کارەکەت تەواو دەبێ. میراتییەکەت وەردەگریت.

دەمێ بوو، دەستم لە وەرگرتنی میراتییەکە شۆرد بوو. هەموو ئومێدیکم ئەمە بوو کە ناسنامەیەکم بدەنێ و بتوانم ئەقدەس بگوازمەوە... پارە هەر پەیا دەبێ. ناسنامە خەمی گەورەیە. جەلسەی دادگا دەستی پێکرد.. ئەوقاتەکەم دەستی بە قسان کرد.. پەیتا پەیتا مادە و یاسای دەهێنایەوە. کارەکە بە قازانجی من دەڕۆیی، زۆری نەما بوو دادگا بریار بدات کە من زیندووم و کوڕی بابی خۆمم و دەبێ بەشە میراتەکەم وەربگرم. کابرایەك لە جێی خۆی راست بووەوە، خۆی ناساند کە ئەوقاتی دەوڵەتە، دەستی بە بەر پەرچدانەوەی قسەکانی ئەوقاتەکەی من کرد، دەك خوایە کوێری بکەی.. ئەم قسانە چییە؟ چۆن دەبێ مرۆۋ هێندە حەسوود بێ... بۆ بە خۆڕایی ئەمە دەکەیت، ئاخر چیت پێ دەبڕێ؟ کابرا پێی داگرت و دەیویست قسەکانی خۆی بسەلمێنێ، گوتی: ئەم زەوی و سامانەی رەشیدی رەحمەتی بەشێکە لە خەزینەی دەوڵەت وماڵی موسوڵمانانە و رەحمەتی کوڕی وای نییە، بۆیە دەبێ داوای شکایەتکەر رەفز بکرێ.

دیسان بەندییەکان گوتیان: جا وەرە کەر لە قوڕ دەربێنە.. کە قسەکانی ئەوقاتی دەوڵەتی گێڕایەوە، کۆمەڵێك لە بەندییەکان لە داخانا پاڵ کەوتن! زیندە نەفەسی تازە کردەوەو لە سەری ڕۆیی:

– قسەکانی جەنابی ئەوقاتی دەوڵەت ئومێد بڕیان کردم.. چش لەوەی کە بەشە میراتیان نە دەدامێ، لەوە دەترسام بە تۆمەتی ساختەچێتییەوە فایلم بۆ بکەنەوە.. لە شکایەتەکەم زۆر ژیوان بووم، بەڵام ئیدی کارێ بوو و تێ پەڕی. لە ژێرەوە سەیرێکی ئەقدەسم کرد.. ئەقدەس یش دەیویست سەیری من بکات. هەرچەندە چاوەگەش و جوانەکانی تەژی ڕووندك بوون. بەڵام کە چاومان بە یەکدی کەوت بزەیەکی کرد.. بە ساقەی پێکەنینەکەی بم... هەموو میراتەکە بە

قوربانی زەردەخەنەیەکی ئەو بێ.. من زەوی و پارە ومیراتم بۆ ئەو بوو، بۆ ئەوە بوو کە بتوانم حاڵ و ژیان و ئاسودەیی بۆ ئەو دابین بکەم. من وئەقدەس بە نیگا وئیشارەت رازو نیازمان دەکرد، لە پڕ دەنگی سەرۆك دادگام ژنەوت. سەرۆك بە ئەوقاتەکەی منی گوت:

– ئەگەر بەرگرییەکت هەیە بیکە...

ئەوقاتی من لە بەرانبەر ئەوقاتی دەوڵەتدا چی پێ دەکرێ! بە تەمەڵی و شەکەتییەوە هەستایە سەر پێ. کۆکەیەکی بۆ کردو گوتی:

– قوربان دەربارەی بوونی موەکیلەکەی من، بوونی خۆی چاکترین بەڵگەی زیندووبوونیەتی.. وەکو خۆتان دەبینن نەك هەر شەهید نەبووە، بەڵکو زرب و زیندووە و ئەوەتا لە دادگا دا دانیشتووە. دەفتەر وتۆماری دەوڵەت گەلێ چەشنە هەڵەی تێ دەکەوێ، بە تایبەتی بەم زەلامە زیندووەیان گوتووە کە دوو جاران شەهید بووە!.. ئەوقاتەکەم کە گەییە ئێرە، هێندە بە دڵ و بە گیان قسانی دەکرد، پیاو حەزی دەکرد دەموليێوی راموسێ. قسە لەوەی چاکتر نابێ، بەڵگەکانی ئەویش بەجێ و پەسەند بوو، لەگەڵ سەلماندنی ئەوەدا کە من زیندووم و کوڕی بابمم، دادگا بڕیاری بە قانجی من دەدا... بەڵام ئاخۆ ئەوقاتی دەوڵەت رازی دەبێ؟! هێشتا ئەوقاتەکەی من قسەکانی تەواو نەبوو بوو، ئەو راپەڕی و گوتی:

– بوونی کەسێك لە دادگادا ئەوە ساغ ناکاتەوە کە مردوویەك زیندوو بووەتەوە. کاری ئەوقاتی بەڕێز وشکایەتکاری ئەم فایلە تاوان و کڵاوە. ئەمانە بۆ ماشینەوەی ماڵی خەڵکی، کەسێکی تریان لە بری کوڕی رەشیدی رەحمەتی هێناوە بۆ دادگا، ئەوقاتەکەی من هەڵیدایە و گوتی:

– وەکیلەکەی من کە جەنابتان بە مردووی لە قەڵەم دەدەن، تاقە میراتگری رەشیدی رەحمەتییە. گشت قەرز و قۆڵەکانی بابی رەحمەتیی داوەتەوە. چۆن دەتوانین ئەم پیاوە بە مردوو حسێب بکەین؟ تا ئێستا لە کوێ بینراوە غەریبەیەك بێت و قەرز وقۆڵەی کەسێکی نەناسراو بداتەوە؟لە دڵی خۆمدا گوتم:

هەر بژی ئەوقاتەكەی خۆم. ئەگەر لە دادگادا نەبوایە نێو دەویم ماچ دەكرد. مەرج بێ ئەگەر میراتییەكەم بدەنێ ئەم پیاوەتییەی بدەمەوە، نا پیاو بم ئەگەر نەیدەمەوە.

بە ڕواڵەت دیار بوو كە ئێمە براوە دەبین. تەنیا ئەوەندە بەس بوو كە ئەوقاتی دەوڵەت ڕازی ببێ و چ قسەیەكی دی نەكات. بەڵام ئەو نەحلە تییە دەست بەردار نەبوو. دەیویست بە تۆبزی بیسەلمێنێ كە مردووم. هەر دوو ئەوقاتەكە كەوتبوونە گیانی یەكدی. ئەم دەیگوت: دەبێ. ئەو دەیگوت: نابێ. مشت و مڕ درێژەی كێشا، ئەوقاتەكەی من دەیكێشا بە بەسەر مێزەكەدا: من دەیسەلمێنم. ئەوقاتی دەوڵەت هاواری دەكرد: ناتوانی بیسەلمێنی.

ماڵی سەرۆك دادگا ئاوا بێ كە بەری مشت و مڕەكەی گرت، ئەگینا لەوانە بوو كار بگاتە كوتەك و كوتەك كاری و لەبەر خاتری میراتەكەی من خوێن بڕژێ.

سەرۆك دادگا دەستوری دا. ئەوقاتەكان لە جێی خۆیان دانیشتن. گوتی: بەرای من فایلەكە نوقسانە... گەواهی دایەرەی ئامار دەربارەی مەرگی شكایەتكار... گەواهی دایەرەی سەربازی دەربارەی ئەنجامدانی خزمەتی سەربازیی شكایەتكار...دەبێ بدرێتە دادگای تەمییز بۆیە دادگا بۆ دوو مانگی دی تازە دەكەمەوە...

جەلسەی دادگا داخرا، كە قازییەكان لە ساڵۆنەكە چوونە دەرێ. ئەوقاتەكەی من چوو بۆلای ئەوقاتی دەوڵەت... هەر دوو ئەوقاتەكە تا چەند چركەیەك لەمەو بەر شیرو تیریان لە یەكدی دەسوو لە پڕ دەستیان لە ملی یەكدی كرد و دەتگوت دوو بران و چەندین ساڵە یەكیان نەدیووە. دەستیان بە ماچ و موچ كرد.

كە ئەمەم بینی، هەناسەیەكی قوڵم هەڵكێشاو زانیم گشت ئەم مشت و مڕو یارییە بۆ كێشانەوەی پارەكەی منی بێچارە بوو، چ بەرگری و لایەن گرتنێكی من لە گۆڕێدا نەبووە...

كە لە دادگا هاتینە دەرەوە، دۆستەكەی بابم بە خەمبارییەوە گوتی: ڕۆڵە بە خۆڕایی كاتی خۆت بە فیڕۆ مەدە. ئەم دادگایەش هیچت بۆ ناكات. بە قسەی من

دەکەی تا زووتره برۆ بۆ ئەستەمولّ. ئەگەر خۆت بگەیەنیته کاك "بەرجەسته" ئیشەکەت بۆ رادەپەڕێنی.

پرسیم: کاك بەرجەسته کێیه؟

– رۆڵه گیان کاك بەرجەسته کوڕی حەقی پینه دۆزی خۆمانه.باوکی رەحمەتیت زۆری به سەرەوه هەیه.. تۆ بیرت نایەت ئەم بەرجەستەیەی که ئەوڕۆ له ئەستەمولّدا هەموو شتێکی به دەسته له ماڵی بابی تۆدا گەوره بووه. ئەگەر بتوانی خۆت بگەیەنیته ئەو بێگومان دەستت دەگرێ و هەر چییەکت بۆی بۆتی دەکات.بابی ئەقدەس یش قسەی دۆستەکەی بابمی بەگەن کرد. خۆشم شێوەی کوڕەکەی حەقی پینه دۆزم بیر کەوتەوه. کوڕێکی بزێوی بەد رەوشت بوو، هەموو خەڵکی ئاوایی دادو بێدادیان بوو له دەستی.

خۆم به لامەوه گرنگ نەبوو بڕۆم بۆ ئەستەمولّ. تەنیا رای ئەقدەسم بەلاوه گرنگ و مەبەست بوو... بۆیه دووسێ رۆژ به بیانووی بیر کردنەوەوه مۆڵەتم وەرگرت تاکو ئەقدەس ببینم و پرسێکی پێ بکەم.

سبەینێ، دوای نیوەڕۆ بەڵێنم به ئەقدەس دا که بێ بۆ نێو باخەکەی باوکی... منیش به هەزار ترس و له رزەوه، به سڵ کردنەوەیەکی زۆرەوه لەم کۆڵان و لەو کۆڵانەوه خۆم گەیانده باخەکه.

هەر که یەکترمان بینی، هەر دوو وەك هەوری بەهار دەستمان به گریان کرد، که کوڵی دڵمان نیشتەوه، دەستی ئەقدەسم گرت و گوتم:

– ئەقدەس بەڵێنم دەدەیێ که چاوەڕوانم بکەیت؟

بەدەم هەنسك هەڵدانەوه سەری خسته سەر سینگم و گوتی:– سوێندت بۆ دەخۆم... که پرچی سپیت بۆ بهۆنمەوه. برۆ و خەیاڵت ئاسوده بێ. کاری خۆت ئەنجام بدەو زوو بگەڕێوه... هەمیشه چاوم له ڕێی گەرانەوەته...

زۆرم هەوڵدا که بەلای کەمەوه دووسێ ماچم بداتێ، بەڵام بێ وێژدانه نەچووه ژێر بارو گوتی: عەشقەکەمان حەرام مەکه... بیهێڵه بۆ دوای ماره بڕین. تا تاریکی ئێواره ماینەوه. ئەوسا خودا حافیزیمان لێکدی کرد و به فرمێسك

ڕشتنەوە هەر کەسەمان ڕووی کردەوە ماڵی خۆی. هەر ئەو شەوە چووم بۆ ماڵی دۆستەکەی بابم و گوتم: ئامادەم سبەینێ بچم بۆ ئەستەموڵ.
تکام لێکرد کە ئەدەرسی کاك بەرجەستەم بداتێ.
گوتی: ئەدرەسەکەیم لە لا نییە، بەڵام دەزانم لە حیزب دایە، هەموو هەر دەیناسن.
پرسیم: بارەگای حیزب لە کوێیە؟
- نازانم... حیزب لە کوێیە.. ئەدرەسی چاخانەیەکت دەدەمێ کە جێی هاوشارییەکانی خۆمانە، بچۆ هاوشارییەکان وەدۆزە.. بێگومان ئەوان دەزانن...
ئەدرەسی چاخانەکەم وەرگرت، سبەی بەیانی لە نێو ئەشك و گریەی بەڕێ خەرانا بەرەو ئەستەموڵ بەڕێ کەوتم.

## ( ٩ ) ئەو کارتی ڕاسپاردنەی کە لە زێڕ بە نرختر بوو.

حەکایەت کردن بۆ زیندە چەند لایەنێکی چاکی هەبوو. یەکەم ڕێزوخۆشەویستی بەندییەکانی بەلای خۆیدا ڕادەکێشا وخەرجیان دابین دەکرد و وریاییان دەکرد... دووەم گێڕانەوەی حەکایەت غەم و پەژارەی دڵی سووك دەکرد. وەك ئەوە بوو باری سەرشانی لا بچێ و بەسەر دۆستەکانیا دابەش ببێ... تەنانەت ئەگەر کەسیش نەبوایە گوێی لێ بگرێ‌دەبوایە حەکایەت بۆ دیوارەکان... درەختەکان بکات.. ئەگینا لە داخا شەقی دەبرد...
بۆیە هەر کە دنیا تاریك دەبوو، و بەندییەکان دەهاتنە ژوورەوە، زیندە بە شەوق و زەقەوە خۆی بۆ حەکایەت کردن ئامادە دەکرد.
برادەران، پەندی پێشینانە کە تێر ئاگای لە برسی نییە.. تا کەسێ خۆی گرفتار نەبێ ناتوانێ بزانێ من چ بەد بەختی و ڕەنجێکم کێشاوە... ژیانی سەگێکی بەڕەڵڵا لە من گەلێك باشتر بووە..

یەکێك لە بەندییەکان کە لەسەر جێگاکەی راکشا بوو، قسەکەی زیندەی بڕی و گوتی:

- ڕۆڵە گیان واز لە بەد بەختی بێنە... هەموو ئەو ڕۆژگارانەمان دیوە، پاشماوەی حەکایەتەکە بگێڕەوە بزانین چ "..." خوارد!..

- بەسەر چاوان... ویستم... داوای لێ بوردن دەکەم.. بەڵێ برادەران... چووم بۆ ئەستەموڵ، لەم شارە گەورەیەدا هیچ شوێنێ بەڵەد نەبووم... ئەدەرسی یەکێك لە هاوشارییەکانم پێ بوو... چۆنی بدۆزمەوە؟.غەریب وتەنیا لێرەوە دەچووم بۆ ئەوێ و لەوێوە بۆ ئێرە دەهاتم. پرسیارم لە هەر کەسێ دەکرد لە بری وەڵام یان پێدەکەنی یان شانی هەڵدەتەکاند...

دوای ڕۆژێ سوڕانەوەو پرس کردن، چاخانەی هاوشارییەکانم دۆزییەوە... چووم بۆ ئەوێ... دوای چاك و خۆشی و هەواڵ پرسین.. هاوشارییەکەم پرسی: "چۆن بوو وا ڕیت کەوتە ئەستەموڵ؟.."

حاڵ و مەسەلەکەم بۆی گێڕایەوە... کاك بەرجەستە لە ئەستەموڵدا هێندە ناسراو بوو، گشت کەسێك، تەنانەت هاوشارییە بێ کارەکەی منیش دەیناسی. هەڵبەت نەیدەزانی کە کاك بەرجەستە هاو شاری خۆمانە و کوڕی حەقی پینە دۆزە... منیش لەبەر دۆستەکەی بابم چ قسەیەکم لەم بارەیەوە نەکرد.

هەر چەندە هاوشارییەکەم زۆری هەوڵدا کە بزانێ ئاشنایەتیم لەگەڵ کاك بەرجەستەدا تا چ رادەیەکە، بەڵام هیچی وام بۆ دەرنەخست. هاوشارییەکەم زۆرم لە گەڵدا گەرم وگوڕ بوو، ئیدی نازانم لەبەر ئەو بوو کە دەیزانی بۆرە ئاشنایەتییەکەم لەگەڵ کاك بەر جەستە دا هەیە و ڕەنگە سوودێکی بۆ ئەویش تێدا بێ، یان هاوشارییان لە غەریبی دا پتر دڵ بە یەکەوە دەنێن. بردمی بۆ ئەو ئوتێلەی کە خۆی لێی بوو، هەزار خۆزگە بەکاروانسەرا وچاخانەی گوندەکان...

هێندە پیس بوو دڵم تێك هەڵدەهات.. بەڵام چارم نەبوو.. دەبوا بیگوزەرێنم...

سبەی بەیانی چووم بۆ نووسینگەی کاك بەرجەستە لە بارەگای حیزبی "..." گوتیان لە کۆبوونەوەی کرێکارانە. یەکڕاست چووم بۆ کۆبوونەوەکە .. قسەی بۆ

كرێكارەكان دەكرد. هێندە بەگەرمی قسانی دەكرد هەر مەپرسە... دوو سێ هەزار كرێكار دەبوون، ورتە لە كەسیانەوە نەدەهات. بەڵام دیار بوو كەس لە قسەكانی تێ نەدەگەیی!

ماوەیەك بە گێژ و وێژی وێستام و لە جوڵە و وتەكانی كوڕەكەی حەقی پینە دۆز خێڵ بوومەوە. بە رەحمەت بێ بابی هەمیشە بە سەری خۆیا دەدا و دەیگوت: هەتیو تۆ قەت بە پیاو نابی؟.. هەقی بوو، ئەو كوڕە كورتە بنەیە هێندە چەتوون بوو، سەرجەمی خەڵكی ئاوایی لە دەستی بێزار بوون. تەنانەت دایكیشی لە داخی ئیشە قورەكانی ئەو سەری خۆی هەڵگرت و تەڵاقی وەرگرت! بابیشی لە داخی ئەو سەری نایەوەو مرد...

لە تایفەكەشیاندا كەس ئامادە نەبوو بیگرێتە خۆ.. هەموو دەیانگوت: سەگی كۆڵانەكان دەبن بە مرۆڤ و ئەم هەتیوە پیاو نابێ... وەلێ ئەوەتا من وا بە چاوی خۆم دەیبینم ئا ئەو كوڕەی حەقی پینە دۆز بووە بە پیاو، پیاوێكی گەورەش... برسێتی ورووتی فەرامۆش كردووە.بە حەپەساوییەوە دەمروانی. كە قسەكانی تەواو بوو، هارەی چەپڵەو سەدای هوراكێشان گوێی بنیادەمیان كەڕ دەكرد... هەندێكیان بە رادەیەك گەرم بوو بوون كڵاوەكانیان بە حەوادا هەڵدەدا!.

ژمارەیەكی زۆر رژانە سالۆنەكەوەو لە دەوری كاك بەرجەستە خڕ بوونەوە. منیش بە هەر زەحمەتێ بوو رێیەكم كردەوە و چوومە بەرەوە.. هەر كە چاوی پێم كەوت دەستی لە مل كردم و ماچی كردم. لە دڵی خۆمدا گوتم: دۆستەكەی بابم چەند كابرایەكی بێ ویژدان بوو كە لە پاشە ملە زەمی كاك بەرجەستەی دەكرد!.

ئەوجا بە خەڵكەكەی نیشاندام و گوتی: فەرموون ئەمەش یەكێكە لە هاو وڵاتیە دەردە دارەكانمان، من هەمیشە ئامادەم خزمەتی هاو وڵاتیان بكەم.

خەریك بوو لە شەرمانا ببم بە دڵۆپێ ئاو.. من شایانی ئەم هەموو خۆشەویستییە نەبووم... كاك بەرجەستە بەم پلە و پایەیەوە ئامادەی خزمەتی

من بوو!.. بە شەرمەوە گوتم: ئەم فەرمایشتە چییە قوربان.. من نۆکەری تۆم.. ئێمە بچووکی تۆین.

هێندە هەراو غەڵبە غەڵب بوو، تاقە یەك وشەشی لەم قسانەم بەر گوێ نەکەوت.

لە دڵی خۆمدا گوتم: چۆنە بەم گەرما و گەرمە داوای کەمێ پارەی لێ بکەم.. وەلی هەستم کرد کە کارێکی دروست نییە و وازم لەم بیرە هێنا... و گوتم: ئەرێ دەتوانم لە کوێ بت بینم؟

گوتی: من لە هەموو شوێنێکا ئامادەی خزمەتم.

پرسیم: کەنگێ بێمە خزمەتتان؟

– هەر کاتێ حەز دەکەیت لە خزمەتت دام!

لە راستیدا کە چاوم بەم ماریفەتو وێلْ وئاکارە مرۆڤایەتییەی کاك بەرجەستە کەوت شەرمەزار بووم. راستە بابم بە خێوی کرد بوو، زۆری بە سەرییەوە هەبوو. بەڵام رەوشت و وێڵی کاك بەرجەستە لەمانە بە نرختر بوو، بە تایبەتی لە رۆژگارێکا کە برا برای خۆی ناناسێت، بوونی مرۆڤێکی وەکو ئەو کیمیا بوو..

گوتم: دوای نیوەرۆ دێم بۆ نووسینگە..

بە روویەکی خۆشەوە گوتی: من هەموو کاتێ، لە هەموو شوێنێکدا ئامادەی خزمەتم...

برادەران، کەسێ نەمرێ دوای نیوەرۆ هەر هیچ نییە.. بەڵام بۆ سبەی و دوو سبەی و دوای هەفتەیەکیش هەر نەمتوانی بیدۆزێمەوە.

توخوا سەیری گەوجی و گێلی من بکەن. من نەمزانی کە" هەموو کاتێ" واتە هیچ کاتێك و" هەموو شوێنێ" یانی هەرگیز، ئەمانە هەمووی قسەی رووتن. سیاسییەکان بۆ خۆ سەپاندن و خۆ خۆشەوست کردن ئەمە دەکەن و هەمیشە ئەم رستانە دەڵێنەوە.

دوای ماوەیەك سەرگەردانیو بێو برۆ دەرگاوانی ژوورەکەی کاك بەجەستە کە تومەز دڵی بە حاڵم سووتا بوو ئەم شتەی پێ گوتم، چونکە زانیم پیاوێکی چاکە کەوتمە سەر دەستو پێی و گوتم: وەعزی من جیایە لە هی خەڵکانی دی. خۆی

چاکم دەناسیت تۆ هەر ئەوەندە رێم بدە کە بچمە ژوورەوەو بیبینم، ئیدی ئەوی دی بۆ خۆی ساز دەبێت.
دەرگاوانەکە گوتی: چۆنت دەناسێت؟
بە کورتی هەموو شتێکم بۆ گێرایەوە، گوتم ئەو رۆژەش کە لە کۆبوونەوەکەدا بینیمی ئەملاو ئەولای ماچ کردمو بە خەڵکەکەی ناساندم، دەرگاوانی ناڕەسەن بە تەوسێکەوە پێکەنیو گوتی: ئەو رۆژی سەدان کەس ماچ دەکات!... ئەمە بەڵگەی ئاشنایەتی نییە... هەموو سیاسییەکان وان. چما تۆ خەڵکی ئەم وڵاتە نیت؟!..
وام هەست کرد ئەم قسانەی لە رووی ناڕەسەنییەوەیەو دەیەوێ دەستم پێوە بنێو نەیەڵێت بچمە لای کاک بەرجەستە.. کەوتمە تکاو پاڕانەوەو گوتم: -بابە عەزیەتم مەدە.. من هاوڕێی منداڵی ئەوم.. رێم بدە بچمە ژوورەوە.
لێ ئەم قسانەی بە گوێدا نەچوو، گوتی: -ئەگەر بیویستایە بت بینێ کاتی دیدەنی بۆ دیاری دەکردیت..
مشت و مڕەکەمان گەرم بوو، هەموو فەڕاش و دەرگاوانەکان پێیان زانی... کۆمەڵێك لە دەورمان خڕ بوونەوە.
هەندێکیان پێدەکەنین.. هەندێکیان گاڵتەیان دەکرد. هەرکەسە و شتێکی دەگوت. بەڵام من باوەڕم نەدەکرد پیاوێ کە لە ماڵی بابم دا گەورە بوو بێ و چەندین ساڵ هاووازی یەکدی بووین، وابە هاسانی بم خەڵەتێنێ. بۆیە ئامادە نەبووم دەست لە دیدەنی هەڵگرم و بڕۆم بە دوی کاری خۆمدا.. پێ داگرتنیش لەوە پتر بێ فایدە بوو. ناچار لە بەر دەرگاکە لاچووم، کەمێك لە ڕارەوەکەدا هاتوچۆم کرد.. دەبوو بە هەر نرخێ بووە خۆم بە ژوورێ دا بکەم. وام دانا بوو چاوەڕێ بکەم تا دەرگاوانەکە دەچێ بۆ چا هێنان یان هەر کارێکی دی، خۆم بە ژوورەکەی کاك بەرجەستەدا بکەم.. هێندەم رق لە دەرگاوانەکە هەستا بوو، بڕیارم دا یەکەم داواکاریم لە کاك بەرجەستە لابردنی ئەو دەرگاوانە بێ. لەم بیرانەدا بووم یەکێك لە ژوورەکەی تەنیشتەوە دەرگاوانەکەی گاز کرد.

دەرگاوانەکە بەدەم دەنگەکەوە چوو. منیش بە پەلە دەرگاکەم کردەوە و چوومە ژوورەوە..

وام دەزانی ژووریکی گەورەیە، کەچی بچووك بوو، و هیچکەسێك لە ژوورەوە نەدەبینرا... لە ژوورەکەی پشتەوە سەدای پێکەنین و سوعبەتم بەر گوێ کەوت.. بە دەنگەکەوە چووم، دەرگاکە واز بوو، سەرم نرم کردەوە و بە دزییەوە سەیرێکی نێو ژوورەکەی پشتەوەم کرد.. کە چاوم بەو دیمەنە کەوت ئەوجا زانیم کە دەرگاوانەکە بۆ چی مۆڵەتی نەدەدام بچمە ژوورەوە. کیژێکی شۆخ و شەنگ لە پشت مێزێکەوە دانیشتبوو، دیاربوو کوڕەکەی حەقی پینە دۆز شتی دەگوت و کیژەکە چاپی دەکرد بەڵام نەك هەر وا بە شێوەیەکی ئاسایی. کاکم دەستی لە ملی کچەکە کرد بوو، و بەدەم قسەکردنەوە یاری بە قژوگەردنی دەکرد!..کچەکەش بە نازو عیشوەوە سەری بەم لاو بەولادا دەبرد...

ماوەیەك سەیری دیمەنەکەم کرد.هەستم کرد خەریکە وەختەکە دەڕوات ولەوەیە دەرگاوانەکە بێتەوەو ئەم هەلەم لە دەست بدات. بۆ ئەوەی ئاگادار بێتەوە نەرمە کۆکەیەکم کرد....کاك بەرجەستە داچڵەکی وئاوڕێکی بۆ لای من دایەوە.دەیویست قسەیەك بکات،بەڵام من مۆڵەتم نەدا، بەرەو پیری رام کرد،چۆن ئەو رۆژە ئەو لە کۆبوونەوەکەدا بە گەرمی باوەشی بە مندا کردوماچی کردم، منیش ئەمرۆ هەمان شتم لە گەڵدا کرد.دەستم خستە ملی، دەیویست بکشێتەوە،توند بە خۆوەم گوشی وماچم کرد،کاك بەرجەستە بە هەرحاڵێ بوو خۆی لە باوەشم دەرهێناوبە ساردییەکەوە پرسی: "چیت دەوێ؟ تۆ کێیت؟"

وەك سەهۆڵێك بکێتە ئاوی گەرمەوە، بەو چەشنە توامەوە.ئێستا چی ێ بڵێم: باشە مەزنی بکەموبکەومە سەر دەستو پێی؟یان خۆم بناسێنموەدەستەکەی بخەمە روو؟ لە دڵی خۆمدا گوتم هەرچییەك دەبێ بابێ،بۆیە بە رەقی وەڵامم دایەوە:ئەمە چ قسەیەکە..گوایە تۆ من ناناسیت؟ من زیندەم، کوڕی رەشید..هێشتا هەر نەت ناسیمەوە؟

لەم کاتەدا دەرگاوانەکە بە سەرسامی هاتە ژوورەوە، کاك بەرجەستە ئیشرەتی بۆ کرد کە بمکاتە دەرەوە.دەرگاوانەکە هاتوتوند بازووی گرتمو گوتی:"برۆ دەرێ". کە هەستم کرد وەزەکە روو لە خراپییە تا هێزم تێدا بوو کێشام بەسەر سیگی دەرگاوانەکەداو گوتم:

- کوڕی حەقی پینەدۆز تومەز زۆر خۆت لێ گۆڕاوە! حەیا شتێکی چاکە..تۆ چەندین ساڵ لە ماڵی بابی منا بوویت...

کاك بەرجەستە بە رادەیەك لە قسەکانم دەهری بووبوو دەمارەکانی لاملیت یەك یەك بژماردایە. سوور بووبووەوە! هاواری کرد:

- من نێوم بەرجەستەیەو حەقی پینەدۆزیش ناناسم.

خانمی سکرتێر گوتی:

- قوربان کۆبونەوەت هەیە.. فەرموو تو تەشریف بەرە بۆ کۆبونەوەکەت بەندە قسەی لەگەڵدا دەکەم.

بەڵام من دەست بەردار نەبووم، لەو زیاتر هاوارم کرد:

- تۆ دایك و باوکی خۆت ناناسیت... بەڵام ناتوانیت نکوڵی لەو شتانە بکەیت کە من بەسەرم هێناویت.

بەرجەستە کە ئەم قسانەی ژنەوت کوت و پڕ گۆڕا، قسەکەی پێ بڕیم و بە سکرتیرەکەی گوت: ئێوە بچنە دەرەوە.

سکرتێر و دەرگاوانەکە چوونە دەرێ ودەرگاکەیان توند داخست. کاك بەرجەستە وەکو دۆستێکی گیانی بەگیانی باوەشی پێمدا کرد و ماچی کردم. لەسەر کورسییەکەی خۆی دای نیشاندم، جگەرەیەکی بۆ داگیراندم و گوتی: داوای لێ بووردنت لێدەکەم نەمناسیتەوە.

گوتم: یانی چی... هەفتەی پێشوو، دوای چاردە ساڵ دووری ناسیتمەوە، لە باوەشت کردم، ماچت کردم.. چۆن ئێستا نەت ناسیمەوە؟

- بابە ئەمە بەرنامەیەکی گشتییە... ئێمە لەگەڵ هەموو کەسێك دا بەم جۆرە رەفتار دەکەین.

ئـەمجا زانـیم کـە دەرگاوانەکـە هـەقی بـوو، تومـەز کردەوەکـەی ئـەو ڕۆژەی بەرجەستەش لەبەر سەرنج ڕاکێشانی کرێکارەکان بووە. خۆش ئەوە بوو کە سکرتێر و دەرگاوانەکە چوونە دەرێ، شێوەی قسەکردنەکەشی گۆڕا.. پرسی:

– باشە کوڕی باش چی دەکەی؟ بە چییەوە خەریکی؟

– هیچ.. بێکارم.. بۆیە هاتووم بۆ لای تۆ تا کارێکم بۆ پەیدا بکەیت.

پرسی:– بڕوانامەت هەیە؟

– نەء.. بڕۆا نامەم لە کوێ بوو.. نەمتوانی بچمە قوتابخانە.

بە زەردە خەنەیەکی پـڕ مانـاوە گـوتی:– باشـتر.. دەتـوانی کـاری چـاکتر پەیـدا بکەی.

زۆرم سەر سورما!.. یانی چی؟! یەکێك بڕوانامەی نەبێ و بتـوانێ کاری چاکتر پەیدا بکات؟! حەزم دەکرد نهێنی ئەمەی لێ بپرسم، بەڵام ئەو بواری نەدام. ناوی چەند دایەرەو کۆمپانیایەکی برد و پرسی:

– سەرۆکایەتی کامیانت دەوێ؟

وام بە خەیاڵدا هـات کـە دیـسان دەیـەوێ دەسـتم پێـوە بنـێ. بۆیـە گـوتم:– کـاك بەرجەسـتە عەزیـەتم مـەدە. ئـەم کارانـە بـە کـەڵکی مـن نایـەت.. زۆر بـە هێمنـی و خۆمانەو پرسی:– دەتەوێ ببی بە پارێزگار یان باڵیۆز؟

خـەریك بـوو تـوڕە بـبم.. گـوتم: کاکـە گیـان شـۆخیان مەکـە... پـێم گوتیـت خوێنەوارییەکی ئەوتۆم نییە، ئیدی بۆ عەزیەتم دەدەی؟

بەرجەستە بە ڕوویـەکی خۆشەوە گوتی:– وەڵڵا عەزیـەتت نـادەم. ئەگـەر بتـەوێ ببی بە کوچەماڵ یان پاسەوان، پێویـستە بڕوانامـەت هـەبێ.. بـەڵام پارێزگاری، بەڕێوەبەری شارەوانی و باڵیۆزی بڕوانامەی ناوێ!

– چاوەکەم... ئەمانە شۆخین.. ئیشێکی بچکۆلەم بۆ بدوزەوە کە پاروە نانێك پەیدا بکەم و تا ماوم هەر دەستە ودوعابم.

– ئەمـەیان زۆر زەحمەتـە! ئیـشی بـچووك دەبـێ لـە تاقیکردنـەوەو تـەراتێن دا بەشـداری بکـەیت.. چـەند ڕۆژێ لەمەو بەر کـە دادگا ویـستی چـەند سکرتێرێ

دابمەزرێنێ، نزیکەی چوار سەد کەس داواکاریان پێشکەش کرد بوو، بە هەزار حاڵ توانیم کوڕی کابرایەکی ئاشنام داخڵ بکەم.

بەبێ سەربوریەوە گوتم: بابە تۆ دەرگاوانییەک، ئامەبەرییەک، شتێ لەم بابەتە کارانەم بۆ بدۆزەوە من بەسمە.

- زۆرچاکە، کارتێکت بۆ دەنووسم.

- زۆر سوپاس... بەرخوردار بی.

کارتەکەی نووسی و دایە دەستم.. خوا حافیزیم لێکرد و ڕۆیشتم.. لە دەرەوە کارتەکەم خوێندەوە، نووسرا بوو:

(هەڵگری کارت کاک زێندەم ناردە خزمەتت، تکایە کارێکی گونجاوی بدەیێ. بەرجەستە).

یەک ڕێ چووم بۆ لای هاوشارییەکەم، کارتەکەم نیشانی دا. کە چاوی پێ کەوت ئەبڵەق بوو، وەک بڵێی ئەم کارتە پارتەقای گەنجینە گەوهەرێک بێ، پرسی: ئێستا دەتەوێ چی بکەی؟

چونکە لە منداڵیدا جارێک لەگەڵ بابم دا چوو بوومە موزەخانەو وێنەی پەیکەر و شتە گران بە هاکانی موزەخانەکەم هێشتا لەبەر چاو بوو گوتم: حەز دەکەم بکرێم بە دەرگاوانی موزەخانە.

هاوشارییەکەم بە پێکەنینەوە گوتی: شێتە ئەم کارتە بخەیتە سەر ئاسن دەتوێتەوە. تۆش هەر بە دەرگاوانییەوە گرتووتە؟

- ئەی چی بکەم؟

- کە ئەم کارتەت هەبێ، داوای بەڕێوەبەری گشتیش بکەی هەر کەمە... بەڕای من ئەم کارتە بفرۆشین و بە پارەکەی کاسبییەکی چاک پەیدا بکەین...

هەستم کرد دەیەوێ دەستم بېڕێ، بۆیە نەچوومە ژێر بار.. بە تایبەتی هەستم کرد بوو کە هاوشارییەکەم لەم ماوەیەدا کارێکی دیاری نییە...ژنەکەی لە گوندەوە بۆ ئەستەموڵ هێنابوو، لە ماڵە دەوڵەمەندێکدا کارەکەری دەکرد و ج

پارە وپولێکی دەست دەکەوت دەیدا بە مێردەکەی. بۆیە رقم لێی هەستاو دەمزانی کە جێی متمانە نییە..

بەهەر حاڵێ بوو، بە پرسیار موزەخانەی ئەستەموڵم دۆزییەوە... هەواڵی سەرۆکم پرسی، گوتیان کۆ بوونەوەی هەیە، سبەی وەرەوە... سبەینێ چوومەوە، گوتیان: ئەمرۆش کۆنفراسی هەیە و رۆژێکی دی وەرەوە... دوای دوو رۆژان چوومەوە، گوتیان لە مادونییە و هەفتەی داهاتوو وەرەوە... بەم حاڵە دوو مانگان سەر گەردان و بێ پارە هەموو کارێکم ئەوە بوو کە سەرۆکی مۆزەخانە ببینم و... هیچ.. چونکە هاوشارییەکەم نرخی کارتەکەی دەزانی، هەمیشە دەیگوت ئەم کارتە لە زێر بەنرخترە.. چونکە دڵنیاش بوو کە من کارێك پەیدا دەکەم و چاکەی دەدەمەوە هەموو رۆژێ سێ چوار لیرەی دەدا مێ و پارەی ئوتیلەکەی بۆ دەدام، بەڵام تاکەی هەر چاوم لە دەستی مەردم بێ... بە کورتی سەرۆك لە مادونی گەڕایەوە، نەخۆش کەوت! چاوەڕوان بووم تا چاك ببێتەوە، رۆژێکیان بەیانی زوو هاوشارییەکەم گوتی:

– وەعزەکە بۆنی خراپی لێ دێت، هەر چۆنێ بووە بچو سەرۆکی موزەخانە ببینە.

لە قسەکانی حاڵی نەبووم.. نەمزانی خراپ بوونی وەعز یانی چی و چ پێوەندییەکی بەکاری منەوە هەیە. هاوشارییەکەم ئاشکراتر گوتی:

– لەوانەیە بەم زووانە کاك بەرجەستە لە کار بخرێ، حیزبی خەنیم بێتە سەر کار.. ئەگەر ئەمە ببێ کارتەکەی تۆ تاقە دینارێك ناکات و بە پاڵ لە دایەرەکان وەدەرت دەنێن.. رۆژنامەکان نووسیانە بەرجەستە رۆییوە بۆ هەندەران.

دەست بە جێ چووم بۆ لای سەرۆکی نووسینگەی مۆزەخانە و گوتم:

– تا سەرۆك نەبینم لێرە ناڕۆم.. کە سەرۆکی نووسینگە بەو حاڵەوە دیتمی پرسی:

– چیت دەوێ؟

گوتم: کارتێکم بۆی هێناوە...

سەرۆکی نووسینگەکە، دڵی پێم سوتا و گوتی: کوا کارتەکەت بزانم.. دەستم بە گیرفانم دا کرد، سەیرم کرد کارتەکە نەماوە.. گیرفانەکانی دیم گەڕام، چ هەواڵێك لە کارتەکەوە نەبوو.. ئارەقم کردەوە، بە دەم بۆڵە بۆڵەوە گیرفانەکانم دەگەڕام: نازانم لە کوێم داناوە.

سەرۆك نووسینگە گوتیَ: ناکا گیرفانیان بڕی بیت؟

– خوا نەکات، بەکەڵکی کەس نایەت..

جانتاکەم، ئەستەری شەپقەکەم و هەر جێیەك کە گومانم لێ دەکرد گەڕام. لە پڕ لە نێو کەل پەلەکانما دۆزیمەوە.. کارتەکەم دەرهێناو دامە دەستی کابرا... یارۆ عەینەکەکەی کردە چاوی، چەند جاریَ عەینەکەکەی بەرز و نزم کردەوە و گوتی: چییان لەسەر ئەم کارتە نووسیوە؟

– یانی چی، چییان نووسیوە؟.. نووسراوە کارێکی گونجاو بە هەڵگری کارت بدەن..

– نە.. بابە گیان.. هێندە دەستت پێدا هێناوە نووسینەکانی کوێر بوونەتەوە.. سەیر کە ووشەی" هەڵگری کارت" سڕاوەتەوە. ماوەتەوە کاك زیندەم ناردە خزمەتان.. دوای ئەوەش، سڕاوەتەوە.. و ماوەتەوە" پیَ بدە..

زۆرم ئارەقە دەکردەوە، دیار بوو ئەنجامی ئارەقەی لەشم هەنیَ لە نووسینەکان کوێر بوو بوونەوە! سەرۆکی نووسینگە کارتەکەی لە چاوی نزیك کردەوە و ورتە ورتێکی کرد:" مەخابن کە ئەم کارتە وای لێهاتوە.. پرسیم: ئەی چارە؟...

سەرۆك نووسینگە کە پیاوێکی چاك بوو گوتی: بەداخەوەم ئەوڕۆ سەرۆك لێرە نییە.. برۆ دوو ڕۆژی دی وەرەوە، دەت نێرمە ژوورەوە.. و کارت رایی دەبیَ..

خۆشحاڵ و دڵخۆش گەڕامەوە و چووم بۆ ئەو چاخانەیەی کە هاوشارییەکانم لێی دادەنیشتن، حاڵ و حەکایەتەکەم بۆ گێڕانەوە.. خەڵکی نێو چاخانەکە کە مەسەلەکەیان زانی ماوەیەك پێکەنین و شۆخیان کرد، ئەوجا چەند کەسێکیان پێیان لیَ داگرتم کە کارتەکەیان نیشان بدەم.. منیش حەزم نەدەکرد ئەم تەلیسمە گران بەهایە بە کەس نیشان بدەم، بەڵام زۆریان پیَ داگرت، ناچار

بووم، کارتەکەم لە گیرفانم دەرهێنا، هەر بە دەستی خۆمەوە نیشانم دان، یەکێك لە پشتمەوە دەستی هێناو ویستی کارتەکە بفڕێنێ، منیش دەستم کێشاوەو گوتم: توخوا مەکە. بەڵام دوای چی! کارتەکە بوو بە دوو لەتەوە... بەشە گەورەکەی بە دەستی منەوە مایەوەو بەشەکەی تری بە دەستی ئەوەوە... لە نیگەرانیدا کەوتمە گریان... چ جنێوێکم بە دەمدا هات پێم دا، خەڵکەکە دڵیان دەدامەوە.

یەکێکیان گوتی: هەرچییەك بڵێی هەقتە.. من وەستای پارە پینەکردنم... کارتەکەت بێنە لە جاران بۆتی چاکتر دەکەمەوە...

هەردوو پارچەکەی وەرگرت، لە پشت مێزێکەوە دانیشت... بە وردی هەردوو پارچەکەی خستنە دەم یەکەوەو چەسپی لێدان. ئەوجا بە مشت کوتایەوە تاکو چاکتر پێکەوەی بچەسپێنێ دەستی هەڵبڕی کە مشتی دووەمی پێدا بکێشێت، وای خوایە گیان چیم بینی! پارچەیەك لە کارتەکە بە دەستییەوە لکاو چەند وشەیەکی دی سڕابوونەوە!...

ئەمجارەیان بە زەحمەت ئەم رستەیە دەخوێنرایەوە: کاك... نارد.. پێ بدە!...

یارۆ لە من پتر خەمبار بوو، گوتی: بەختێکی رەشت هەیە.. تا ئێستا سەدان هەزار دینارم چاك کردوەتەوەو هیچیان خراپ نەبوون. بەختی تۆ بوو کە ئەمە وای لێهات!.. بێدەنگ بووم، ئەگەر خوا حەز بکات بەمەش کارم رایی دەبێ...

دوای دوو رۆژەکە چوومەوە بۆ لای سەرۆکی نووسینگە، لە بەدبەختی مندا ئەمجا ئەو چوو بووە مادونی... بڕیارم دا بە هەر نرخێ بووە ئەو رۆژە سەرۆك ببینم و کارەکەم یەك لایی بکەمەوە...

هێندە لەبەر دەرگا وێستام، دەوام تەواو بوو... کە سەرۆك هاتە دەرێ تا بۆ ماڵ بڕواتەوە پێشم لێ گرت. سەرۆك کە ئاگای لە هیچ نەبوو، زۆر ترساو هاواری کرد: کۆمەك... بیگرن. پیاو خراپە.. فەڕاش و فەرمانبەرانی مۆزەخانەکە پەلاماریان دام و قۆڵیان گرتم.. منیش هاوارم دەکرد: بەرم بدەن کارم بە جەنابی سەرۆك هەیە... سەرۆکیش هاواری دەکرد: بیگرن، پیاو خراپە!.

ئەنجام یەکێکیان پرسی: چ کارێکت بە سەرۆك هەیە؟
کارتەکەم دەرهێناو گوتم: کارتم لە کاك بەرجەستەوە هێناوە.
کە نێوی کاك بەرجەستەم برد، هەموو کشانەوەو لە جێی خۆیاندا وێستان..
ماوەیەك بە بێدەنگی سەیرم کردن.. جەنابی سەرۆك دڕی بە بێدەنگییەکە داو لێم هاتە پێشەوەو پرسی: وتت کارتی کاك بەرجەستەت هێناوە؟
– بەڵێ قوربان.
سەرۆك رووی کردە فەرمانبەرەکان و گوتی: ئێوە بڕۆن.
ئەوجا دەستی دا بە پشتم داو گوتی: رۆڵە گیان.. کەسێ کە کارتی کاك بەرجەستەی پێ بێ، یەك راست دێتە لام.
گوتم:_ قوربان ماوەیەکە موارجەعە دەکەم، و دەستم پێوە دەنێن.
– ئەستەغفروڵلا.. بێگومان نەت گوتووە لە کێوە کارتت هێناوە؟ ئەگینا ناشێت.
جەنابی سەرۆك هێشتا هەر دەستی لەسەر شانم بوو، بردمییە ژوورەکەی خۆی.
کورسییەکی نیشاندام: دانیشە رۆڵە گیان.. ئەوجا پرسی: چا دەخۆیتەوە یان قاوە، یان ساردییەکی تەزی بێنی؟
– زۆر سوپاس... حەزم لە هیچیان نییە..
بۆ دۆزینەوەی کارتەکەی کاك بەرجەستە کەوتمە پشکنینی گیرفانەکانم. بەڵام دیسان غەیب بوو بوو. بە جۆرێ شلەژا بووم، سەرۆك دڵی پێم سووتا.
– مەشڵەژێ رۆڵە.. هێدی و لەسەر خۆبە. گیرفانی پانتۆڵەکەشت بگەڕێ.
گوتم: قوربان چما دەشێت کارتی کاك بەجەستە لە گیرفانی پانتۆڵ دا دابنەم؟!
– کەواتە هێدی هێدی بۆی بگەڕێ هەر دەیدۆزیتەوە..
جەنابی سەرۆك هەقی بوو بەزەیی پێم دا بێتەوە... هێندە پەشۆکا بووم لە کاتێکا کارتەکە لە نێو دەستم دا بوو، من گیرفانەکانمی بۆ دەگەڕام...
کارەتەکەم دایە دەستی جەنابی سەرۆك. عەینەکەکەی لە چاو کرد، کارتەکەی خوێندەوەو پێکەنی.. منیش پێکەنیم.

سەرۆك گوتی: یانی چی؟... نووسراوە ئەو برادەرەم ناردووە پێی بدە!. بێگومان مەبەستیان ئەوە بووە کە مۆزەخانەکەت پێ نیشان بدەم. زۆر چاکە.. حەز دەکەی سەیری کام بەشەی بکەیت؟

بە توندی وەڵامم دایەوە: – قوربان من هاتووم لێرەدا کارێکم پێ بدەن...

– وەڵلا لەم کارتەدا شتی وا نەنووسراوە..ئەگەر نووسیبای بە بان چاو دەم دایتێ.

گەڕامەوە بۆ چاخانەکە.. هێندە نیگەران و پەست بووم، خەنجەرت لێ بدامایە خوێنم لێ نەدەهات.. هاوشارییەکەم لەوێ بوو، بەر لەوەی چ قسەیەك بکەم گوتی: زیندە مژدەم بدەرێ نامەت بۆ هاتووە...

دڵم داخورپاو دەردی بێکاری و برسێتیم فەرامۆش کرد. زانیم کە ئەقدەس نامەی نووسیوە. جگە لەو کەسی دیم نییە نامەم بۆ بنێرێ... ئەمە چوارەمین نامە بوو کە ئەقدەس بۆی نارد بووم. بێ وچان تکای دەکرد، بیهێنم بۆ ئەستەموڵ بۆ لای خۆم. منیش وەڵامم دایەوە کە تۆزێ سەبر بکات تا کارەکەم رایی ببێ و بەم بیانووەوە دەم خلافاند..

ئەقدەس نووسیبووی: چیدی تاقەتم نییە لە تۆ دووربم، ئەگەر دەتوانی تا زووە بم بە بۆ لای خۆت، ئەگینا ناچارم خۆم بکوژم.. دایك و بابم هەڵیان پێچاوم کە بمدەن بە کابرایەکی دەوڵەمەند. تەواو تەنگیان پێ هەڵچنیوم و نازانم چی بکەم..

زیندە بێدەنگ بوو. فرمێسك زایینە چاوەکانی. بەندییەکان بە یەك دەنگ گوتیان: دە وەرە ئەم بارە راست بکەوە...

زیندە نەیتوانی پاشماوەی حەکەیاتەکە تەواو بکات، تکای کرد کە پاشماوەکەی بۆ سبەی شەو دابنەن. بەندییەکان بە نابە دڵییەوە رازی بوون.

## (١٠) کاسب خۆشەویستی خوایە!

ئەو شەوە زیندە سەرمای بوو، سبەی بەیانی کە چوو بۆ نەخوشخانەی زیندان پزیشکەکە گوتی: پێویستە چەند رۆژێك پشوو بدەیت... زیندەش قەبوڵی کرد، لە نەخۆشخانەی زیندانەکەدا نووست هەر چەند گەورەترین ئارەزووی بەندییەکان ئەوە بوو ئەگەر بۆ شەوێکیش بووە، لە زیندان بچنە دەرەوەو لە نەخۆشخانەدا بمێننەوە، کەچی زیندە ئەم حاڵەی زۆر بە دڵ نەبوو... لە لایەکەوە بۆنی لێفە ورایەخی نەخۆشخانەکە نارەحەتی دەکرد، لە لایەکی ترەوە ئەو دەرمانانەی کە خوارد بوونی تێکی دابوو.. لەمانەش گرنگتر شەیدای گێڕانەوەی سەر بوردەو بەسەر هاتەکەی خۆی بوو، بۆیە ناچار بوو چاوپۆشی لە پشووی نێو نەخۆشخانەکە بکات وبگەڕێتەوە لای برادەرەکانی... کە سەرگوزشتەکەی دەگێڕایەوە غەم وپەژارەی کەمتر دەبوەوە...

لەو ەەمەدا کە هاوبەندییەکانی نانی ئێوارەیان خوارد بوو، و بە خەمباری و پەستییەوە لە سەر جێگاکانیان راکشا بوون، زیندە خۆی بەقاوشەکەدا کرد...

ردێن سپی قاوشەکە لە هەموویان پتر خۆشحاڵ بوو، و هاواری کرد:

– کوڕینە مژدەم بدەنێ وا زیندە هاتەوە...

یەکێکیان گوتی: رەنگە درۆی کرد بێ و نەخۆش نەبووبێ..

تەواوی بەندییەکان راست بوونەوە. بەندییەکی پیر کە لە سەروی ژوورەکە دانیشتبوو گوتی:

– برادەران، خەریکە دنیا سارد دەبێ.. کە ئەوەندە عاشقی حەکایەتەکەی بوون، بەلای کەمەوە مشورێکی بخۆن.

زیندە گەییە بەر دەرگا.. رەنگ و رووی تێك چوو بوو.. یەکێك لە بەندییەکان لە قاقای پێکەنینی داوگوتی: ناشێ پشیلە سوورە پێی لێ نابیت، ئەوە چ خێرتە؟

– تۆزێ سەرمان بووە.

یەکێك لە بەندییەکان بە دەنگێکی گڕ گوتی: خۆتۆ زیندوو نیت تا سەرمات ببێ.. خۆ مردوش نەخۆش ناکەوێ..

زیندە هاتە ژوورەوە، لە پاڵ دیوارەکەدا دانیشت. هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو گوتی:

– برام راستە زیندوونیم و ناژیم، بەڵام لەهەر جییەك قازانجی دەوڵەت لە ئارادا بێ بە تۆبزی زیندوو دەکرێمەوە..

ردێن سپی قاوشەکە گوتی: بابە گیان ئەگەر تاقەتی حەکایەت کردنت هەیە کاتەکە بە فیڕۆ مەدە.

زیندە دەستی رەزامەندی خستە سەرچاوی و پرسی:

– گەیی بووینە کوێ؟

دووسێ کەس وەڵامیان دایەوە:– گەرایتەوە چاخانەکە وکاغەزی ئەقدەسیان دایتێ.

– ئەها.. راستە.. بەڵێ، دوای ئەوەی بەسەرهاتی موزەخانەکەم بۆ هاوشارییەکەم گێڕایەوە، کاغەزەکەی ئەقدەسیان دامێ، خویندمەوەو ماتەمی دایگرتم، هاوشارییەکەم گوتی:

– بە راستی تۆ بنیادەمێکی گەوجی.. تۆش وەکو من ئەقدەس بێنە بۆ ئەستەموڵ و با بۆخۆی لە مالە دەڵەمەندێکا کار بکات.. هەم هەفتەی دووسێ جار یەکدی دەبینن و هەم لە گوند رزگاری دەبێ. لەم قسانە تورە بووم، دەمویست بڵێم: "کەرپیاو من وەکو تۆ بێ ئابروونیم کە بە پارەی ژنەکەم بژیم و لە بەیانییەوە تا ئێوارێ لە چاخانەکەدا خەریکی قومار بم: "بەڵام بەهەر حاڵێ بوو زمانی خۆم گرت.. هەر چییەك بێ خەرجی کێشاوم زۆری قەزاربارم. گەر قسەیەکم کردبا لێم دەرەنجاو ئەوسا ناچار بووم شەو لە کۆڵانان بنووم.. هاوشارییەکەم کە هەستی بە نیگەرانیم کرد بوو گوتی:

– مەرج نییە پارە لە کچەکە وەربگری.. با ئەو بۆ خۆی کار بکات و پارەکەی پاشە کەوت بکا.. تۆش بۆ خۆت کاربکە.. هەر کاتێ ویستت بیگوازیتەوە ئەوا بۆ خۆتان پارەی خانوویەکتان کۆ کردوەتەوە..

سەیرم كرد راست دەكات.. ئەگەر هەروا دەستەوئەژنۆ دانیشم لەوانەیە ئەقدەسم لە دەست بچێ.. كە من هیچ تەماحێكم بە پارەی ئەو نەبێ بۆ كار نەكات؟ لە هاوشارییەكەم پرسی:

– گریمان ئەقدەس هات بۆ ئەستەموڵ، ئیش كوا!

پێكەنی و وەڵامی دایەوە:

– دەوڵەمەندەكان كچێكی وەها لە ئاسمان دەقوزنەوە! تۆ بۆی بنووسە با بێت، كار دۆزینەوە لەسەر من.

گوتم: بەلام من نایەڵم لە ماڵێكا كار بكات كە كوڕی گەنجیان هەبێ.

هاوشارییەكەم گوتی: بابە من ماڵێك دەدۆزمەوە كە خاوەنەكەی ژن بێ و پیاویان هەر نەبێ.

هەر ئەو شەوە نامەیەكم بۆ ئەقدەس نووسی كە زوو بكەوە خۆت و بێ بۆ ئەستومولّ.

ئەقدەس وای زانی بوو من كارێكی چاكم دۆزیوەتەوە، بە تەلەگراف وەڵامی دامەوە فلان رۆژ لەوێم.. بەشەمەندەفەردێم..

سبەی بەیانی كاكی هاوشاریم بردمی بۆ باخچەیەك.. گۆشەیەكی باخچەكە تایبەت بوو بۆ ئەو كارە.. كۆمەڵێك ژن و پیاوی گەنج و پیر تەنانەت كوریژگە و كچۆڵە لەسەر كورسی دانیشتبوون. ئەو كابرایەی كە ئەو كارەی دەكرد، لە بری دوكان و موغازە ئەو باخچەیەی كرد بوو بە جێی كارەكەی و بە بەلاش رۆژی سێچوار هەزار لیرەی دەست دەكەوت. دوای ئەوەی باسی ئەقدەسی ژنەوت و زانی چ كارگەلێك بەڵەدە گوتی:– ژنێكی پیرودەوڵەمەند هەیە بە گوێرەی دڵی ئێوەیە... لە كۆنە شازادەكانی توركە و نێوی ئیحسان خانمە و بە تاقی تەنیا لە كۆشكێكی گەورەدا دەژی و پێویستی بە پەرستارێكی واهی هەیە. هەم پارەی چاك دەدات و هەم كارەكەشی هاسان و رەحەتە. و هەم ئێوەش دڵنیان و هیچ پیاوێك لە كۆشكەكەیدا نییە. كچ و كورەكانی ئیحسان خانم هەموو شوویان كردووە و ژنیان هێناوە وجیا بوونەتەوە. ئەو پیرێژنە بە تاقی تەنیایە.. ئەگەر

کچەکە ئاقڵ و ژیر بێ و بتوانێ دڵی پیرێژنەکە رابگرێ ئەوا غەرقی ناز و نیعمەت دەبێ، بۆ خۆی دەخواو دەشوات.. و دوور نییە رۆژێ بێت ببێ بە میراتگری ئەو.
زۆر خۆشحاڵ بووم.. دەربارەی رۆژانە وهەموو مەرجەکانی دی دواین، خاوەن کارەکە ئەدرەسی ئیحسان خانمی داینێ کە ئەقدەس هات یەك رێ بیبەمە لای ئیحسان خانم.
ئەو شەوەی کە بریار بوو سبەینێ ئەقدەس بۆ ئەستەموڵ بێت تا بەیانی خەو نەچووە چاوم. سبەیش هەر چەند دەمزانی قیتار بۆ نزیکی ئێوارە دەگاتە ئەستەموڵ، لە بەیانی زووەوە چووم بۆ ویستگای شەمەندەفەر.. هەر چەند کاتی هاتنی شەمەندەفەر نزیکتر دەبوو، ترپەی دڵ و هەڵچوونی دەروونم پتر دەبوو.
ئاخری کاتی هاتنی قیتار گەیی، بەڵام چ هەواڵێك لە شەمەنەفەرەوە نەبوو. لە بڵندگوێ وێستگاکەوە راگەیەندرا: شەمەندەفەرەکە یەك سەعات دوا دەکەوێ!
یەکێك لە پێشوازی کەران کە وەکو من بەبێ قەراری چاوەرێی میوانەکەی دەکرد، کەوتە بۆڵە بۆڵ و دایك و باوکی بەر پرسیارانی دەزگاکەی لە گۆڕدا هەژاند وگوتی:
– وا.. وا.. لێکراوان، تا ئێستا کێ دیوییە کە شەمەندەفەرەکانتان لە کاتی خۆی دا بگەنە جێ. کە کارەکانتان بەرێك و پێکی بۆ ئەنجام نادرێ بۆ ئەم هەموو جارە دەدەن؟
دووسێ کەسی دی کەوتنە بۆڵە بۆڵ. هێندەی نەما بوو کار بگاتە شەڕ وفەرتەنە، باش بوو هاتنی شەمەندەفەرەکە کۆتایی بە مشت و مڕەکە هێنا...
پێشوازی کەران بەرەو شەمەندەفەرەکە غاریان دا.. منیش وەکو شێت خۆم گەیاندە پەنجەرەکان، دەمویست هەرچی زووترە ئەقدەس ببینم...
لەم کاتەدا دەستێك خرایە سەرشانم و دەنگی ناسکی ئەقدەسم بەر گوێ کەوت:
– زیندە.. ئەی کوڵەکەی ژیانی من...

پێشوازی کەران لەگەڵ میوانەکانیاندا کەوتنە ماچ و موچ، بەڵام ئێمە شەرممان کرد یەکدی لە ئامێز بگرین.. ماوەیەك بێدەنگ و بێ جوڵە بەرانبەر بە یەکدی وەستاین. ئەم روانین و نیگایەمان لە هەزاران ماچ بە لەزەت تر بوو..
هەردوو جانتا و بوخچەکەم لە دەستی ئەقدەس وەرگرت، ئەم جانتایانە ئەو جیازیانەی تێدا بوو کە ئەقدەس لە ماوەی چەند ساڵدا بۆ خۆی کڕی بوونی، گوتم:
- ئەقدەس گیان بە خێرهاتی. زۆرم بیر دەکردیت.. جێیەکم بۆ پەیدا کردووی ئێژی بە هەشتە.. ئیش و کارت خواردن و خەوتنە! کارێکی ئاسان وکرێیەکی چاك.. خەیاڵت ئاسوودە بێ... پیرێژنێکی بە تەمەن نێوی ئیحسان خانمە، کۆشکەکەی لە دەردەنیلدا تاکە. تۆ دەبیت بە خاتونی کۆشکەکە.
ئەقدەس گوتی: ئەی تۆ.. کارێکت بۆ خۆت دوزیوەتەوە یان نا؟
- هێشتا نەء..
- ئەی کارتەکەی بەرجەستە بوو بە چی؟ بە کەڵك نەهات؟
- چیرۆکێکی درێژە.. کارتەکە خراپ بوو، خۆشی لە دەسەڵات کەوت. بە کرێ چووین بۆ کۆشکەکەی ئیحسان خانم، کۆشکەکە بەڵەد بووم وەلێ ئیحسان خانم نەبینی بوو. ژنێك ها و دەرگای کردەوە. پێم گوت: بە خانم بڵێ ئەو کارەکەرەی کە داوای کرد بوو هاتووە، بە ئەقدەسیشم گوت: هەمیشە سەرت لێ دەدەم.. دوو دڵۆپە فرمێسکی درشت لە چاوە رەشەکانییەوە بەسەر گونا ئاڵەکانیا هاتنە خوارێ.. بۆ ئەوەی من نەی بینم رووی وەر چەرخاند.
حاڵی منیش ئەوا هەر مەپرسە.. ئەگەر لەوە پتر ماتەڵ بوایەم جڵەوم لە دەست بەر دەبوو، ئەقدەس ئەشکەکانی دەدیم و ئابرووم دەچوو!... بەپێ بەرەو ئوتیلەکە گەڕامەوە... چونکە درەنگ گەییمەوە ئوتێلەکە رووم نەهات لە دەرگا بدەم و فەڕاشەکە بێدار بکەمەوە. ئەوشەوە لە کۆڵان نووستم و تاکو بەیانی خەونی زێڕینم بە ئەقدەسەوە بینی.. بەیانی سوورتر لە جاران کەوتمە هەڵپەی کار دۆزینەوە.. هەر ئەوەندە بم بیستایە لە شوێنێکدا کرێکاریان دەوێ بە

ڕاکردن خۆم دەگەیانده ئەوێ. هەر کەس ڕۆژنامەی بخوێندایەتەوە دەچوومە تەکییەوە و لاپەڕەی کاری بە تاڵم دەبینی و تەماشام دەکرد، بەڵام بێ سوود بوو. دەچوومە هەر شوێنێ خێرا ناسنامەیان دەویست..

هاتنی ئەقدەسیش خەمێکی تازەی بۆ پەیدا کرد بووم.. جاران دەمگوت ئەگەر ئەقدەس بێ بۆئەستەمولێ، ئەوا نزیکی خۆمەو خەیاڵم ئاسوودە دەبێ. کە چی زۆر نارەحەت تر بوو بووم. دڵم هەر لە لای ئەو بوو. هۆشم لە لای خۆ نەبوو. کۆشکەکەی ئیحسان خانم لە گەڕەکی خانەدانانی شارا بوو، لە چاخانەکەوە زۆر دوور بوو. گەر بمویستایە بچمە دیدەنی ئەقدەس کرێ ئوتومبێلکی زۆرم پێویست دەبوو منیش ئەو پارەیەم نەبوو...

ڕۆژێ لە بەیانی زووەوە کەوتمە ڕێ.. ها بڕۆ.. ها بڕۆ تا گەییشتم.. کە گەییمە بەر دەرگای کۆشکەکەی ئیحسان خانم نیوەڕۆ تێ پەڕی بوو. لە برسانا و لە شەکەتیدا پەکەم کەوتبوو. ماوەیەك بە دەوری کۆشکەکەدا سوڕامەوە. شەرمم دەکرد لە دەرگا بدەم و ئەقدەس گاز بکەم. ماوەیەك چاوەڕێم کرد بەڵکو ئەمە خوایە ئەقدەس بێتە دەرێ. لە پڕ لە پشت پەنجەرەیەکی نهۆمی خوارەوە ئەقدەسم بینی.. لە شوێنێکدا بوو پتر لە ئاشخانە دەچوو. ئەقدەسی شۆخ و شەنگم سەر گەرمی کارکردن بوو. هێندە سەر گەرم بوو تفەنگت لە پەنا گوێی دا بتەقاندبا وە ئاگا نەدەهاتەوە.. ڕواڵەتی زۆر گۆڕا بوو، جل و بەرگی لادێیی فڕێ دابوو، کراسێکی گوڵ گوڵی قۆڵ کورتی لە بەرکرد بوو. سەر پۆشەکەی فڕێ دابوو، قژە ئاوریشمیەکی شانە کرد بوو، و بە سەرشان و ملیدا هاتبووە خوارێ. کە ئەم دیمەنەم بینی هۆشم لە لای خۆم نەما. عەینی ئەو برسییەی کە کۆمەڵە خواردنێکی جۆراو جۆری گەرم و بە لەزەت ببینێ. ئاو زاییە دەمم! لە دڵی خۆمدا گوتم"چ زوو فێربوو.. مردوو مراوە وەك لە جوانی دا بێ وێنەیە وا دیارە لە کابانیش دا هەر بێ وێنەیە خوایە گیان پارەی شاییمان بۆ بڕەخسێنی..

ئەقدەس هەر سەرگەرمی کارکردن بوو. چوومە ژێر پەنجەرەکە بە ئەسپایی لە شووشەکەم دا. بەڵام ئەقدەس وە ئاگا نەهات. خەریکی کەباب برژاندن بوو. لەم

کاتـەدا تەلـەفون لێـی دا، شیـشە کەبابـەکانی لەسـەر زوخاڵەکـە بـەجێ هێـشت و بەغاردان چوو بە لای تەلەفۆنەکەوە. هێندە بە ناز قسانی دەکرد، پیاو خۆزیای پێ دەخواست!..

هەستی حەسـوودیم جولاً.. ئەگەر لـە تەنیـشت ئەقدەسـەوە بـام. لەگـەڵ هـەموو خۆشەویستییەکدا، تەلەفۆنەکـەم لـە دەسـتی وەردەگـرت و بـە عـەردیم دا دەدا..

ئەقدەس تەلەفۆنەکەی دانایەوە، بە توندی لە شووشەی پەنجەرەکەم دا، ئەقدەس ڕاچڵەکی و بە ترسەوە ڕوانییە پەنجەرەکە، هەر کە بینیمی هاواری کرد:

– زینده هەی کۆڵەکەکەی ژیانم ئەوە لە کوێی؟

بە پەلـە دەسـتی بـە بـەر هەڵبێنەکـەی سـڕی و هاتـە لای پەنجەرەکـەوە و گـوتی: چۆنی حەیاتم.. زۆرم بیر دەکردیت.

منیش بە ڕادەیەك شڵەژا بووم، زمانم چووە کلیلە. ئەقدەسپرسـی: بـۆ داماویت؟ وەرە ژوورەوە. وەرە ژیان و خۆشی من.

بە ئیشارەی دەست دەرگـای چوونە ژوورەوەی نیشاندام و خۆشـی بـە ڕاکـردن هات کە دەرگاکە بکاتەوە. بە نابەدڵی بەرەو دەرگاکە چووم. کە چوومە ژوورەوە پرسیم: خانم پێی ناخۆش نییە؟

– نەء.. هێشتا لە جێگادایە.. جگە لەوەیش کەس لە ژووری نییە!

چـووینە ئاشـخانەکەوە، ئەقـدەس دەسـتی بـە کـارکردن کـردەوە، وەکـو مەکینـە ئیشی دەکرد.. لـە لایـەك فشەی مەنجـەڵی هـەڵم بوو، لـە لایـەکی دی چـزە چـزی کـەباب بـوو، لـە لایـەکی دییـەوە دەنگـی ماشـینی جل شـۆری بـوو، ئیـدی هـەر مەپرسە. گوتم:

– ڕوحە گیان دەیقەیەك ئەم دەنگە دەنگانە خامۆش بکە، چەند قسەیەك بکەین.

گوتی: ئاخر دەبێ فراڤینیان بۆ ساز بکەم.. تۆ قسە بکە من گوێم لێتە..

– ئاخر گیانەکەم چما دەکرێ چاوت لە کار وگوێت لە یار بێ؟!

ئەقدەس بزەیـەکی عاشـق کوژانـەی بـۆ کـرد وگـوتی: بۆنـابێ؟! قسە بکـە حـەیاتم تامەزرۆی ژنەوتنی دەنگتم..

پرسیم: لە ئیشەکەت رازیت؟

- زۆر ئاسودەم.. چ خەمێکم نییە تەنیا دووری تۆ نەبێ.. تەنیا خەمی من جودایی تۆیە.

سەری داخست. لەو دەمەدا کە دلۆپە ئەشکێك لە چاوە جوانەکانی دەچۆڕا گوتی: حەیاتەکەم!

- بلێ گیانەکەم.. چیت دەوێ؟

- دەمەوێ شتێکت پێ بلێم..

- هەر یەك شت... دەبلێ.. بڕبڕەی پشتم..

- دەترسم بابم بە شوێنەکەم بزانێ.. بێن و بمبەنەوە بۆ گوند.. توبی خوا زوو بمبە لای قازی و مارەم بکە...

جا من چیم پێ دەگوترێ؟.. قسەی ماقوڵی دەکرد، قژە ئاوریشمینەکەیم لادایە لاوەو گوتم: رۆحەکەم.. هەموو هەوڵ و رەنجێکی من هەر بۆ ئەمەیە.. بەڵام تا ناسنامە وەرنەگرم قازی مارەت ناکات..

ئەقدەس هەر بەو دەقەوە کە سەرگەرمی کارکردن بوو، چ وەڵامێکی نەدایەوەو کەوتە گریان..

زۆری نەما بوو دڵم پڕ بێ و فرمێسك بە چاوانمدا بێتە خوارێ. بە تۆبزی جڵەوی خۆم گرت و گوتم: زۆری نەماوە.. لەم رۆژانەدا دەم دەنێ. بۆنی خواردنەکان بە سەرما هات.. لە برسانا دڵم زەحفی دەکرد. ئەقدەس وەك بلێی هەستی کرد کە لە دوێنێوە نانم نەخواردوە، گوتی:

- با تۆزێ خواردنت بۆ دابنەم و بیخۆ.

- ناخۆم.. تێرم.. کە بۆ ئێرە هاتم نانم خوارد.

چونکە نەمدەتوانی لەوەی پتر خۆم بگرم، هەستام و گوتم:

من دەڕوم.. ئیشەڵلا چەند رۆژێکی دی هەواڵی خۆشت بۆ دێنم. جاری سێیەم کە چوومە دیدەنی ئەقدەس، ویستی پارەم بداتێ.. بە دڵسۆزییەوە گوتی: من پارە چی لێ بکەم.. وەرە پارەکانمت دەدەمێ بۆم هەڵگرە..

بەلام لێم وەرنەگرت. بەو هەموو بێ پارەییەوە دڵم نە دەهات دەست بۆ پارەی ئەو بەرم.
پێنج-شەش مانگێك بەسەر کارکردنی ئەقدەس دا تێ پەڕی. هاوشارییەکەم کە لە ژوورەکەی ئەو دا دەنووستم دەستی بەپرتە و بۆڵە کرد. هەمیشە دەیگوت بۆچ پارە لە ئەقدەس وەرناگری کە قەرزەکانتی پێ بدەیتەوە؟.. هەقیشی بوو زۆری قەرزار بووم، بەڵێنم بە هاوشارییەکەم دا کە لە ماوەی چەند رۆژێکا قەرزەکانی بدەمەوە.
عەسرانێك بێ تاقەت و بێزار لە چاخانەکەدا دانیشتبووم و بیرم لە ئاقیبەت و ئەنجامی خۆم دەکردەوەوە. یەکێك لە مشتەرییە هەمیشەییەکانی چاخانەکە ئاشنایەتیم لە گەڵیدا پەیدا کرد بوو هات لە تەکمەوە دانیشت و دەستی بە شۆخیان کرد: ئەوە چیتە؟.. فلانی دەڵێی گەمی یەکەت غەرق بووە؟!
گوتم بریا سەدان گەمیم دەبوو، و غەرق دەبوون. کلۆڵی من گەلێك لەوە گەورەترە!
بێ ئەوەی ئەو پرسیار بکات، هەموو شتێکم لە نووکەوە بۆ گێرایەوە. کە تەواو بووم، گوتی: برا گیان وەك هەست دەکەم تۆ پیاوێکی ئابڕومەند وچاکیت.. دەمەوێ خزمەتێکی وەهات بکەم کە تا ماوی هەر دوعای خێرم بۆ بکەیت..
گوتم: نۆکەرتم.. هەر کارێ بڵێی من حازرم.. تەنیا لەم بەد بەختییە قوتار بم چیدیم ناوێ.
- من دەمەوێ کارێکی هاوبەشت لەگەڵدا بکەم، کارێکی واکە لە ماوەیەکی کەمدا حسێبی پارەی خۆت نەزانیت.
گوتم: چ کارێ؟
- لە گەڕەکێکی قەرەباڵغ دا دوکانێکی میوە فرۆشی دەکەینەوە. من وەستای ئەم کارەم. کەسێ نەمرێ دەی بینی.. بەردی شەقامەکان دەکەمە سەبەتە میوە و لە بری کاڵەك و شوتی بە خەڵکی دەفرۆشم! ئەم کارە بەر لە هەموو شتێك زمانی لووسی دەوێ.. باوەڕناکەم لەم رووەوە کەس گرە و لە من بەرێتەوە. هیچم لە تۆ

ناویّ، هەموو کارەکان خۆم دەیکەم.. ریّزو پارەش بۆ تۆ، وەك گوتویانە کاسبکار خۆشەویستی خوایە.. قسەکەیم بڕی و گوتم: کاکە گیان من چەند جاری تریشم پیّ گوتوویت کە ناسنامەم نییە...

– قەیدی نییە، تۆ نیتە خۆ من هەمە! کریّی دوکانەکە بە ناوی منەوە دەنووسین! مۆڵەتی کاسبی کردنەکەش بە نیّوی خۆمەوە دەردەکەم.. ئەمە گرنگ نییە.. تۆ کاری ژمیّر یاری ئەنجام بدە.. پارەکان وەربگرە.. لە دڵی خۆمدا گوتم: کە من پارە وەربگرم ئیدی یارۆ ناتوانیّ فیّڵم لیّ بکات..

گوتم: زۆرباشە.. حازرم.

یارۆ هەڵوەستەیەکی کرد و گوتی: بەڵام سووکە دەستمایەیەکمان دەویّ.

کە ئەمەم ژنەوت داچڵەکیم و گوتم: چەندیّ

زۆرمان ناویّ سیّ هەزار لیرەیەك بەسە.. بەم سیّ هەزار لیرەیە سی هەزار لیرە وەدەست دەخەین. لەم رۆژەدا سیّ هەزار لیرە هەر پارە نییە.. هەر کە دوکانەکەمان کردەوە ئەوسا بە چاوی خۆت دەبینی کە چۆن پارە پەیدا دەکەم. تۆ لە سەر دەغیلەکە دانیشە و پارە بژمیّرە. کارەکانی دی هەمووی لە ئەستۆی من..

بیرم لەوە کردەوە کە هەندیّ پارە لە ئەقدەس وەربگرم.. چەندم لیّ پاڕایەوە کە پارەکەی بۆ هەڵگرم، کە چی قەبوڵم نەکرد. بەڵام خۆ ئەگەر کاسبی پیّوە بکریّ چ عەیبیّکی هەیە.. بە قەرز لیّی وەردەگرم. کوڕە هەر دەیکەم بە شەریك.. لە شەریکەکەمم پرسی: دەتوانم ناسنامەش وەربگرم؟

– بەڵیّ.. کە بوویت بە خاوەن پارە، ناسنامە زۆر ئاسانە.. لە بری ناسنامەیەك دەتوانی سییان وەربگری!

لە خۆشیاندا ئۆقرەم نەبوو.. دەمویست باڵ بگرم و بفڕم. ریّگای کۆشکەکەی ئیحسان خانم چوار سەعاتە، من بە سیّ سەعاتان تەقەم لیّ هەستاند. سەیرم کرد ئەقدەس دیسان لە ئاشخانەکەدا خەریکە.. کە بینیمی بەرەو پیرم هات، دەستی

لە ملم کرد، ماچی کردم وگوتی: حەیاتەکەم.. رۆحەکەم.. چ خێرە؟ زۆر شادیت؟ ناشێ مژدەی خۆشت پێ بێ.

– هەر مەپرسە ئەقدەس گیان.. بە ساقە.. نازانی چ مژدەیەکی خۆشم پێیە.

– خێراکە قسان بکە، دڵم بوو بە ئاو..

قسەکانی شەریکەکەم بۆی گێڕایەوە.. کە گەیمە سەرپارە و دەست مایە زمانم بەسترا، بە دەمە لاڵکێوە گوتم: تەنیا.. تەنیا..

کە من بێدەنگ بووم، ئەقدەس پرسی: تەنیا چی؟ بڵێ...

بێ ئەوەی سەر بەرز بکەمەوە گوتم: تەنیا سووکە دەست مایەیەکم دەوێ...

ئەقدەس نەیهێشت قسەکانم تەواو بکەم.. بەڕاکردن رۆیی و گەڕایەوە.. کیسەیەك پارەی هێناو لە بەر دەستم هەڵی رشت، پارەکەم ژمارد ٤/٥٠٠ هەزار لیرە بوو گوتم:

– ئەو پەڕی دوو هەفتەی دییە، ئەم پارەیەت دەدەمەوە.

ئەقدەسی خۆشەویست گوتی: بیدەیتەوە یان نا گرنگ نییە.. تەنیا مارەکردنەکەم بە لاوە گرنگ و مەبەستە. دەترسم بابم شوێنەکەم بدۆزێتەوە و بێ بە تۆبزی بمباتەوە.

– نیگەران مەبە حەیاتەکەم.. زۆری نەماوە دوکانەکە بکەوێتە ئیش. هەر کە بووم بە خاوەن پارە ناسنامە وەردەگرم و دەست بەجێ دەچین بۆ لای قازی...

ئەقدەس بە چاوی پڕ لە گریانەوە گوتی: بە تەمای خوا..

یەکسەر گەڕامەوە بۆ لای شەریکەکەم، سێ هەزار لیرەم دایە ئەو، و باقییەکەیم لە لای خۆم هەڵگرت. سێ هەزار لیرەکە بەشی نەکرد، دوای چەند رۆژێکی دی پارەکەی تریشم دایێ. کە دوکانەکە تەواو بوو شەریکەکەم گوتی: چاکتر وایە لە پێشا کارتی شەریکایەتی بنووسین. گوتم: برادەر بەڵێن و نووسینی من یەکە.. بەڵێن لە لای ئێمە هی پیاوانە و لە ئابڕوو ناموس بە نرخترە. من تۆم قەبوڵە و پێویست بە کارتی شەریکایەتی ناکات.

بۆیە ئەمەشم دەووت، چونکە تاقە دینارێکمان بۆ نەما بوەوە. بەڵام شەریکەکەم نەهاتە ژێر بارو گوتی:

– نا.. دۆستی ئازیز. دنیا مان و نەمانە.. نابێ پشت بە هیچ شتێکی ئەم دنیا دونە ببەسترێ. مرۆڤ نازانێ تا سەعاتێکی دی دەمێنێ یان نا. من نامەوێ گوناح بارببم و هەقی خەڵکیم بکەوێتە ئەستۆ.. تا کارتی شەریکایەتی نەنووسین من دەست بە کارەوە نادەم. سەیرم کرد نە ئەو دەست بەردار دەبێت و نە پارەشمان هەیە. ناچار چوومەوە بۆ لای ئەقدەس و مەسەلەکەم بۆی گێڕایەوە. هەندێکی دی پارەم لێ وەرگرت.. چووینە لای عەقد نووسێك و قەرارێکی چاکی بۆ نووسین، هێشتا دەقی کارتی شەریکایەتی یەکەم لە یاد ماوە:

بەم شێوەیەی خوارەوە قەراری نێوان زیندە وسالم رێك خراو هاتە مۆرکردن.. مۆڵەت نامەی موغازەکە و مۆڵەتی کاسبی بە نێوی کاك سالم دەبێ بە شایەتی فلان.. و فلان. دەرامەت و داهات لە نێوانیاندا برابەش دەبێت بە شایەتی فلان و.. فلان.

هەردووکمان پایینی عەقدەکەمان ئیمزا کرد.. شەریکەکەم وێنەیەکی لێ هەڵگرت و منیش وێنەیەك. دەستمان خستە نێو دەستی یەکدی و عەقد نووسەکە گوتی:

– خوا خێرو فەڕتان بە سەردا ببارێنێ.

بۆ سبەینێ دەستمان بە کارکرد.. میوە و سەوزەمان خستە دوکانەوە.. بەو شێوەیەی کە شەریکەکەم گوتبووی کەوتینە کار، شەوانە دوای داخستنی دوکانەکە تا ماوەیەك پارەمان دەژمارد. بە راستی پارە ژماردنیش خۆشە، هەمیشە شوکرانەی خوام دەکرد. و لە بیری ئەوەدا بووم زووتر هەندێ پارە پێکەوە بنێم و بە بەرتیل ناسنامەیەك دەربێنم. بەڵام شەریکەکەم رازی نەبوو دەست لە پارەکان بدەین. دەیگوت: پێویستە پتر پەرە بە دوکانەکەمان بدەین تا سوودمان پتر بێ، هەقی بوو کاسبکار تا دەست مایەکەی زۆرتر بێ قازانجی پتر دەبێ.

بنی پێڵاوەکەم کون بوو بوو، کراسەکەم پارچە پارچە بوو بوو، و خەریك بوو بکەوێتە خوارەوە. بەڵام لە بەر کاسبی ئاگام لێ نەبوو، شەوو ڕۆژ کارم دەکرد، بە ئومێدی ڕۆژێکی خۆشتر، هێندە سەرم قاڵ بوو تەنانەت ماوەی سەردانی ئەقدەسیشم نەبوو. ئەقدەسی خۆشەویست خەمی منیشی هەڵدەگرت، هەفتەی سێ جاران مۆڵەتی لە خاوەن ماڵەکەی وەردەگرت و دەهات بۆ دوکان و بە دڵسۆزییەوە پێی دەگوتم:

– خوا قوەتت بدا.

بە قسەکانی ئەو هێندەی دی گەرم دەبووم. هەمیشە لە کاتی خوا حافیزیدا بە چاوی پڕ لە گریانەوە دەیگوت:

– مارە بڕینەکە فەرامۆش مەکە، بابم کۆمەڵێکی بۆ ئەستەموڵ ناردووەو کون بە کون بە شوێنم دا دەگەڕێن.

دەمگوت:– ئازیزەکەم خۆ خۆت دەبینی کە کارەکەمان خەریکە دەق دەگرێ.. کەمێکی دی سەبرم لێ بگرە و دان بە خۆتا بگرە.

چەند مانگێکی دی تێ پەڕین.. ئەقدەس خەریك بوو سەبری نەمێنێ.. خۆشم وردە وردە نیگەران دەبووم. دوو سێ جار بە شەریکەکەم گوت: با دانیشین حیسابێك بکەین و هەندێ پارە لا دەینە لاوە... دەمویست جل و پێڵاو بکڕم و تەگبیرێکی ناسنامەکەم بکەم.... بەڵام شەریکەکەم هەمیشە ئەمڕۆی بە سبەینێ دەسپارد. تا ڕۆژێ بەیانی زوو چووم بۆ دوکان، قفڵەکانم کردەوە، دەڕابەکەم هەڵدایەوە. وای خوایە چیم بینی! دوکانی رووت و قووت، هەموو شتەکان برابوو، وەکو شێت دەستم بە داد و بێداد کرد: موسڵمانان فریام بکەون دوکانەکەیان بڕیوین.

دراوسێ دوکانەکان کە گوێیان لە داد و هاوارم بوو بە ڕاکردن بەرەو دوکانەکە هاتن، قەسابێك کە دوکانەکەی بە دەستە ڕاستی دوکانەکەی ئێمەوە بوو گوتی: برادەر بە خۆڕایی دادو بێداد مەکە، مەسەلەکە نە دزەو نە فلان و نە فیسارە بە تووڕەییەوە پرسیم: ئەی کەرەستەو تفاقی دوکانەکە چی لێهاتووە؟

چاپچییەك كە بە دەستە راستی دوكانەكەمانەوە بوو گوتی:

- بەیانی زوو... هێشتا دنیا تاریك بوو، شەریكەكەت هات و هەرچییەك لە دوكانەكەدا بوو، پێچایەوەو خستییە دوو گالیسكەوەو بردی..

كابرایەكی دەلاك كە دوكانەكەی بەرانبەرمان بوو گوتی:

- من لێم پرسی: مەسەلە چییە؟ گوتی: لە شوێنێكی دیدا دوكانمان كردۆتەوە...

ئەژنۆم شكا، پشتم چەمی... دوای ئەم هەموو رەنج و كۆششە شەریكەكەم تالآنی كردم و هەر چیم هەبوو بردی... لەو كاتەدا كە دەم بۆڵاند و بە داخەوە دەتلامەوە، پۆستە چییەك هات و پرسی:

- ئەمە دوكانی سالم پاك نیازە؟

گوتم: خۆی لێرە نییە، من شەریكیم.. فەرموو چیت دەوێ؟

دەفتەرێكی هێنایە پێشەوەو گوتی: ئێرە ئیمزا بكە.

پرسیم: ئەمە چییە؟

- نامەیەكی گرنگە..

نامەكەم وەرگرت و ئیمزام كرد. كە پۆستە چییەكە رۆیی زەرفەكەم هەڵپچڕی، سەیرم كرد كاغەزی راگەیاندنی داراییە دەربارەی دەرامەت "دخل" ٢,٥٠٠ لیرەمان باج هاتبووە سەر.. ئەگەر لە ماوەی ١٥ رۆژدا نەدرێ ئەوا دەوڵەت دوكانەكەمان هەراج دەكات!

بەندییەكان تێكڕا گوتیان: نۆبەتی ئەم قەوانەیە.

ردێن سپی قاوشەكە گوتی: بێگومان تۆی گەوجیش چوویت و باجەكەت دا؟

یەكێك لە بەندییەكان لە بری زیندە وەڵامی دایەوە: نا، چ پەیوەندییەكی بە مەوە هەیە تاكو باج بدات... مۆڵەت نامەی دوكانەكە بە ناوی شەریكەكەیەوە بوو، خۆ كەر نەبووە باجەكەش بدات...

زیندە وەڵامی دایەوە: نەخێر وانییە، ئەگەر باجەكەم نەدابا دوكانەكەم لە كیس دەچوو. چونكە كەم دابێژێك كاسبی فێر بوو بووم بڕیارمدا بە خۆم دوكانەكە

بكەمــەوە. دیــسانەوە چــووم بــۆ لای ئەقــدەس هەرچــی پارەیــەكی هــەبوو لــێم وەرگرت، لە پێشا باجەكەی دەوڵەتم دا. ئەوجا شتومەكم بۆ دوكانەكە كڕی و بۆ جاری دووەم بە دەهۆڵ و زوڕناوە دوكانەكەم كردەوە، كارم لە جاران گەلێ چاكتر دەڕۆیی.. خەڵكی گەرەكەكە كە بە مەسەلەكەیان زانی بوو هەر وەكو یارمەتی هەموو شتێكیان لە من دەكریێ. هێندە سەرم قاڵ بوو نام پەرژا سەری خۆم بخورێنم. ئەگەر كار وا بڕۆیشتایە لە ماوەی دووسێ مانگ دا جێی زیانەكەم پڕ دەبوەوە، خەرجی ناسنامەكەشم دەردەچوو. بەیانییەكی زوو پاسەوانێك لە پۆلیسخانەوە بە شوێنم دا هات و گوتی: زەلامێك شكایەتی لێ كردویت كە بە بێ پرس دوكانەكەیت بە كارهێناوە.

بەندییەكان بە یەك دەنگ گوتیان: نۆبەتی ئەم قەوانەیە!

زینـدە كـە ئـەم بیرەوەییـە تاڵانـەی وە یـاد هاتنـەوە، ئیـدی نـەیتوانی درێـژە بـە حەكایەتەكەی بدات، چونكە كات لە نیوە شەویش تێ پەڕی بوو، بڕیاریان دا سبەی شەو پاشماوەكەیان بۆ تەوا بكات.

## (١١) ناسنامەكەت نیشان بدە و كڵاوەكەت وەربگرەوە.

لـە كارخانـە جـۆرا وجۆرەكـانی زینداندا ئـیش هـەبوو بـۆ هـەموو ئەوانـەی دەیانویست كار بكەن، تەنیا زیندە نەبێ. ئەم نەگبەتە تەنانەت بۆی نەبوو بایی خـەرجی خۆشـی كـار بكـات، چییە ناسـنامەی نـەبوو! نـەیان دەتـوانی نێـوی لـە لیستەكاندا بنووسن و رۆژانەی بدەنێ. زینـدە زۆر بەمـە سـەخڵەت بـوو، پێـوەی دەتلایەوە. یەكێك لە بەندییەكان كە نانە رەقی دەخوساند و دەیكرد بە هەویر وپەیكەری لێ دروست دەكرد گوتی: برام خەم مەخۆ، لـە سبەیەوە وەرە لای خـۆم كار بكە و رۆژی سێ لیرانت دەدەمێ.

-چی بکەم؟
- نانە رەقم بۆ بجوەو بیکە بە هەویر.. و رۆژانەی خۆت وەربگرە.
زیندە تێك چوو.. بە تورەییەوە گوتی: بچۆ ئەو پارەیە بدەت بە پورت.
بەندییەکان خۆشییان لەم حازر وەلامییەی زیندە هات و دەستیان بە پێکەنین کرد. ردێن سپی قاوشەکە گوتی: بابە گیان تۆ حەکایەتی خۆت بکە، ئێمە خۆمان مشورت دەخوێن.
دەنگی شاوری مامورە کورتە بنەکە بەرز بووەوە.. دەی کورینە بۆ ژوورەوە. زیندە بەر لە هەموویان چووە ژوورەوە.. لە سەر جێگاکەی راکشا ئەو شەوە نانیشی نەخوارد. بەندییەکان کە هەستیان بە نیگەرانی ئەو کرد بوو زۆریان لێ نەکرد کە حەکایەتیان بۆ بکات. هەر کەسەو خەریکی کاری خۆی بوو. یەکێك سەرگەرمی فلوت لێدان بوو، یەکێکی دی هێدی هێدی کەوتە گۆرانی چرین. سێبەری خەم و پەژارە باڵی بە سەر ژووەکەدا کێشا بوو.. ردێن سپی قاوشەکە گوتی:- زیندە، زۆر بیرمەکەوە، خوا یەکە ودەرگای هەزار.زیندە هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی:- هێ.. ی.. ی بابە دەرگای من هەر زیندانە.
- نە گیانی من.. نابێ پیاو لە رەحمەتی خوا نائومید بێ.. ئەوی لە خوا خافڵە کافرە..
بەندییەکی دی گوتی:- بەم زووانە دەرگایەکی دی لە زیندە دەکرێتەوە، ئەویش دەرگای شێت خانەیە..
هەموو بەندییەکان، تەنانەت زیندەش کەوتنە پێکەنین. خەمی ژوورەکە رەوییەوە. چای چییەکە، چای بە سەر بەندییەکاندا دابەش کرد.. جگەرە پێکرا و زیندە دەستی بە حەکایەتەکەی کرد: بەڵێ برادەران، شەریکە نامەردەکەم، چونکە دەیزانی من ناسنامەم نییە شکایەتی لێکردم کە گوایە من کابرایەکی ساختە چیم و سوودم لە ناوی شەهێدێکی مەزنی جەنگ وەرگرتووە.. بۆ خۆی دوکان و موغازەکەی لێ ستاندمەوە. هێندە پەریشان بووم، لە داخانا لە جێدا کەوتمو دوو-سێ هەفتە بێ هۆش بووم.. کە هاتمەوە هۆش و دەستم بە سەرما

هێنـا، سـەیرم کـرد قـژم وەکـو گـەڵای خـەزان دەوەرێ و دەکـەوێ! دیـار بـوو نەخۆشییەکە کاری کرد بووە سەر قژم! بەو پێیە بڕۆیشتایە لە ماوەیەکی کەمدا کەچەڵ دەبووم. بەد بەختییەکی دی یەخەی گرتم، ئەویش پـژمین بـوو، هەر کە بە ئاستەم سەرما لێی بداما یە دەپژمیم.. خوایە تووشی دوژمنیش نەبێت. هێندە بە توندی دەپژمیم ئازای گیانم دەکەوتە لەرزین.. هیچ دکتۆرێ پـەی بـەم دەردەم نـەبرد. خوایـە زۆر شـوکر کـە هێـشتا لـەم وڵاتـەدا پیـاو چـاك هـەن. یـەکێك لـە مشتەرییەکانی چـاخانەکە لـە گیـا کێویلـە دەرمـانێکی بـۆ دروسـت کـردم کـە قـژ رووتانـەوە و پژمینـەکـەمی پـەڕانـد.. و ئاموژگـاری کـردم: دەبـێ لەمـەو دوا کـڵاو لەسەر بکەیت و ئاگادار بی کە هەرگیز سەرمات نەبێ..

خێرا کاسـکێتێکم کـڕی و لـە سـەرم کـرد.. کـە تـەواو چـاك بوومـەوەو هەسـتامەوە کەوتمە گەڕان بە دوای کاردا.. بە نانە سکیش رازی بووم، ئامادە بووم هـەموو جۆرە کارێك بکەم، بەڵام کوا کار؟ کرێکاریش ناسنامەی دەویست.. پەنام بردەوە بەر هاوشارییەکەم، دڵی پێم سووتاو گوتی:

– یـەکێك لـە هاوشـارییەکانی خۆمـان لـە فـڵان دایەرەیـە بـچۆ کـن ئـەو لەوانەیـە کارێکت بۆ بدۆزێتەوە.

بـە نـە بەدڵییـەوە گـوتم: ئـاخر بـرادەر دەبـێ دەرگـاوانێکی دێهـاتی چ کـارێکی لـە دەست بێ؟ چۆن دەتوانێ کار بۆ من بدۆزێتەوە؟

هاوشارییەکەم پێکەنی وگوتی: چما دەرگاوانت پێ کەمە.. نا نا گیانە تۆ ئاگادار نیـت، هەنـدێ جـار دەرگـاوان لـە سـەرۆك دایەرەیـەك پـتر دەسـتی دەڕوات.. دەرامەتی مانگانەی هەندێکیان لە سەرۆکەکانیان پترە...

گوتم: شۆخی مەکە کاکی خۆم.. تاقەتی پێکەنینم نییە..

– شۆخی ناکەم بە خـوا.. کە خانەدانێ دەچـێ بۆ دایەرەیـەك لـە پێشا جـەنابی دەرگاوان دەبینێ ئەوجا سەرۆك دایەرە!

گوتم: هەڵبەت لە پێشا دەرگاوان دەبینێ.

– کەواتە قسەکەی من راستە.. ئەدی بۆ خۆت گێل دەکەیت و مۆڕەم لێ دەکەیت؟!

– مەبەستت چییە؟ بە خۆت باسی بکە.

– ها.. ها.. ه.. ه.. فەرمانبەری دەوڵەت یان سەرۆك دایەرە بۆ ئەنجامدانی کاری مەردم هەق و حیسابێکیان دەوێ. سەرۆك دایەرە بەو هەموو کەش و فشەوە ناتوانێ راستەو خۆ بەرتیل و شت وەربگرێ.. هەرگیز خۆشی بچووك و کەم نانوێنێ.. چونکە کەسێتیی کەم دەکات.. چما پێت وایە دەوڵەت لەبەرچی دەرگاوانی لەبەر ژووری سەرۆکان داناوە؟ پێت وایە هەر لەبەر دەرگا کردنەوەو چا هێنان ئەم پارە مۆڵەیان دەداتێ؟ نەخێر.. چما سەرۆکەکان خۆیان دەستیان نییەو ناتوانن دەرگای ژوورەکانیان بکەنەوە؟.. کەواتە دیارە کە بوونی دەرگاوان لەبەر ژووری سەرۆکان دا بۆ مەبەستێکی فرەگرنگە.. گەوجە گیان هێشتا ماوەتە ماو! چیم دەووت؟ ئا دەرگاوانەکان بە ناوی سەرۆك دایەرەکانەوە بەرتیلەکە وەردەگرن وەك ئەوەی سەرۆك هەر ئاگاشی لێ نەبێ! هەڵبەت یەکێك کارێکی گەورەی بە هەندێ پارە بۆ رایی ببێ بە حوسن و رەزای خۆی دەیدات و زۆریش منەتبار دەبێ.

کە زیندە ئەم قسانەی دەکرد، یەکێك لە بەندییەکان گوتی:

– ئای یادت بەخێر حەسەنە رەش.. پیشەی ئەمە بوو. کام گیروگرفت زۆر گەورە بوایە بە کەفلە کونێ چارەی دەکرد.. ئەگەر بچوویتایەتە لای ئەو لە بری ناسنامەیەك دەناسنامەی بۆ جێ بەجێ دەکردیت.

زیندە زۆری حەز دەکرد کە ئەدرەسی ئەم حەسەنە رەشە بزانێت تا کە لە زیندان ئازاد بوو بچێتە لای، بەڵام ئێستا وەختی ئەم کارە نەبوو، بۆیە لە سەری رۆیی:– بڕیارم دا بچم بۆ لای ئەو هاوشارییەم کە دەرگاوان بوو.. ئەگەر ئەوم پەیدا بکردایە دەست بەجێ کارەکەم چێ دەبوو. ئەدرەسەکەیم وەرگرت و کەوتمە ڕێ. هاوشارییەکەم لە دواوە گازی کردم: راوەستە بزانم، ئەم کاسکێتە پیسە چییە لە سەرت؟ فڕێی بدە.

- بۆ؟ چ عەیبێکی هەیە؟
- ئەگەر بەمەوە بت بینن هەر لە دەرگاوە دەرت دەکەن.
گوتم: ئەگەر فرێی بدەم پژمینەکە دەمگرێتەوە.. کە گەییمە بەر دەرگای دایەرە، دای دەکەنم.
- نابێ.
- بۆ نابێ؟!
- ئەگەر کڵاوێکی پاك و پوختەت لەسەر بێ هەموو وا هەست دەکەن کە پیاوماقوڵی و... ئەی گوایە چیرۆکی کەواکەی مەلای مەزبورەت نە ژنەوتووە؟ پێشینان گوتوویانە ئەقڵی مەردم لە چاویاندایە، پێویستە کڵاوێکی چاك بکڕیت و لە سەرتی بکەیت.
کە زانی پارەم نییە، هەندێکی دامێ و گوتی:
- هانێ ئەو پارەیەت بدەمێ کە کارێکت دەست کەوت بم دەرەوە. یەکسەر بچۆ کڵاوێکی چاك بکڕەو ئەوجا بچۆ بۆ دایەرە.
پارەکەم وەرگرت و رووم کردە موغازەیەکی کڵاوفرۆشی. کڵاوی جۆراوجۆر لە پشت جامخانەکەوە دانرا بوو.. یەك لە یەك چاکتر وەڵێ هێندە گران بوون زاتم نەکرد بچمە ژوورەوە.. ئەو پارەیەی پێم بوو سێیەکی نرخی کڵاوێکی نەدەکرد. ئیدی بۆ بەرۆکی خاوەن موغازەکەش بگرم؟
بەو دەقەوە لە پشت جامخانەکەوە وێستام و کەوتمە روانینی کڵاوەکان، بە خەیاڵ یەکە یەکە کڵاوەکانم لە سەر دەکرد و لە شووشەی جامخانەکەدا سەیری خۆم دەکرد. لەم لاوە دەچوومە ئەو لا وەك ئەوەی کڵاوی یەکەمم بەدڵ نەبێ و دووەم تاقی بکەمەوە.. یەکێ لە کڵاوەکانم زۆر لێدەهات. هاوشارییەکەم دەیگوت: ئەگەر پیاو یەکێك لەم کڵاوانەی لەسەر بێ هەموو کەس کڕنۆشی بۆ دەبەن. ئەگەر برسیم نەبوایە تا ئێوارە هەر لەوێ دا دەوێستام. زۆرم حەز لە کڵاوەکە کرد بوو. لە برسانا سەری خۆم هەڵگرت، چەند شەقاوێ لەو لاترەوە

زەلامێك كوببەی دەفرۆشت، گوتم:- كاكە گیان نەفەرێكم بۆ ساز بكە، با پیازیشی تێدا بێ..

لەو پارەیەی كە هاوشارییەكەم دا بوومێ، سكم تێركرد.. لەسەر تێری پیاو كڵاوی چاك لە سەر بكات شەڕ دەفرۆشێت.. بە كرێ چووم بۆ بازاڕی كۆنە فرۆشەكان. هەرچیت بویستایە لەوێ هەبوو.. لە تەوقەی سەری ژنانەوە بیگرە تا دەگاتە ددانی دەست كرد، تەنانەت بێوەژنیش دەست دەكەوت.

كڵاوی نیوداشت یەكجار زۆر بوو.. ئەو كڵاوەی كە مەبەستم بوو دۆزیمەوە. یەك عەیبی هەبوو دووسێ نمرە گەورە بوو.. بەڵام چونكە كڵاوی چاك بوو گوێم بەو عەیبەشی نەدا. بۆ ئەوەی هەرزانتر بیكڕم بە فرۆشیارەكەم گوت: كاكە بە سەرم گەورەیە!

فرۆشیارەكە سەری لە قاند و گوتی:- تەواو بە ئەندازەی سەرتە!

- بابە گیان هاتۆتە سەر ملم.. گەورەیە.

فرۆشیارەكە هەندێ لە هاوكارەكانی گاز كرد: توخوا تەشریف بۆ ئێرە بێنن، ئەم كڵاوە بە سەری ئەم برادەرە دەڵبە یان فیت بە ئەندازەی خۆیەتی!

هەموو وەڵامیان دایەوە:- بەخوا زۆر رێك وپێكە، هەر دەڵێی بۆ ئەو كراوە.

چاویشم كەوتبووە ژێر كڵاوەكەوە، بە چاوی بەستراوەوە گوتم:

- بۆ سوێند دەخۆن و شایەتی ناهەق دەدەن؟ ئەوەتا چاویشم كەوتۆتە ژێر كڵاوەكەوە، هیچ شوێنێ نابینم.

یەكێك لەوان گوتی:- كەرپیاو گریمان چاوت بە دەرەوە بوو، جا چی دەبینی؟ لەم وولاتە وێرانەدا چی هەیە تا بیبینی؟ چاكتر كە هیچ نەبینی!

فرۆشیارەكان لە قاقای پێكەنینیان دا. یەكێكیان بە چپەوە گوتی:

- برادەر كڵاوی چاكە و لە كیسی خۆتی مەدە..پەشیمان دەبییەوە..

گوتم:- من چ گلەییەكم لە چاكی نییە.. ناڵێم خراپە .. بەڵام چاوی داپۆشیوم و هیچ شوێنێ نابینم..

یەكێك گوتی: لە ئاستی چاوتەوە دوو كونی تێ بكە!

دیسان سەدای قاقا و پێکەنینی فرۆشیارەکان لە کوچەکەدا دەنگی دایەوە. دیار بوو لە بێ کاری خۆیاندا لە من خڕ بوو بوونەوە. کاتی خۆیان بە شۆخی دەگوزەرێنن!!

فرۆشیارەکە گوتی: لە پشتەوە تۆزێ دای بگرە، تا لە پێشەوە بەرز ببێتەوە.

ئەوجا هەر خۆی لە دواوە گرتی و بە توندی دای تەکاند، چاوەکانم لە ژێر کڵاوەکەوە دەرکەوتن، ئەم لاو ئەو لای خۆم بینی...

فرۆشیارەکە گوتی: مەخابن بۆ ئەو نانەی تۆ دەیخۆیت.. نازانی کڵاوش لە سەر بکەیت؟!

گوتم: دەیزانم.. وەڵێ کڵاوەکە گەورەیە!..

– نە بابە گیان، خۆت سەرت بچووکە، ئەگینا ئەم کڵاوە چ عەیبێکی نییە، سەیری بکە ئیتاڵییە، لە دنیادا لە کڵاوی ئیتاڵی چاکتر نییە. لەم رۆژەدا کڵاوی وا بە پێنج سەد لیرەش دەست ناکەوێ، هەڵی بگرەو دوعای خێرمان بۆ بکە.

دوای چەندو چوونێکی زۆر کڵاوەکەم کڕی، لەسەرم کردو ملی رێگام گرت. لە رێگادا هەمیشە سەیری جامخانەی موغازەکانم دەکرد. دەمویست بزانم کڵاوەکەم لێ دێت یان نا... لە پڕ گەردەلوولێك هەڵیکرد کڵاوەکەی بردم و لە ناوەندی شەقامەکەدا گیرسایەوە.. ئۆتۆمبیلیش وەکو شارە مێروولە لە هاتوچۆدا بوو لەبەر خاتری کڵاوەکەم خەریك بوو بکەومە ژێر ئۆتۆمبیلەوە.. کڵاوی ناڕەسەن وەکو فڕۆکە دەخولایەوە و منیش بە دوایا غارم دەدا.. خەڵکی دەستیان لە کارو کاسبی هەڵگرت و سەیری من و کڵاوەکەمیان دەکردو قاقا پێدەکەنین.

ئاخری کڵاوە نازدارەکەم کەوتە ژێر ئۆتۆمبیلەوەو چرچ و لۆچ بوو. دەستم برد، کڵاوە پلیشاوەکەم لە ژێر تایەی تۆتۆمبیلێك دەرهێنا... زۆر لۆچ بوو بوو.. بە دەست لۆچەکانیم ساف کردەوەو لەسەرم کرد... سەیرم کرد زۆر دەڵبەو لەوانەیە با بیبات.

رۆژنامەیەکم پەیدا کرد.. چەند پەڕەیەکم خستە ژێر ئەستەری کڵاوەکەوە... چەند وێنەیەکیشم بۆ ناسنامەکەم گرتبوو، ئەوانیشم خستە ژێر ئەستەڕەکەوەو

لەسەرم کرد، تەواو پڕ بە سەرم بوو!...ئیدی دەستێکم هەر بە کڵاوەکەمەوە بوو تا جارێکی دیش با نەیباتەوە. بەپرسیار ئەو دایەرەیەم دۆزییەوە کە هاوشارییەکەم لەوێ دەرگاوان بوو..لەبەر دەرگادا یەکێك لە سەر کورسییەك دانیشتبوو یاری بە سمێڵەکانی دەکرد. کە منی بینی بانگی کرد: بۆ کوێ کاکە؟ سەرم لەوە سوڕما. ئەو هەموو خەڵکە هاتوو چۆیان دەکرد یارۆ هیچی ناگوت. کەچی من هەر کە پێم خستە سەر پلەکە پرسیارو وەڵام دەستی پێکرد. گوتم: هاوشارییەکم لێرەیەو دەمەوێ بچم بیبینم.

بێ ئەوەی سەیرم بکات گوتی: دەزانی ئێرە کوێیە؟.. ئێرە دایەرەی دەوڵەتە دەوڵەت!

– دەزانم... مەبەستت چییە؟

دیسان بێ ئەوەی ئاوڕم لێ بداتەوە گوتی: درۆ دەکەی... نازانی.. ئەگەر بزانی کڵاوەکەت دا دەکەنی... یاڵڵا کڵاوەکەت داکەنەو ئەوجا بڕۆ ژوورەوە.

گوتم: ئاخر بە بێ کڵاو سەرم سەرمای دەبێ...

ئەمجارەیان بە توڕەییەوە هاواری کرد: کاکە چوونە ژوورەوە بە کڵاوەوە قەدەغەیە. کڵاوەکەت لە شوێنێك دا هەڵواسە... هەوای دایەرەکە گەرمە... مەترسە سەرمات نابێ...

لە دڵم چەقی بوو کە ئەگەر کڵاوەکەم لە شوێنێك دا هەڵواسم گوم دەبێ گوتم: ئاخر کاکە گیان لەوانەیە بیبەن!

یارۆ هاواری کرد: یانی چی؟ دەزانی ئێرە کوێیە... ئێرە دایەرەی دەوڵەتە دەوڵەت! ئەگەر زێڕیش لێرەدا هەڵڕێژی کەس لای لێ ناکاتەوە چ جای کڵاوێکی چڵکن.. بە نە بەدڵی کڵاوەکەم داکەندو بە عەلاگەیەکمەوە هەڵواسی.. دیدەنییەکەم زۆری نەبرد.. کە گەڕامەوە ویستم کڵاوەکەم هەڵگرم، سەیرم کرد نەماوە، دەستم درێژ کرد لە بری کڵاوەکە چزا بە قولاپی عەلاگەکەدا!.دەستم بە هاوار کرد: وای کڵاوەکەم.. کڵاوەکەیان بردووم.. کڵاوە نازدارەکەم نەماوە.. یارۆ

کە سەر گەرمی سمێڵ بادان بوو، بێ ئەوەی لە جێی خۆی هەستێ گوتی: کڵاوەکەت چی لێهاتووە؟

– نەماوە.. ئەی بە بەرچاوی خۆتەوە بە عەلاگەکەدا هەڵم نەواسی؟

یارۆ زۆر تەنگاو بوو، و هاواری کرد: هەتیو بۆ من پاسەوانی کڵاوی تۆم؟

– ناڵێم پاسەوانیت.. بەڵام تۆ نەتگوت بە عەلاگەکەوە هەڵیواسە.. من بە قسەی تۆم کرد.. تۆخوا نەت بینی کێ بردی؟ ناشێت گاڵتەیان لەگەڵ کرد بم؟ بە خواو بە پێغەمبەر ئەوڕۆ کڕیومە... بابە گاڵتان مەکەن.. کڵاوەکەم بدەنەوە با بڕۆم.. کارم هەیە.

یارۆی سمێڵ بابڕ گوتی: بە خۆڕایی هاوار مەکە. ئێرە دایەرەی دەوڵەتە. کەسیش چاوی لە کۆنە کڵاوەکەی تۆ نییە.

ئەوجا نۆرەی من بوو کە تووڕە ببم. هاوارم کرد: ئەی کڵاوەکەم چی لێهات؟ بێگومان نەفڕیوە، هەڵبەتە یەکێك بردوویەتی.

یەکێك لەوانەی کە هەمیشە لە ڕاڕەوی دایەرەکانا کەوتوون گوتی: من دیتم....

– توخوا کوانێ؟

– چەند دەیقەیەك لەمەوبەر سواری ئۆتۆمبیل بوو و ڕۆیی!

چەند کەسێك کە گوێیان لەم قسانە بوو دەستیان بە پێکەنین کرد. کابرای سمێل بابڕ گوتی: غەڵبە غەڵب مەکەن.. هیچ شتێ لێرە گوم نابێت..

یەکێك لە بێکارەکان گوتی: – ڕاستە هیچ شتێ ون نابێ.. کە ونیش بوو ئیدی نادۆزرێتەوە.

وردە وردە خەڵکی خڕ بوونەوە، مشت و مڕەکە گەرم بوو، زەلامێك کە دیار بوو دەرگاوانی دایەرەیە پرسی: کڵاوەکەت سەوزباو بوو؟

– بەڵێ برادەر.. سەوزباوێکی تووکن. فابریقەی ئیتاڵیا بوو.

پرسی: کڵاوێکی گەورە نەبوو؟

– بەڵێ.. کوانێ.؟

– پەراوێزەکەی ڕەش بوو؟

- بەڵێ... بەڵێ خۆیەتی، کوا لە کوێیە؟

کابرای سمێڵ بابڕ گوتی: نەمگوت هیچ شتێ لێرە گوم نابێت. زەلامەکە گوتی: قەراخەکەی بۆ سەرەوە هەڵ نەگەڕابووەوە؟

زۆری نەما بوو، بەر دەمدرێژی جنێوی بدەم، بەڵام لە ترساندا زمانی خۆم گرت و بەسەر وەڵامم دایەوە.

پرسی: دوو کونی هەوا کێشانی تێدا بوو؟

دەمویست بە جنێودان دایک و بابی لە گۆڕدا بهەژێنم، بەڵام خۆم گرت "لاحەولەوەلا..." خەریك بوو لە تووڕەییدا شەقم دەبرد، هاوارم کرد: - خۆیەتی برادەر، پێم بڵێ...

- وەڵڵا من وام زانی کەسێك لە بیری چووە، بردم بۆ نووسینگە...

چوومە ئەوە ژوورەی کە کابرای فەڕاش نیشانی دابووم.. چەند کچێك خەریکی تایپ کردن بوون، تەنیا یەك پیاو لە ژوورەکەدا بوو، زانیم کە مەسئولیانە.

گوتم: - یەکێك لە فەڕاشەکان کڵاوەکەی هێناوم بۆ ئێرە..

یارۆ بە تووڕەییەوە هاواری کرد: ئاگاداری کڵاوی خۆشتان پێ ناکرێ؟

ویستم قسان بکەم، مۆڵەتی نەدام و بە یەکێك لە کچەکانی گوت:

- چیت لە وەرەقەی کڵاوەکە کرد؟

- ناردم بۆ ئەرشیف.

کچەکە چارەکە دینارێکی خستە بەینی کاغەزەکانی بەر دەستی، تا لە نێو فایلەکاندا وێنەی دووەمی وەرەقەکە بدۆزێتەوە. هێنای و دایە دەست کابرا: فەرموون.

کابرای مەسئوول وەرەقەکەی خوێندەوە: "باش گوێ بگرە.. کڵاوێکی سەوزباوی تۆکنی خارجییە.. زۆر کۆنە..دەم و دەست قسەیەکەیم بڕی": - قوربان زۆریش کۆن نییە...

مەسئولەکە بزەیەکی کردو لەسەری رۆیی: قەراخ رەش.. دوو کونی هەواکێشانی تێدا بوو... چونکە خاوەنی نەبوو، هەواڵەی ئەرشیف کراوە.

گوتم: بارەکەڵڵا لەو قەڵەم و ئینشایە.. ئێستا کوێی بۆ بگەڕێم؟
- کاغەزەکەمان بە دەرزی پێوە لکاندوەو ناردمان بۆ ئەرشیف... بڕۆ نهۆمی خوارەوە، لە ڕاڕەوەکەدا، دوا دەرگا بە دەستە چەپدا.. کڵاوەکەت وەربگرەوەسوپاسم کردو بەپەلە کەوتمە ڕێ... دوو دوو پلەکانم بڕی و ژووری ئەرشیفم دۆزییەوە، بەڵام کەس لە ژوورەوە نەبوو. ڕۆژنامەیەکیان لەسەر یەکێک لە مێزەکان دانا بوو، ئەگەر دەنگی کۆکەم نەژنەوتبا نامزانی کەسێك لەپشت ڕۆژنامەکەوەیەو خەریکی خوێندنەوەیە!
گوتم: کاکە..
ڕۆژنامەکە جوڵاو دەنگێك بەرز بووەوەو پرسی: چیت دەوێ؟
- قوربان لە نووسینگەوە، کڵاوەکەیان بۆ ئێرە ناردووم.
پرسی: - ژمارەکەت چەندە؟
وام زانی مەبەستی ژمارەی کڵاوەکەیە. یەکسەر گوتم: شەستو یەك بە تەواوی سەری لە پشت ڕۆژنامەکەوە دەرهێناو بەسەر سوڕمانەوە سەیری کردم و گوتی:
- خەیاڵت لە کوێیە کاکە... ژمارەی تۆ لە دە هەزاریش تێ پەڕیوە.
گوتم: قوربان ژمارەی کڵاوەکەم شەست و یەکە.
کاکی ئارشیفیست لە مەبەستم حاڵی بوو، و گوتی: - ژمارەی سەرم نەپرسیوویت... مەبەستم ژمارەی وەرەقەکەتە.
- من چوزانم ژمارەی وەرەقە چییە قوربان. وام زانی ژمارەی کڵاوەکەت گەرەکە!
قەدەرێ کاغەزو فایلەکانی گەڕا، شوکر دۆزرایەوە، بە خۆشحاڵییەوە گوتی: وا دیارە شانست هەیە.. کڵاوێکی سەوزباوی تووکنە..
بۆ ئەوەی پاشماوەکەی نەخوێنێتەوەو کاتەکەم بە فیڕۆ نەچێ گوتم:
- خۆیەتی .. کەرەمی بکە قوربان.
کابرا کەمێك پشت گوێی خوراندو گوتی: ناردمە خزمەت سەرۆك.
- بۆ؟

- عادەت وایە.. هەر چییەك بدۆزرێتەوە، ئێمە دەی نێرینە لای سەرۆك، ئەویش هەواڵەی عەماری دەكات.

مەسەلەكە وردە وردە قوڵ دەبووەوە، ئەدرەسی سەرۆكم وەرگرت، لە نهۆمی سێیەمدا بوو.. كە گەییمە نهۆمی سێیەم ماندوو بووم.. لە سەر پلەكان دانیشتم كە پشوویەك بدەم، پیرێژنێكیش لەوێ دانیشتبوو، چەند فایلێكی بە دەستەوە بوو... كە منی بەو حاڵەوە بینی گوتی:

- رۆڵە گیان.. تۆ چیتە؟

گوتم: پوریێ گیان كڵاوەكەم بە عەلاگەیەكدا كردبوو، یەكێك لە فەراشەكان وای زانی بوو بێ خاوەنە، برد بووی بۆ نووسینگە، ئەوانیش هەواڵەی ئەرشیفیان كردبوو، لەوێشەوە نارد بوویان بۆ لای سەرۆك.

پیرێژنەكە سەری لەقاندو گوتی: ماشەڵڵا. ئەم هەموو كارەت لە ماوەی چەندا ئەنجام داوە؟

- نیو سەعاتی نەبردووە.

- وای رۆڵە گیان تۆ چەند پیاوێكی بە شانسی.. من دوو دانە مانگە بەم قاڵدرمانەدا سەر دەكەوم و دادەبەزم، تەواوی ژوورەكان گەڕاوم كەچی هێشتا وەرەقەكەم نەدیوەتەوە. مرۆڤ تا كارتی راسپاردنی نەبێ ناتوانێ لە دایەرەكاندا كاری رایی بكات.

پێكەنیم و گوتم: راستییەكەی ئەگەر كارەكەی من، كارێكی پڕ دەرامەت بوایە تا بەرتیلم نەدابا، كەس وەڵامی نادامەوە. خۆش بەختانە كۆنە كڵاوێكەو بە كەڵكی كەس نایەت.

هەستام، چووم بۆ ژوورەكەی سەرۆك. دەرگام كردەوەو گوتم: قوربان كڵاوەكەم لێرەیە.

سەرۆك بە پێكەنین و توورەییەوە گوتی: - جا من چی بكەم.. چما ئێرە ژووری خۆ داكەندنە؟

- نەخێر قوربان.. ببوورە.. کڵاوێکی سەوزباوی تووکنە.. هێناویانەتە خزمەتی ئێوە.

پێکەنی و گوتی: ئەها.. ئەوەی لە رارەوەکەدا بەجێ مابوو؟!

- بەڵێ.. بە ئەرك نەبێ کەرەمی بکە.

- ناردم بۆ عەمار... تەشریف بەرەو لەوێ وەری بگرەوە..

- جا چ پێویست دەکات بەم پەلەیە بی نێری؟

سەرۆك زۆر تورە بوو: نازانم بە کام ئاوازی تۆ هەڵپەرم. ئەگەر سەبر بکەین دەچێتە دەرێ و لە پاشەملە دەڵێی فەرمانبەران کار ناکەن... ئەگەر زوو بە زوویش کارەکان ئەنجام بدەین ناقایلی.

گوتم: هەر دەیقەیەك لە لای خۆت دات بنایە، فریای دەکەوتم.

قیژاندی: چما ئێرە دوکانی ئەمانەت فرۆشییە؟ برۆ دەرێ و قسەی زیاد مەکە..

هاتمە دەرێ، عەمارم دۆزییەوە. نیشانی کڵاوەکەم هەڵداو گوتم:

- هی منە، کەرەمی بکەن....

عەماردارەکە پرسی: بە چییا هی تۆیە؟

- کڵاوێکی سەوزباوی تووکنە...

- جا چی زۆر کڵاوی وا زۆرە..

- ژمارە شەست و یەکە!

- ها.. بۆم دەرکەوت کە درۆ دەکەیت، سەرت بە ئەندازەی گوێزێکە و ژمارە شەست و یەك لە سەر دەکەیت!

- کاکە گیان تۆ هەقت چییە، سەرم بە قەد گوێزێکە یان بادەمێکە. کڵاو کڵاوی خۆمەو کەرەمی بکە.. ئیتاڵییەو مارکەکەشی کەمێك چووەتەوە!

- کارخانەکانی ئیتاڵیا تەنیا بۆ تۆ کار ناکەن..

- کڵاوەکەی من قەراخەکەی رەشە..

- زۆربەی کڵاوەکان قەراخیان رەشە...

- کڵاوەکەی من دوو کونی هەوا کێشی تێدایە..

- زۆربەی کلاوەکان یان کوندارن یا بێ کونن.
هاوارم کرد: چەند وێنەیەکی خۆم لە توێی ئەستەڕەکەیدایە، خۆ زۆربەی کلاوەکان وێنەیان تێدا نییە.
- ئەگەر وا بێ، ئیدی چ قسەیەکم نییەو ماڵی خۆتە...
کە سەیری ئەستەڕەکەی کردو وێنەکانی بینی گوتی: ڕاستە هی تۆیە، بەڵام مەرجی تێدایە...
خەریك بوو لە داخا شەق بەرم، پرسیم: هێشتا مەرجی تێدایە؟
لەم کاتەدا زەنگی تەواو بوونی دەوام لێیدا. عەمباردارەکە گوتی:
- دەوام تەواو بوو، بڕۆ سبەینێ زوو وەرەوە...
تەواوی بەندییەکان گوتیان: نۆبەتی ئەم قەوانەیە!
لەم کاتەدا شاوری ماموره بستە باڵاکە کاتی خەوتنی ڕاگەیاند. پاشماوەی حەکایەتەکەیان بۆ سبەی شەو هێشتەوە.

## (١٢) خۆشەویستم تۆ فریشتەیت

زیندە قسەی لەگەڵ هەر کەسێك دەکرد، ڕایان دەسپارد کە حەسەنە ڕەش ببینێ، ڕۆژی سەدان کەرەت نێوی حەسەنە ڕەشی لە دەمی بەندییەکان دەژنەوت. هەموو دەیانگوت ئەگەر حەسەنە ڕەشت دیتبا کارت نەدەگەییە ئێرە. کارە سەیروسەمەرەکانی حەسەنە ڕەش بوو بوو بە وێردی سەر زمانی بەندییەکان، دەیان گوت حەسەنە ڕەش دەرسی ئەوقاتەکانی دادەدا.. پیاوی لە قەنارە ڕزگار دەکرد. خدری زیندەیەك بوو بۆ خۆی...
زیندە بڕیاریدا هەر کە لە زیندان ئازاد ببێ یەك ڕێ بڕوات بۆ لای حەسەنە ڕەش و بە هۆی ئەوەوە ناسنامەکەی دەربێنێ...
بۆیە ئەو شەوە خۆشحاڵتر دەهاتە بەرچاو، هەر کە سفرەکەیان پێچاوە زیندە بێ نازونوز دەستی بە حەکایەتەکەی کرد:

- برادەران، دەزانن گەییشتینە کوێ؟!
- عەماردارەکە پولی پێوە نایت.
- بەڵێ گوتی: بڕۆ سبەینێ وەرەوە، دەستم بە پاڕانەوە کرد، بە قوربانت بم، نۆکەرتم، خۆ شتێکی زۆر زەحمەت نییە، هیچی تێ ناچێت، دەست بەرەو کڵاوەکەم بدەرێ با بڕۆم بە شوێن کارمەوە.
عەماردارەکە پێکەنی و گوتی: - لات وایە ئەوەندە ئاسانە! زۆری دەوێ. پێویستە وەڵامی نامەکە بنێرێنەوە لای سەرۆك، ئەویش هەواڵەی ئەرشیفی بکات. ئەرشیفیش فایلەکە بە تاڵ بکاتەوەو بینێرێتە لای سەرۆك نووسینگە، ئەویش ماوە بدات کە کڵاوەکەت بدەینەوە...
یەکێك لە بەندییەکان فیکەیەکی دوورو درێژی کێشاو گوتی:
- جا وەرە کەر لە قوڕ دەربێنە.
زینده بە ئیشارەی سەر قسەی بەندییەکەی سەلماند، زۆر راستە.. هەر رێیەکم گرتە بەر دەبوایە پێیدا بگەڕێمەوە.. هیچ چارەیەکم نەما جگە لەوەی گوێ رایەڵی کابرای عەماردا ببم... بە سەری کۆت دایەرەم بەجێ هێشت. سبەینێ بەپژمە پژم بەرەو دایەرە گەڕامەوە... هەموو فەرمانبەرەکان کەم و زۆر دەیانناسیم.. بە یەکدییان نیشان دەدام و دەیان گوت: خاوەن کڵاوەکە هات.. ژن و پیاو پێ دەکەنین، پێم گوتن:
- پێ بکەنن، رۆژتانە.. ئەوانەی کڵاویان لێ ون دەبێ بە حاڵم دەزانن!
دەستووری وەرگرتنەوەی کڵاوەکەم لە سەرۆك نووسینگە وەرگرت. بردمە ئەو ژوورەی کە چەند کیژێك خەریکی تایپ کردن بوون. کارەکەم لە تەواو بووندا بوو، زۆری نەما بوو چاوم بە دیداری کڵاوە نازدارەکەم رۆشن ببێتەوە، لە پڕ پژمیم... هێندە بە توندی پژمیم زۆربەی کاغەزەکانی بەردەم کیژە تایپیستەکە چوون بە حەوادا ولە ژوورەکەدا پەرت بوونەوە.
یەکێك لە کیژەکان توڕە بوو، و گوتی: کابرا بەری دەمت بگرە.

گوتم: خانم گیان بە دەستی خۆم نییە.. پژمینەکەی منیش وەکو دەستووری سەرۆك دایەرەکانە. هەر کاتێ هات دەبێ جێبەجێ بکرێ...

بەرپرسی نووسینگەکە، ئەم قسەیەی منی پێ ناخۆش بوو. بە ناوی گاڵتە پێ کردن بە فەرمانبەران و بە تایبەتی لە کاتی ئەنجامدانی کارا!.. فایلێکی تێرو تەسەلی بۆ کردمەوە. بەندییەکان تێکڕا گوتیان: نۆبەتی ئەم قەوانەیە.

– بەڵێ برادەران، دایەرەکانی ئێمە بەم جۆرەیە، هەر کە وتت پشتی چاو برۆیە، فایلێکت بۆ کراوەتەوە.

یەکێك لە بەندییەکان کە پیاوێکی قەڵەوی ورگن بوو، کەمتر قسانی دەکرد، کە ئەمەی بیست دەمی کرایەوەو گوتی: دایەرەی چیو قوڕی چی؟ تەنیا ئەوە دەزانن لە پشتی مێزی پان و پۆڕەوە دانیشن و قسەی زل بکەن و مانگەومانگ مووچەی خۆیان وەربگرن. لە پایتەختدا لە ٨٠٪ ماڵەکان بێ ئاون، کەچی دایەرەی ئاویش هەیە. هەر تەلارێ دەگری دەیان نهۆمە، هەر نهۆمێك دەیان ژوورەو هەر ژوورەی مەگەر خوا بزانێ چەند فەرمانبەری تێدایە..

دایەرەی کارەبا، ئەوە هەر باسی مەکە.. دایەرەی تەلەفۆن، هەر مەپرسە.. خۆ تەلارەکەی لە هەموو دایەرەکانی دی گەورەترە..

کابرای قەڵەو تەواوی دایەرەکانی ژمارد تاگەییە دەوڵەت.. تۆزێ بێدەنگ بوو.. و درێژەی پێدا:

– باشە با بزانین ئاخۆ دەوڵەت هەیە؟

کە بینی کەس ورتەی لێوە نایەت، بە دەنگی بەرز پێکەنی و گوتی:

– نە، نابێ نێوی دەوڵەت ببرێ! ردێن سپی قاوشەکە گوتی:

– ماوەی زیندە بدەن با پاشماوەی حەکایەتەکەی بگێڕێتەوە. باسی سیاسەت بێڵن بۆ سبەینێ. بەندییەکانی تریش کە چاوەڕێی ئەنجامی حەکایەتەکەی زیندە بوون، لایەنی ردێن سپی قاوشەکەیان گرت، زیندە لەسەری ڕۆیی: –کڵاوم هەر لە بیر نەما، کەوتمە سەر دەستو پێی بەرپرسی نووسینگە، هەزار پێغەمبەرو

ئیمامم کرد بە گژیا تا لێم خۆش بوو. فایلەکەی دڕاندو فڕێی دا. کاغەزێکی دامێ و بردم بۆ لای ماموری عەمارو گوتم:

– فەرموو ئەمەش کاغەز، سەرۆکیش ئیمزای کردووە.

وەکو نەخوێندەوارێك کاغەزەکەی ئەم دیوو ئەو دیو کردو گوتی:

– باشە دەستووریان داوە کە کڵاوەکەت بدەینەوە.. کوا ناسنامەکەتم بدەرێ..

– قوربان کڵاو وەرگرتنەوە ناسنامەی بۆ چییە؟!

– ئەی من چۆن بزانم کە تۆ کاك زیندەیت، ئەگەر سبەی یەکێکی دی هات و گوتی: – کڵاوەکە هی من بوو!

بەڵێ برادەران، دیقەتم دا کە چاکتر وایە تا فایلێکی تریان بۆ نەکردومەتەوە بڕۆم بە شوێن کاری خۆمەوە. بەندییەکان لە قاقای پێکەنینیان دا. ردێن سپی قاوشەکە گوتی: – ئەی ئەقدەست چی لێکرد کوڕم؟ ناکا لە ئەستەمۆڵدا ئەویشت بەدبەخت کرد بێ؟

زیندە هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو گوتی: باش بوو پرسیت. بەڵێ،ئەقدەس لە کۆشکەکەی ئیحسان خانمدا جێی خۆی خۆش کردبوو. من ئیحسان خانم نەبینی بوو، هەر کاتێ کە دەچوومە ئەوێ دەم پرسی: خانمت لە کوێیە؟ دەیگوت لە سەرەوە نووستووە.

– بۆ نایەتە خوارەوە، ناکا دڵی لە لێدان وەستا بێ؟

– لە دڵ وەستانیش خراپترە... هێندە قەڵەوە ناتوانێ لە جێی خۆی ببزوێ!هەموو شەوێ دەچووم بۆ لای ئەقدەس، تێرو پڕ نانم دەخواردو تاکو نیوە شەو دەمامەوە. بەڵام کە دەبوو بە سەعات دوانزە ئەقدەس پۆزشی دەهێنایەوەو دەیگوت: دەی بڕۆ.

هەر چەند لێی دەپاڕامەوە، کچی چاك بە لەم خانووەدا جگە لە من و تۆ کەسی دی نییە.. بۆ ناچارم دەکەیت بەم نیوە شەوە بۆ ئوتێل بگەڕێمەوە.. ڕێم بدە با لێرە بمێنمەوە، بەڵام نەدەچووە ژێر بارو دەیگوت تاکو مارەم نەکەیت مەحاڵە ڕێت بدەم لەگەڵمدا بخەوی!

شەوێکی گەرمی هاوین چوومە دیدەنی ئەقدەس.. خواردن و شتی خانمی گەورەی تەواو کردبوو، ئیدی هیچ کارێکی دی نەبوو، هات خواردنی بۆ منیش ئامادەکرد. چونکە هەوا زۆر گەرم بوو چووین بۆ ناو باخەکە... کۆشکەکەی ئیحسان خانم لە ناوەندی باخێکی گەورەدا بوو.. شنە بایەکی فێنکی دەهات. ئاسمان ساف و بێگەرد بوو. بۆنی گوڵان پیاوی مەست دەکرد... وای کە شەوێکی خۆش بوو. باڵندە بەسەر چڵی درەختەکانەوە دەیان خوێند... خوێنی بنیادەم قوڵپی دەدا.

یەکێك لە بەندییەکان گوتی: – هەی غەدار دەتویست هەر هەستیت و کچەکە لە ئامێز بگری.

زیندە کەمێك بەم قسەیە پەست بوو، وگوتی: – خاڵۆ، تۆ وا دەزانی ئەقدەسی من لەوانە بوو! خراپ حاڵی بووی.. ئەقدەس لە هەوەڵەوە کچێکی پاك بوو.. لە کۆشکەکەی ئیحسان خانمیش دا بوو بە ئافرەتێکی ماقوڵ و تەواو.. ئەم جۆرە ئافرەتانە زۆریان لەگەڵدا ناکرێ... پێویستە خۆیان بڕیار بدەن.. ئەقدەسیش کە خەمی من دای گرتبوو، لە تەکمەوە دانیشت و دەستی بە قژما هێناو گوتی:

– زیندە... حەیاتەکەم.. کۆڵەکەی ژیانم بۆچی زووتر ناسنامەکەت دەرنایەنی؟

کە بینی بێدەنگم و چ وەڵامێکم پێ نییە، وەك بڵێی حاڵی بوو، پرسی: لەبەر پارە؟

دیسان بێدەنگ بووم. ئەقدەس گوتی: من پارەم زۆرە، ئامادەم چەندت بوێ بت دەمێ.

گوتم: ئەقدەس گیان، دوای ئەوەی شەریکەکەم دەستی بڕیم و هەموو پارەکانی تۆی لێ کێشامەوە، ئیدی رووم نایەت پارەت لێ وەربگرم.. زەردەخەنەیەکی عاشق کوژانەی کرد و گوتی:– ئەم قسانە چییە، بریا پارەی هەموو دنیام هەباو لە پێناوی تۆدا خەرجم کرد با..

هەوای فێنکی هاوین و ئاوازی باڵندە کاریان کرد بووە گیانی ئەقدەسیش، پتر لێم نزیك بووەوەو خۆی بە شانمەوە نووساند.. تەماسی بازووی سپی و رووتی وای جۆش دابووم ئەگەر دێو بهاتایەتە ڕێم دەم بەزاند. ئەگەر کێو بهاتایەتە ڕێم هەڵم دەکەند، گوتم:

– ئەقدەس گیان.. تۆ تەنیا خۆشت بووێم بەسە.. پێویستم بە پارەی تۆ نییە.. بەم زووانە هێندە پارە پێکەوە دەنێم هەر سەرت سور بمێنێ... برادەران وا زەن نەکەن ئەم قسانەم بۆ فریودانی کچەکە دەکرد.. نەخێر من پیاوی درۆ ودەلەسە نیم... دەتگوت سەرخۆشم.. ئەقدەس کە وەکو منداڵ پێدەکەنی، تەواو باوەڕی کرد بوو. پرسی:

– کە بوین بە خاوەن پارە چی بکەین؟

من کە لە چاوەڕەش و درشتەکانی راما بووم گوتم: یەکەمجار دەچم ناسنامە دەردێنم.

– ئەی داوی ئەوە؟

– تۆ دەگوازمەوە..

ئەقدەس گوڵێکی لە باخەکە کرد بووەوە، بۆنێکی عاشقانەی پێوە کرد و مات بوو.

گوتم: بیر لە چی دەکەیتەوە؟

– ووتم بزانم مانگی هەنگوین لە کوێ بە سەربەرین؟

تا ئێستا ئەم ناوەم نەژنەوتبوو، نەمدەزانی مانگی هەنگوین کام مانگە!..

پرسیم:– ئەمە چ مانگێکە؟..

ئەقدەس واتای مانگی هەنگوینی بۆ روون کردمەوە.. زانیم کە ئەمەش شتێکە لەو شتانەی کە لە ناو کۆشکەکەی ئیحسان خانم دا فێری بووە.. کچ و کوڕەکانی ئیحسان خانم بۆ مانگی هەنگوین چوو بوونە هەندەران، دیار بوو ئەقدەسیش لەوانەوە ژنەوتبووی.

گوتم: تۆ کوێت پێ خۆش بێ بۆ ئەوێ دەچین..

پرسی: کە شاییمان کرد، تۆش سواری شەمەندەفەر و کەشتی و فڕۆکەم دەکەی؟ بەستە زمانە، نایزانی من بە چ حاڵێك پارەی هاتوو چۆی تاکسی پەیدا دەکەم. بەلاّم گوتم: هەڵبەتە سوارت دەکەم..

ئەقدەس پتر لێم هاتە پێشەوە، سەری خستە سەر شانم و گوتی:

– ئێمەش وەکو بووك و زاوەکەی ئیحسان خانم ئاهەنگی شاییەکەمان لە مەدرید و سویدا بە سەر دەبەین؟

گۆنا ئاڵەکانی ئەقدەسم ماچ کردو گوتم: کە تۆ حەز بکەیت بۆ نەء؟ لە هەر شوێنێکی ئەم دنیایەدا تۆ بتەوێ، لەوێ ئاهەنگ دەگێڕین!

ئەقدەس ئەم وەلاّمەمی زۆر بە دڵ بوو.. ئەویش بۆ یەکەمجار منی ماچ کرد و گوتی: ئەقدەس بە ساقەت بێ.. چەند پیاوێکی باشیت. ئەقدەسم راکێشایە باوەشم و ئارام و هێدی لە سەر سەوزە گیایەکە راکشاین.. گوتم: ئەقدەس گیان.. من لەسەر قسەی خۆمم.. دەچینە مانگی هەنگوین و کارتی بانگ هێشتن بۆ میوانان دەنێرین... بەلاّم.. کە بێدەنگ بووم ئەقدەس گوتی: بەلاّم چی؟

– ئەم کارتانە بۆ کێ بنێرین؟ من کەسم نییە، تۆش لەگەڵ بابتدا زیزی..

ئەقدەس گوتی: راست دەکەی.. ئێمە بێ کەسین..

– کەواتە با بانگ هێشتنی میوانان هەڵوەشێنینەوە.. بەلاّم هەر دەبێ بۆ مانگی هەنگوین بچین!

ئەقدەس گوتی: باشە بەرنامەی میوانداری هەڵدەوەشێنینەوە.. ئەی لە مانگی هەنگوین دا بۆ کوێ بچین؟

– بە دڵی تۆ دەکەین.. بەلاّم پارەکەمان بە فیڕۆ دەچێ.. بۆ عاشقان ئیسراحەت کردن لە جێیەکی پەنا ولاچەپدا گەلێ چاکترە لە قەرەباڵغی شاران.. تۆ چی دەڵێی؟

– راست دەکەی.. منیش رازیم..

پتر ئەقدەسم بە خۆوە گوشی و گوتم: تۆ فریشتەیت، خۆشەویستم.. کە تۆ سەفەری مانگی هەنگوینت پێ باش نییە.. منیش چاو پۆشی لێدەکەم!

ئەقدەس گوتی: بەڵام ئەوە بزانە حەیاتەکەم، هەر دەبێ دیاری بوکێنیم بۆ بکریت..

گوتم: بەسەر چاو، چما بووك بەبێ دیاری دەبێ؟ گرانترین و چاکترین دیاریت بۆ دەکڕم.

ئەمجارەیان ئەقدەس گوشیمی بە خۆیەوەو لێوی ماچ کرد م و گوتی:

– تۆ چاکترین پیاوێکی کە تاکو ئێستا دیوومە!

منیش ماچێکی عاشقانەیم کرد و گوتم: ئەقدەس گیان دەزانی چیم کەوتەوە یاد؟

– چی؟

– دەڵێم پارەی دیارییەکان بدەین بە ناومالّ.. باشتر نییە؟

ئەقدەس چاوە خومارەکانی هەڵبڕی و گوتی: بڵێم چی.. هەڵبەت باشترە..

دەستم لە ملی کرد، لێویم راموسی، ئازای گیانی کەوتە لەرزین، گوتم:– ئەقدەس گیان بەو خوایە تۆ فریشتەیت.. کە تۆ دیاریت نەوێ، خۆ من بە زۆر بۆت ناکڕم!..

خوایە چاوی پارە کوێر بێ، رووی نەبوونی رەش بێ، ئەگەر پارەم دەبوو، سەراپای ئەقدەسم لە زێر وزیو دەگرت.. بەڵام کە بێ پارەم ناچارم بەم قسانە تەفرەی بدەم و سەر گەرمی بکەم.. ئەقدەس زیاتر خۆی پێوەم نووساند و گوتی:– لە بری هەموو ئەمانە دەبێ شاییەکی گەورە بگێڕین.

– بێگومان ئاهەنگێکی وا دەگێڕین کە تا ئێستا وێنەی نەبوو بێ، حەوت شەو و حەوت رۆژ میوانان هەر بخۆن و بخۆنەوەو هەڵپەڕن.

ئەمجارەیان ئەقدەس ماچێکی هێندە تەڕی کردم، سەراپام سست بوو!..

وەکو سەر خۆشان گوتم: ئەقدەس گیان.. دەزانی چی؟ بۆ بە خۆڕایی ماڵی خۆمان دەرخواردی خەڵکی بدەین و دوایی چەپڵەمان بۆ لێ بدەن؟ باشتر نییە ئەگەر ئەو پارەیە لە شتێکی دیدا خەرج بکەین؟

– بۆ نەء... بە دڵی تۆ دەکەم.

دیسان ماچم کرد و گوتم: ئەقدەس گیان بە راستی تۆ فریشتەیت... منیش حەزم لێیە بە دڵی تۆ بکەم.. کە تۆ ئاهەنگ و شاییت ناوێ منیش چ قسەیەکم نییە.

ئەقدەس گوتی: پارەی شاییەکە بدەین بە خانوویەکی چاك.. دەبێ خانووکەمان دەزگای گەرم کردنەوەو فێنك کردنەوەی هەبێ.. هۆدەکانی گەورە بێ.. موبیلەکانمان ستیل بێ..

من بە چاکی لە مانای قسەکانی حاڵی نەدەبووم.. بەڵام پێویست نەبوو بزانم.. ئەقدەس گیان دەیویستن و دەبوایە لەبەر خاتری ئەو وەدەستیان بێنم ... گوتم: خۆشەویستەکەی دڵم.. چاکترین خانووت، بە پۆشتە ترین ناو ماڵەوە بۆ ئامادە دەکەم.. بەڵام ئەورۆکە نرخی خانوو زۆر بەرز بۆتەوە.. باشتر نییە ئەرزەیەك بکڕین و بە دڵی خۆمان بینای بکەین؟

– بۆ نە.. زۆرچاکترە..

دیسان ماچێکی گەرمیم کرد و گوتم: ئەقدەس گیان تۆ هاوتات نییە... لە فریشتەی ئاسمان پاکترو چاکتریت!

ئەقدەس کە دەیڕوانییە عالەمی خەیال گوتی: چاوپۆشی لە هەمووی دەکەم، بەڵام هەر دەبێ جلی بوکێنیم بۆ بکڕیت..

– گیانەکەم، بۆ چما بووك بە بێ جلی بوکێنی بووە.. ئەگەر تۆش نەتەوێ خۆم بۆت دەکرم، بەڵام...

– دیسان بەڵامە؟

– گیانەکەم تۆ جلی بوکێنی لە دوو-سێ سەعات پتر ناپۆشیت.. دوای ئەوە بە کەڵك نامێنێ.. بۆ چی بۆ دووسێ سەعات ئەم هەموو پارەیە خەرج بکەین.. ئەگەر تۆ رازیت لەسەر بێ بە کرێ دەی هێنین.

– باشە.. جلی بوکێنیم هەر ناوێ...

گوتم: ئەقدەس گیان کە دڵ بوو بە یەك ئیدی نە مانگی هەنگوین، نە ئاهەنگ و شایی.. نەخانوو.. نە جلی بووکێنی و نە شتی دی دەوێ.. بۆ عاشقان کادێن

کۆشکی شاهانەیە! ئەقدەس بە پێکەنینەوە گوتی: مێردی خۆشەویستم، بۆ سەفەری مانگی هەنگوینت نەبردم.. خانووت نەکری.. جلی بوکێنیت نەکڕی.. دڵم لە برسانا زەحف دەکات، ماوەم بدە بچم لە ئاشخانەکە دا شتێ بخۆم.
گوتم: شتێ بۆ منیش بێنە، با هێزم وە بەر بێتەوە!
ئەقدەس رۆیی منی لە بەحری خەیاڵاو بە گیرفانی خاڵی بەجێ هێشت.. کە گەییە بەر کۆشکەکە گوتی: درەنگە، هەستە بڕۆ سبەی شەو وەرەوە...
ئاو زایی بووە دەمی بەندییەکان، حەزیان نەدەکرد بەم زووانە حەکایەتەکە تەواو ببێ.. یەکێك لە بەندییەکان گوتی: هەتیو ئەو شەو حەشرت کرد، پشتی حەکایەتەکەت شکاند.
ردێن سپی قاوشەکە گوتی: هێشتا زۆرمان ماوە بۆ نیوە شەو. بلێ بزانین دوایی چی بوو؟!
پیاوە قەڵەوەکە هەڵی دایە: "فلانی.. کاکم کچەکەی تەفرە داوە و دەیەوێ ئێمەش بە مەستی بەجێ بهێڵێ.. پاشماوەکەی بلێ..
زیندە وێڕای ئەوەی کە شەکەت بوو بوو، یادگاری ئەو شەوە تەواو تاساند بووی، بەڵام دیسان دڵی نەشکاندن و گوتی: سبەی بەیانی زانیم چ هەڵەیەکم کردووە.. کە ئەم هەموو بەڵێنەم بە کچەی بێچارە داوە... ئیدی رووم نەبوو سەیری ئەقدەس بکەم... نەفرەتم لە خۆم دەکرد.. جگە لە خۆکوژی چ چارێکی دیم نەبوو.. بەڵێ برادەران، ئەم ژیانە بە کەڵکی من نایەت... کە من نەتوانم زیندوویەتی خۆم بسەلمێنم، ئیدی ژیانم چ سوودێکی هەیە.. مردن گەلێك لەم داخ و کەسەرە چاکتر بوو... چوومە دەرمانخانەیەك، پاکەتێ مەرگەمووشم کڕی.. لەسەری نووسرا بوو کە چۆن کەڵك لەم ژەهرە کوشندەیە وەردەگیرێ، ئەوە دووپات کرا بووەوە کە نە وەك بەردەستان بکەوێ وریا بن هیچ شتێکی تێکەڵاو نەبێت، زۆر خەتەرە، بە ئەندازەی دەنکە گەنمێکی هەزاران مشك دەکوژێت! لە دڵی خۆمدا گوتم "لێی گەڕێ ئەمە ئەوەیە کە بە دوای دا دەگەڕام. چوومە قەراخ شار.. جێیەکم دۆزییەوە کە هاتووچۆی تێدا کەم بوو...پاکەتە ژەهرەکەم لە

دەممدا خاڵی کرد... شایەتمانێکم هێناو لە گۆشەیەکدا راکشامو چاوەڕێی ئیزراعیلم دەکرد. لە بیری ئەوەدا بووم کە هەر ئێستا دەست و پێم دەشکێ و دەمارەکانم سست دەبن.. زمان و دەمم وشك دەبێ و گیانم لە نووکی قامکەکانمەوە دەردەچێت... پڕ بە دڵ لەم کارەم رازی بووم. مەرگ تاقە رێگای رزگاریم بوو. چونکە لە دوێنێوە هیچم نەخوارد بوو، ریخۆڵەکانم کەوتنە قوڕە قوڕ! نازانم لە برسا بوو یان ماکی ژەهرەکە بوو. لە دڵی خۆمدا گوتم: "ئەی سك بە خۆڕایی قوڕە قوڕ مەکە.. هەتا ئێوارە هاوار بکەیت هەر ئەوەیە... پاکەتێ ژەهرم بۆ کڕیت و ئیدی تاقە پولێکم نییە کە خواردنت بۆ بکڕم!".

ماوەیەك تێپەڕی، سەیرم کرد ئەو ژەهرە چ کارێکی لێ نەکردم.. تەنیا کەمێك خەواڵو بوو بووم. گوتم: هەڵبەت مرۆڤ بەم جۆرە ژەهراوی دەبێ.. وردە وردە خەوم لێ کەوت... خەونم دەدی، لە لایەکەوە سەدای مۆسیقایەکی ئارامم دەژنەوتو لەلایەکی ترەوە قاقای پێکەنینی کۆمەڵێکم بەر گوێ دەکەوت. دەتگوت لە سەرانسەری شارا شاییەو تێکڕای مەردمەکە گۆرانی دەچڕن و هەڵدەپەڕن.. سەدایەك لە گوێمدا دەزرینگایەوە: "کوڕە گیان، زۆرت رەنج کێشاوە، بەڵام ئیدی بەسەو ئەمجا نۆرەی لەزەت و خۆشیتە!".

لە دەریای ئەم بیرانەدا بووم، کە لە ناکاو لەقەیەکی توندم بە پشت دا کێشرا، بە ئەسپایی چاوم هەڵێنا، سەیرم کرد دوو کەس بە دیار سەرمەوە وێستاون...

یەکێکیان گوتی: مەعلوم نییە... کە مەستە یا شێتە؟.

دووەمیان گوتی: مەست بەم شێوەیە پێ ناکەنێ... دیارە شێتە.

هەستامە سەر پێ... دنیا تاریك بوو بوو، چەند سەگ و پشیلەیەك لە دەورم خڕ بوو بوونەوە.. دوو پاسەوان هاتنە ژێر باڵم و یارمەتیان دام کە هەستم... کە زانیم نەمردووم، لەداخی ئەو پارەیەی کە بە فیڕۆ چوو بوو، گوتم: بە داخەوە کە نەمردم!

یەکێك لە پاسەوانەکان بە شانازییەوە گوتی: ئەگەر ئێمە فریات نەکەوتینایە. سەگ پارچە پارچەی دەکردیت و دەی خواردیت.

بە نا بەدڵییەوە گوتم: ئێوەی پۆلیس هەمیشە بەلاّن بۆ مەردم... نایەڵن خەڵکی کاری خۆیان ئەنجام بدەن..
رووداوەکەم بۆ پاسەوانەکان گێڕایەوە. هەردووکیان کەوتنە پێکەنین..
یەکێکیان گوتی: ئەی رۆژنامە ناخوێنیتەوە... وەزارەتی تەندروستی رای گەیاندووە کە زۆربەی دەرمانەکان ساختەگییەو دەستووریان داوە کە ئەم دەرمانانە لە دەرمانخانەکاندا نەهێڵن.
دووەمیان گوتی: لە ماڵەکەماندا مشك پەیدا بوو بوو، شووشەیەکم لەم ژەهرە کڕی، کردم بەنان و پەنیرەوەو لەبەر کونەکانیاندا دامنا..
مشکەکان نەك هەر نەمردن، بەڵکو ژەهرەکەیان پێ کەوت و خێراتر نەشونمایان کرد... ئێستا ناچارین شەوی دووسێ شووشە ژەهریان بدەینێ ئەگینا ژیانمان لێ تاڵ دەکەن...
پاسەوانەکان و یستیان بم بەن بۆ پۆلیسخانە، باش بوو بە هەزار تکاو پاڕانەوە بەڕەڵڵایان کردم، بەمەرجێ لەمەودوا هەوڵی خۆ کوژی نەدەم...
منیش بەڵێنم دانێ و بۆ ئەنجامدانی بەڵێنەکەم بڕیارم دا خۆم بخەمە ژێر شەمەندەفەرەوە.. چووم بۆ وێستگای شەمەندەفەر، بەرنامەی دەرچوون و گەڕانەوەی شەمەندەفەرم وەرگرت.. چەند دەقیقەیەك بەر لە هاتنی یەکەم شەمەندەفەر، لە شوێنێکی لە باردا لەسەر ڕێڵەکە راکشام.. پێنج دەقیقە.. دەدەقیقە.. چارکە سەعاتێ.. نیو سەعات چاوەڕوانم کرد، هیچ هەواڵێ لە هاتنی شەمەندەفەرەوە نەبوو. هەستام و چووم بۆ وێستگاکە: لە فەرمانبەرەکەم پرسی: کەی شەمەندەفەرەکە دەگات؟.. خەڵکی کاریان هەیە، ئەمە چ گاڵتە بازاڕێکە؟
ماموری پرسگاکە پێکەنی: برادەر دەڵێی خەڵکی ئەم وولاتە نیت و لە مەریخەوە هاتوویت؟
گوتم: مەبەستت چییە؟
– تا ئێستا کێ دیویەتی یان بیستوویەتی شەمەندەفەر بە گوێرەی بەرنامە بگاتە وێستگا؟

– ئەی ئەم بەرنامانە بۆ چاپ دەکرێن؟

– ئەگەر بەرنامەکە چاپ نەبێ، مەردم لە کوێ دەزانن شەمەندەفەرەکە چەند دوا دەکەوێ؟..

چ قسەیەکم نەما، هەقی بوو. گشت کارەکانمان لەیەك دەچن.. ژهرە ساختەگییە، شەمەندەفەرە لە کاتی خۆیدا ناگاتە جێ، چاری من چی بوو؟! سەیرم کرد گاز لە هەموو شتێ چاکترە، لەو کاتانەدا بە ڕێکەوت لەگەڵ سێ کەسی دی دا لە یەك ژووردا دەژیاین. ڕۆژێ بە بیانووی پاك کردنەوەی ژوورەکە لە ماڵ مامەوە. لە ژوورەوە دەرگاکەم لە سەرخۆم داخست. بۆری گازەکەم تا دوا پلە کردەوە. لووتم بە بۆرییەکەوە چەسپاند. چاوەڕێ بووم گازەکە کاری خۆی بکات و لە شەڕی ئەم ژیانە رزگار بم.. بایەکی فێنك لە بۆری گازەکەوە دەهات.. لەم کاتەدا یەکێك چەند جارێ لە دەرگای داو بە نێوی خۆمەوە گازی کردم.

بەڵام وەڵامم نەدایەوە.. کلیلەکەی خستە کونی دەرگاکەو بای دا..

هاوارم کرد: مەیە ژوورەوە خەتەرە! بەڵام ئەو هەر هاتە ژوورەوە، دەرگاوانی ئوتێلەکە بوو، کە بینی لووتم بە بۆری گازەکەوە ناوە پرسی: ئەوە چی دەکەیت؟

– قسە مەکە کارەکەم لە تەواو بووندایە..

دەرگاوانەکە پێکەنی:– کاکە گیان ئەوڕۆکە خانمان خەریکی چێشت لێنان بە هۆی گازەوە نییە، دەرگاوانەکە هەقی بوو، زانیم کە لە بری گاز هەوای ئازاد بە بۆرییە گازەکان دا دەڕوات.. ئاخر ئەمە چ وڵاتێکە.. پیاو بە مەرگیش رازی دەبێ کەچی هۆی خۆکوژی دەست ناکەوێ!

دەرگاوانەکە، بۆری گازەکەی بەست و گوتی:– بەڵامان بۆ دروست مەکە.. ئەگەر دەتەوێ خۆت بکوژی پێم وایە خۆ هەڵواسین چاکترە!

سیدارەشم تاقی کردەوە، بۆ نەگبەتی پەتەکە کۆن بوو بوو و پچڕا!.

چەقۆم کڕی ورگی خۆمی پێ هەڵدڕم. لە چاخانەکەدا وەسێت نامەم دەنووسی، پۆلیس هاتن بە سەراو موشتەرییەکانیان پشکنی و چەقۆکەی منیشیان گرت..

کە بینیم لەم دنیایەدا مەحکوم بە ژیانم و هیچ شتێ ناتوانێت بۆ ئەو دنیام

بنێریٚ، هەندیٚ پارەم قەرزکرد، خۆم کرد بە خوارنگایەکدا، بۆ ئەوەی سکم تێر بکەم. دوو ڕۆژ بوو تامی زادم نەکرد بوو، هێلکەو ڕۆن و دۆلمەی بیبەرم خوارد، ئەوجا هەندیٚ ماکەڕونیم بەسەردا کرد. لە خواردنگاکە هاتمە دەریٚو خۆم کرد بە کافەیەکی شیرینی دا، چەند پاقلاوەیەکم خواردو هەستام. ئەوجا ڕۆژنامەیەکم کڕی و بە خەیاڵی ئاسودەوە خۆم بە باخچەیەکدا کرد، لە سوچێکەوە دانیشتم و بە وردی کەوتمە خوێندنەوە. ئاسمانم بە چاتۆڵ دەزانی.. نە لە بیری پارەدا بووم‌و نە لە بیری کاردا.. کە ماوەیەکی کەم تێپەڕی، هەستم کرد دڵم دێشێت.. هەوەڵجار گوێم نەدایێ. بەڵام ئێشەکەی دڵم وردە وردە زیادی دەکرد.. تا وای لێهات نەمتوانی لەسەر کورسییەکە دانیشم یان ڕاکشێم.. لە ئارەقەدا هەڵکشا بووم و دەم ناڵاند.. کۆمەڵێك بە دیارمەوە کۆبوو بوونەوەو هەر یەکەیان شتێکی دەگوت: خەریکە دەمریٚ..

– دەمێکە مردووە..

– ڕاست دەکات.. دەموچاوی شین بووەتەوە..

– بابیبەن بۆ نە خۆشخانە خێرتان دەگاتیٚ..

– دەستی لیٚ مەدەن.. دوایی دەڵێن ئێوە کوشتوتانە.

– ڕاست دەکات، بە خۆڕایی سەریەشە بۆ خۆتان دروست مەکەن.

– لێی گەڕێن...

– ئەگەر شتێکی لیٚ بیٚ.. ئێمەش گیرۆدە دەبین و ئەوسا وەرە ئەم کەرە لەو قوڕاوە دەربێنە.

تێکڕایی بەندییەکان گوتیان: دە وەرە ئەو کەرە لەم قوڕاوە دەربکە.

– برادەران، دڵم هێندە، دەیەشا، خەریك بوو هەناوم بێتە دەریٚ.. لە نێو تەماشاکەرەکانەوە یەکێك گوتی:

– باشتر وایە پۆلیس ئاگادار بکەینەوە.

بەندییەکان تێکڕا گوتیان: نۆبەتی ئەو قەوانەیە.

شاوری ماموره بستە باڵاکە کاتی خەوتنی ڕاگەیاند.. بەندییەکان بە پەلە خزانە ژێر جێگاکانیانەوە.

## (١٢) پەیوەندی بە منەوە نییە

بەندییانی قاوشی یەك، هەموو ڕۆژێ بەر لەوەی شاور لێ بدرێ لە ژوورەکەی خۆیاندا کۆدەبوونەوە. بە پەلە سفرەیان ڕادەخست.. دەیان و یست هەرچی زووترە شیوەکەیان بخۆن و پاشماوەی حەکایەتەکەی زیندە بژنەون. مامورانی زیندان لەم عادەتە ڕازی بوون و حەزیان دەکرد بۆ هەر قاوشێك چیرۆك بێژێکی وەکو زیندە پەیدا ببێ و شەوانە بەندییەکان سەرگەرم بکات..

هێشتا سفرەکەیان کۆ نەکرد بووەوە، ردێن سپی قاوشەکە گوتی:

– زیندە تکایە ئەو شۆ بە بێ نازونوز دەست بە حەکایەتەکە بکە با بزانین چیت بە سەرهات؟

زیندە دەستی پێکرد:– هەر ئەوەندە ئەو کابرا شیرپاکە گوتی:

– چاکتر وایە پۆلیس ئاگادار بکەینەوە.. لە پڕ سێ‌چوار کەس پێکەوە هاواریان کرد: پۆلیس.. پۆلیس..

زۆر نیگەران بووم، حەزم نەدەکرد چارەی پۆلیس ببینم.. ئەگەر دەمتوانی ببزوێم هەر هەڵدەستام و ڕام دەکرد. بەڵام سکم یەکجار زۆر دەیەشا.. هەر چەندە چەند پۆلیسێك لە باخچەکەدا پیاسەیان دەکرد، بەڵام کەسیان بە دەنگ وهاوارەکەوە نەهاتن..

یەکێك لە تەماشا کەرەکان چوو بۆ لای ئەو پۆلیسەی کە لە بەر دەرگای باخچەکەدا وێستا بوو، وگوتی: جەناب، یەکێکتان تا ئێرە وەرن...

پۆلیسەکە پرسی: چی بووە؟

– زەلامێ لەوێ کەوتووەو خەریکە دەمرێ...

- پێوەندی بە منەوە نییە!... من پۆلیسی ترافیكم ناتوانم ئیشی خۆم بەجێ بهێڵم..
یارۆ بە پەلە خۆی گەیاندە ئەو پۆلیسەی كە لەسەر شۆستەكە پیاسەی دەكردو گوتی:
- قوربان زەلامێك لە باخچەكەدا كەوتووەو خەریكە دەمرێ!
- پێوەندی بە منەوە نییە من پۆلیسی پەساپۆرتم...
ئەمەی گوت و رۆیی. ئازارەكەی منیش جارێ كەم دەبوو، و جارێ زیاد...
كابرای خێرخوا بێ وچان هاواری دەكرد: پۆلیس...
ئەنجام پۆلیسێكی دی بینی و بەسەر هاتەكەی بۆ گێرایەوە. ئەویش شانی هەڵتەكاندو گوتی: -من هەقم بەسەر ئەم كارانەوە نییە... من پۆلیسی ئیجرامم.
كابرای خێرخوا پۆلیسی چوارەمی دۆزییەوە. دەخیلی ئەویش كەوت. ئەویش بە ساردییەوە وەڵامی دایەوە: -من پۆلیسی شارەوانیم.. كەوتە شوێن زەلامێكی دەست گێڕ تا بیگرێ و فەرمانی یاسای بەسەردا ئەنجام بدات..
كابرای خێرخوا پۆلیسی پێنجەمی بینی و چووە لای و بەسەر هاتەكەی پێ گوت.. پۆلیسەكە گوتی: من ماموری ئاگاداریم، پێویستە بە پۆلیسی دایەرەی پۆلیسخانە بڵێی...
كابرای خێرخوا وەكو شێت هاواری دەكرد و رای دەكرد، كە چاوی بە پۆلیسێكی دی كەوت چوو بۆ لای و گوتی: قوربان تۆ ماموری پۆلیسخانەیت؟
- بەڵێ چیت دەوێ؟
- كابرایەك لەوێدا كەوتووەو خەریكە دەمرێ، فریای بكەوە.
- راستە من ماموری پۆلیسخانەم، بەڵام ئەم ناوچەیە سەر بە پۆلیسخانەی چوارەو من ماموری پۆلیسخانەی نۆیەمم.
كابرای خێرخوا ئومێد بڕ بوو، كەوتە هەڵپەی پەیدا كردنی پۆلیسی پۆلیسخانەی چوارەم.. لە پڕ پۆلیسێك پەیدا بوو كە نیشانەی پۆلیسخانەی چوارەمی پێوە بوو. بەسەرهاتەكەی پێ گوت. پۆلیسەكە گوتی: راستە كە من

مامۆری پۆلیسخانەی چوارم بەڵام هەقم بەسەر خەڵکییەوە نییە. من تاقیبی قاچاخ چییان دەکەم. پێویستە بە مامۆرانی تاوان بڵێی.. کابرای خێرخواز دیسان کەوتەوە هەڵپە، پۆلیسێکی پەیدا کرد کە نیشانەی پۆلیسخانەی چوارەمی پێوە بوو. داوای کۆمەکی لێکرد. پۆلیسەکە گوتی: من مامۆری پۆلیسخانەی چوارەمم و لە بەشی تاواندا کار دەکەم.. بەڵام ئێستا هیچم پێ ناکرێ چونکە مادونییم...

کابرای خێرخوا ئومێد بڕ بوو، بە دەستی بەتاڵ گەڕایەوە لای برادەرەکانی و گوتی:

– پۆلیسم پێ پەیدا نەبوو، هەر یەکەیان بیانوویەك دێنێتەوە.

یەکێك لە تەماشاکەرەکان گوتی: – ئەگەر دەتەوێ پۆلیس پەیدا بکەی... وەرە بە قسەی من بکە.

– چی بکەم؟

– بچۆ سەر کورسییەك و هاوار بکە.. ئەمە چ وڵاتێکە، ئەمە چ وەعزێکە؟!..

کابرای خێر خواز بە قسەی برادەرەکەی کرد. چووە سەر ئەو کورسییەی کە من لە ژێریا راکشا بووم و لە تاو ئازار گێنگڵم دەدا. دەستی بە هاوار کرد: ئەمە چ حاڵێکە... ئەم چ وڵاتێکە... شەرمە... داوەشێن..

لە پڕ سێ پۆلیس وەکو قارچکە سەگانە قوت بوونەوە! یەخەی کابرای خێرخوازیان گرت و هێنایانە خوارەوە، بێ پرس و وەڵام بردیان تا تەمێی بکەن!... من لە تاو ئازارو لە ترسی ئەم هەموو پۆلیسە بورامەوە. وەختێ چاوم کردەوە خۆم لە نەخۆشخانەدا بینییەوە. تومەز دوو رۆژە بێ هۆشم.. ئەو پزیشکەی کە سەرپەرشتی دەکردم گوتی:

– رۆڵە گیان.. بۆ ویستووتە خۆت بکوژیت؟

گوتم: جەنابی دکتۆر من ئەو بەختەم نییە... زۆرم هەوڵدا لەم ژیانە رزگاربم وەلێ ئەفسوس. ئەم نەگبەتیەش بە هۆی خواردنی خۆراکی خواردنگاوە بوو!.

پزیشکەکە گوتی: زۆرم زەحمەت کێشا تا لە مەرگ رزگارم کردیت.

بە ناڕەزاییەوە گوتم: جەنابی دکتۆر بۆ ئەمەت کرد؟ خۆ لێت گەڕابام بابمرم..
- بۆچی... چما ژیان چ عەیبێکی هەیە؟!
لە نووکەوە بەسەرهاتی خۆم بۆی گێڕایەوەو گوتم: مەرگ گەلێك لەم ژیانە چاکترە.
پزیشکەکە پیاوێکی چاك بوو، ناردمییە لای دۆستێکی خۆی کە بەبێ ناسنامە کارێکم بداتێ... وەختێ کە ڕۆییشتم پزیشکەکە ئامۆژگاری کردم: ئاغات هەر چییەك دەڵێ ئەنجامی بدەو هەقت بەسەر دروستی و نادروستی ئەو کارەوە نەبێ...
منیش گوتم: بەسەر چاو قوربان. من هەقم چییە دەستوورەکەی دروست یا نا دروست بێ، گرنگ ئەوەیە ئەنجامی دەدەم.
لە بێکاریدا گەڕ بوو بووم... هەر کارێکیان پێم دابا ئەنجامم دەدا..
کارتەکەی دکتۆرم بردو چووم بۆ لای دۆستەکەی... دەرگاوانەکەی ڕێ دام و چوومە ژوورەوە. کابرایەکی زلەی قەڵەو لە سەرووی ژوورەکەوەو لە پشت مێزێکەوە دانیشتبوو.. تا ئەو ڕۆژە مێزی وا گەورەم نەبینی بوو.. دوو کەسیش بەرانبەری دانیشتبوون و قسانیان دەکرد. تەنانەت سەری هەڵنەبڕی کە سەیری قەدو باڵام بکات. وێ دەچوو گەلێك توڕەو پەست بێ. لەسەر کارتەکەی من کە دەرگاوانەکە لە پێش خۆمدا بۆی بردبووە ژوورەوە، شتێکی نووسی و گوتی: بیبە بۆ لای ئەندازیارەکە.. کارتەکەی دایە دەستم و گەڕایەوە سەر قسەکردنەکەی خۆی.
پاشەوپاش لە ژوورەکە هاتمە دەرێ.. باوەڕم نەدەکرد کە بەم هاسانییە کاریان پێ دابم.. هیچ شتێ دیار نەبوو، نە کارەکەو نە کرێکەی... و نە هیچی لێ پرسیم... ڕاستیان گوتووە.. واسیتەیەك لە هەزار بەڵگە چاکترە! لەبەر دەرگاکە کارتەکەم بە دەرگاوانەکە نیشانداو گوتم: -برادەر توخوا ئەمە ڕاستە یان ویستی دەستم پێوە بنێ!

دەرگاوانەکە نووسینی سەر کارتەکەی خوێندەوەو گوتی: ئیتر چیت دەوێ کاکە گیان؟... دیارە بە تەمای ژنیشت بۆ بێنێ...

- چی نووسیوە؟

- بۆ سەرۆك ئەندازیارانی نووسیوە کە کارت بدەنێ.

- کەواتە دەبێ بچم بۆ لای سەرۆك ئەندازیاران؟

- بەڵێ... بڕۆ ئەو بەری جادەکە.. ئەها ئەو کۆشکە بەرزەیە.

دەرگاوانەکە بە ئیشارەی دەست کۆشکێکی پێ نیشان دام.. منیش یەکڕاست چووم بۆ لای سەرۆك ئەندازیارانو کارتەکەم پێدا.. چاوێکی بە کارتەکەدا خشاند. تەماشایەکی قەدو باڵای کردم پرسی:

- خوێندەواریت هەیە؟

- بەڵێ خوێندن و نووسین و حیساب چاك بەڵەدم..

- زۆر چاکە.. دەفتەری هاتوو رۆیشتووی "واردە و صادرە" عەمارەکە بنووسە... وریا بە هیچ شتێ نەپەڕێنی...

- بەسەر چاو قوربان...

چاوەڕێ بووم کە پێم بڵێ بۆ کوێ بچم و دەفتەرەکان لە کێ وەربگرم. سەرۆك ئەندازیاران کە خەریکی کارکردن بوو پرسی: تا ئێستا لەم کارانەت کردووە؟

- بەڵێ قوربان چەند ساڵێك عەماردار بووم!...

- زۆر چاکە، کەواتە ئەرکی خۆت دەزانی، هەر شتێ دێتە کارخانەکەوە، وە سلێکی پێ دەنووسیت و دەی نێری بۆ لای عەماردار.

- بەڵێ قوربان دەزانم...

ئەندازیارەکە لە پڕ هاواری کرد: ئەهای وەستا، قاڵبەکەت بە هەڵە هەڵگرتووە. ئەو قاڵبە هی ئەوێ نییە...

ئەوجا بێ ئەوەی ئاوڕ لە من بداتەوە گوتی: - دەبێ لیستەی موچەی کرێکارەکانیش بنووسیت...

- بەسەر چاو قوربان.

سەرۆك ئەندازیار گوتی: بە شاوڵ ئیش بکە...

وام زانی شاوڵ ناوی یەکێك لە کرێکارەکانە، گوتم: بەسەر چاو، هەرچی ئەوان بیڵێن ئەنجامی دەدەم...

سەرۆك ئەندازیار بە نا بەدڵییەوە گوتی: لەگەڵ تۆم نییە... بەو وەستایەم گوت کە بە شاوڵ کار بکات، تۆ بچو عەمارو دەفتەرەکە وەربگرە.

سەرۆك ئەندازیاران بە دەست عەمارەکەی نیشان دام و منیش بەرەو عەمارەکە کەوتمە رێ.. کە دوو سێ هەنگاو رۆییشتم سەرۆك ئەندازیاران هاواری کرد: "لە وێوە نا.. بێ لێرەوە"..

گەڕامەوەو گوتم: قوربان خۆتان فەرمووتان بۆ ئەوێ بڕۆم...

ئەندازیارەکە ئاوڕی دایەوەو گوتی: لەگەڵ تۆم نییە.. بڕۆ گوم بە.. ئەوەندە قسە مەکە.

کەوتمە رێ کە بڕۆم، دیسان سەرۆك ئەندازیاران هاواری کرد:

- گەوجە ئەوە بۆ کوێ دەچیت؟

زانیم کە دەستوور بە کرێکارەکان دەدا. چووم بۆ عەمارەکە و خۆم بە عەمادارەکە ناساند. عەمارداره‌کە بە سەرسامی قەدەرێ لێم ورد بووەوەو بە پێکەنینێکی تایبەتییەوە پرسی: کێ ناردوتی؟

- ئا!...

- خزمتە؟

بریا لاڵ بوایەمو وەڵامم نەدایەتەوە. یان درۆیەکی مەسڵەحەتم کرد بایە.. زۆر سادەو رێك و رەوان گوتم: - نەخێر.. کابرایەك بەزەیی پێمدا هاتەوەو داوای لە ئاغا کرد کە کارێکم بداتێ.

کە ئەمەی بیست کوتو پڕ سیمای گۆڕاو بە رقەوە گوتی: دەفتەرەکان لەو چەکمەجانەدایە برۆ دەریان بێنە...

پرسیم: - ئەم دەفتەرانە چین؟

بە پێکەنینێکی تەوس ئامێزەوە گوتی: دە وەرە لەگەڵ کێدا کار بکە. وا بزانم تازە لەقوتابخانەوە هاتوویت، لە ژێر لێوەوە بەر پەرچم دایەوەو گوتم: من چەندین ساڵ ژمێریار بووم و دەفتەرم نووسیووە.. مەبەستم ئەوەیە کە ئەم دەفتەرانە نوقسانن! دەفتەرەکانم خستە بن باخەڵم و لە عەمارەکە هاتمە دەرێ... خوایە تەگبیرم چییە؟ منێ کە سەرم لەم حیسابانە دەرناچێت.. نازانم چۆن بوو کاریان بە من دا؟ کارێکیش بەم زەحمەتییە؟

وەکو مەست سەرم گێژی دەخوارد... دڵم تێك هەڵدەهات. هەستم دەکرد کە ئەم ماستە بێ موو نییە! ئاخری خێر بێ خوایە.. دیسان چوومەوە بۆ لای سەرۆك ئەندازیاران، خەریك بوو دەستووری بە وەستاکان دەدا، کە ماوەیەك تێپەڕی ئاوڕی لێدامەوەو پرسی: چیت دەوێ؟

بە ترس و لەرزەوە گوتم: - قوربان دەستووری بدەن کە ژوورێکم بدەنێ شەوانە تێیدا بنووم..

بە ئیشارەی دەست ڕاڕەوی تەلارەکەی نیشاندام و گوتی: بڕۆ شەوانە لەلای کرێکارەکان بخەوە..

ئەو ڕاڕەوەی کە نیشانی دا بووم شێدارو تەپ و تۆزاوی بوو. کرێکارەکان هەر یەکی دوو - سێ تەختە داریان لەسەر زەوییەکە دانا بوو،و شەوان لە سەری دەخەوتن. منیش ناچار بووم لە تەك ئەوانەوە بخەوم، بەم حاڵە ڕازی بووم چونکە بەلای کەمەوە کارێکم دۆزیوەتەوەو دەتوانم ئەقدەسی خۆشەویستم بگوێزمەوە.

سبەی بەیانی هیلاك و ماندوو لە خەو ڕابووم، دەستم بە کارکرد. بە هەر زەحمەتێ بوو حیسابێ چیمەنتۆو تەختەو گونیەکانم دەرهێناو لە عەمارەکە ڕێکم خستن. نزیکی نیوەڕۆ یەك ترێلەی گەورە تەختە داریان هێنا. عەماردارەکە گازی کردم و گوتی: پسوولەی "١٢٤م٢"م بدەرێ.

چونکە بڕیارم دابوو بە دڵ کار بکەم، گوتم: ماوەم بدە با دارەکان لە مەتر بدەم، قۆنتەرات چییەکە راپەڕیٚ و گوتی: پێویست ناکات چما باوەڕت بە من نییە؟

گوتم: هەڵبەتە راست دەفەرمووی، بەڵام پێویستە منیش تەختە دارەکان لە مەتر بدەم...

قۆنتەراتچییەکە بە ئیشارەتی دەست کە نیشانەی هەق و حیساب بوو گوتی: زەحمەت مەکێشە.. دڵنیابە.. پسوولەکە بنووسە، ئێمەش ئیشی خۆمان دەزانین... درەنگە دەمەویٚ بڕۆم..

خۆم گێل کردو گوتم: پێوانە کردنی شتیٚ نییە.. هەمووی دە دەیقە نابات... ئەوجا بیٚ ئەوەی سەیری بکەم، دەستم بە پێوانە کردنی کرد، قۆنتەراتچییەکە زۆر نارەحەت بوو، بە قینەوە گوتی:

- هاتووی یاسا دروست بکەی...

گوتم: دارەکانم لە مەتردا، دانەیەکیش لە ١٠٠م ٣ کەمتر بوو، قۆنتەراتچییەکە بە نارەزاییەوە چوو بۆ لای عەمباردارەکە... بۆ دڵنیایی دیسان دەستم بە پێوانەی تەختەکان کردەوە.. بە دوو قۆڵی هاتن بۆ لای من. عەمباردارەکە بە شێوەیەکی دۆستانە گوتی:

- بۆ خۆت ماندوو دەکەی پسوولەکەی بدەیە با بڕوات.

سەرم هەڵبڕی و گوتم: "٢٤م٣"مان بەینە.

عەمباردارەکە پێکەنی و: بە هەڵەدا چوویت، تەواوە... پسوولەکەی بدەریٚ با بڕوات، من قەبوڵمە... قۆنتەراتچییەکە پارەیەکی دە لیرەیی دەرهێناو بۆی درێژ کردم: وەرە بابە.. ها بیگرە و شتەکە گەورە مەکەرەوە.. زۆر زوو دانت دەرکرد!.

عەمباردارەکە پێکەنی و گوتی: کوڕێکی چاکە! گوێرایەڵ و پاکە!

من بە واق ورماوی راوەستام بووم و سەیرم دەکردن. قۆنتەراتچییەکەش پارەکەی هەر لە نێو دەست دا بوو.

عەمباردارەکە گوتی: وەری بگرە. دەستی مەگێڕەوە...

من کشامە دواوە گوتم: من خاوە وەرناگرم... خیانەتیش لە ئاغام ناکەم...

دیسان سەرگەرمی پێوانە کردنی تەختەکان بوومەوە... عەمماردارەکە بە گوێی قۆنتەرات چییەکەیدا چپاندو گوتی: پێ دەچێ دە لیرە کەم بێ... بۆی زیاد بکە...

قۆنتەراتچییەکە بە بۆڵە بۆڵەوە وەڵامی دایەوە: دیارە زۆر گیرە..

دە لیرەی تری خستە سەر پارەکەو بۆی درێژ کردم: وەرە.. درەنگە هانێ.. وا دیارە دەتەوێ زوو بڕۆیت!.

دەستیم دایە دواوەو: من بەرتیل ناخۆم.. هەر چیت هێناوە پسوولەی ئەوەت دەدەمێ.

ئەمجارەیان قۆنتەراتچییەکە توڕە بوو: زۆرت لەسەر دەکەوێ ها!

گوێم پێ نەداو خەریکی پێوانە کردنی تەختەکان بوومەوە... قۆنتەراتچییەکە یەکڕاست چوو بۆ لای سەرۆك ئەندازیاران و بە دەم ئیشارەکردن بۆ لای منەوە گوتی: ئەم توحفەیەت لە کوێوە هێناوە؟ دەڵێی ئاخر زەلامە!.

سەر ئەندازیار گوتی: چی کردووە؟

– نازانم مەبەستی چییە، شەڕم پێ دەفرۆشێت.

سەر ئەندازیار هەر لەوێوە بانگی لێکردم:

– بۆ دارەکان وەر ناگریت کوڕە؟

گوتم: – نوقوسانی هەیە...

سەر ئەندازیار بە دەم ڕێنمونی کردنی وەستاکانەوە گوتی:

– تۆ هەقت نییە... بیدە بە عەمارو پسوولە لە عەماردار وەربگرە!...

لە مەبەستی تێ نەگەییشتم.. دیارە حاڵی نەبوو، ئەگینا سەر ئەندازیارێك دز نییە! گوتم: – قوربان قۆنتەراتچییەکە دەیەوێ فێڵ بکات.

سەر ئەندازیار بە ساردییەوە گوتی: تۆ هەقت چییە..

– من بەرپرسیارم! ئامادەنیم ساختە بکەم..

سەر ئەندازیار توڕە بوو،و گوتی: هەتیو لە کەلی شەیتان وەرە خوارێ، ئەگینا دەرت دەکەم ها!

بێ ئەوەی بزانم چی دەڵێم، گوتم: دەچم لە لای ئاغا شکایەت دەکەم...

سەر ئەندازیار بە رقەوە گوتی: وەڵڵا دەبێ پێت نیشان بدەم!.؟

سەر ئەندازیار و قۆنتەراتچییەکە بە پەلە چوون بۆ ژوورەکەی ئاغا.. عەماردارەکە وەکو یەکێك بە دیار لاشەی باوکییەوە دۆش داما بێ، سەری داخست و لەبەر دەرگای عەمارەکەدا وێستا. کە سەر ئەندازیار و قۆنتەراتچییەکە رۆییشتن گوتی: کارێکی باشت نەکرد.. بیست لیرەکەشت لە کیسی خۆتدا... لێرەش دەرت دەکەن پیاو نابێ زۆر گیر بێ، قۆنتەراتچی ناچارە بەرتیل بە باڵا دەستەکان بدات، ناچاریشە تۆڵەی ئەوەش بکاتەوە!

پر سیم: باشە کێ زیانی دارەکان دەبژێرێ؟!

- کەس!..

- چۆن دەبێ؟ کێ پارەی ئەم "٢٤م٣" دەدات؟

لەم کاتەدا فەڕاشەکەی ئاغا هات و گوتی: - وەرە ئاغا کاری پێتە... زۆر خۆشحاڵ بووم. هەموو شتێ روون دەبێتەوە. ئاغاش لەوەی کە بەرتیلم وەرنەگرتووەو قازانجی ئەوم پاراستووە خۆشحاڵ دەبێ و کرێکەم بۆ زیاد دەکات. بەخۆشی و پێکەنینەوە چوومە ژوورەوە. قۆنتەراتچی و سەر ئەندازیارەکەش لە ژوورەوە بوون. ئاغا بە توڕەییەوە لێم ورد بووەوەو گوتی: - بۆ پسوولەی تەختەکان نابڕیت؟

- قوربان "٢٤م٣" کەمە!

ئاغا زۆر بە ساردییەوە گوتی: جا کەمە بە تۆ چی؟ تۆ پسوولەکەی ئەم بدەو پسوولە لە عەماردارەکە وەربگرە!

لە سەرسامیدا خەریك بوو شاخم لێ بڕوێ. بە دەمی وشکەوە گوتم: - قوربان ئەم برادەرە دەیەوێ پسوولەی "٢٤م٣" زیاد وەربگرێ.

ئاغا نەڕاندنی بە سەرما: تیٚ دەگەم بابە... خۆ وەکو تۆ کەر نیم.. گوتم بە تۆ چی! تۆ پسوولەکەی بۆ ببڕەو بیدەریٚ.

پرسیم: قوربان "٢٤م٣" کەمە، ئاخر چۆن دەبیٚ؟

ئاغا بە تووڕەییەوە نەڕاندی: ئەریٚ تۆ کاڵەك خۆری یان بیٚستان ڕن.. ئەوجا ڕووی کردە سەر ئەندازیارو گوتی: کیٚ ئەم کەرەی دامەزراندووە؟

سەر ئەندازایاران گوتی: قوربان خۆتان نارد بووتان..

ئاغا بەسەرسامییەوە گوتی: من؟!... کەی ناردوومە؟

سەر ئەندازیار گوتی: قوربان دویٚنیٚ شەو دەستوورتان دا کە لە جیٚی پسوولە بڕەکەی پیٚشوو دای بنەین.

ئاغا بە دەست ئیشارەتی کرد من کە بچمە دەریٚ و هاواری کرد:

- بڕۆ گوم بە لەبەرچاوم... شیٚتە..

زانیم ئیدی جیٚی وەستان نییە... ئەگەر قسان بکەم بە پالٚ دەمکەنە دەرەوە، چووم بۆ عەمارەکە تا بوخچەی کەلوپەلەکانم هەلٚگرم و بڕۆم بە دوای بەختی ڕەشی خۆمدا، کە بە بەر عەمارەکەدا تیٚ دەپەڕیم، عەماردارەکە پرسی: ها چی بوو؟...

- دەریان کردم..

عەماردارەکە بە پیٚکەنینیٚکی تالٚەوە گوتی: تۆ هیٚندە کەللە ڕەق بی، تا ماوی دەبیٚ بە دوای کارا بگەڕیٚی!..

لە عەماردارەکەم پرسی: باشە وەختیٚ کە شت دیٚ بۆ عەمار یان شتی لیٚوە دەبریٚ.. حسیٚب و کتیٚبی نەبیٚ ئیدی بۆ سەنەد دەنووسن؟

عەماردارەکە پیٚکەنی و گوتی: کاکە ئەم شتانە تەنیا ڕوالٚەتە!

پرسیم: باشە، ئەی بۆ سوورن لەسەر ئەوەی فەرمانبەرانی دەست پاك و باوەڕپیٚکراو رابگرن؟

عەماردارەکە گوتی: ئەوە تۆ گالٚتەم پیٚ دەکەی یان هەر بەراستی بیٚ ئاگای؟

- نە وەلٚلا دەمەویٚ بزانم مەسەلە چییە؟

عەمارداڕەکە گوتی: فەرمانبەری دەست پاك و باوەڕپێکراو ئەوەیە بەبێ ئاگاداری بەرپرسیاری خۆی هیچ کارێك نەکات و هەر چییەکیش کە بەرپرسیارەکەی گوتی، بێ چەندو چون ئەنجامی بدات!...

ویستم یەك پرسیاری دی بکەم، سەر ئەندازیار هات بەسەراو هەر کە منی بینی هاواری کرد: ئەوە هێشتا لێرەیت.. یاڵلا شتەکانت هەڵگرەو گۆڕت گوم کە...

کراس و پانتۆڵێکی زیادەم هەبوو، لە ڕۆژنامەیەکمەوە پێچان و خستمە بن باخەڵم و هاتمە دەرێ... دیسان کەوتمە نێو کوچەو بازاڕەکان بە نیازی ئەوەی کارێك بدۆزمەوە.

دەنگی ماموره بستە باڵاکە بەرز بووەوە: "بچنە ژوورەوە.. کاتی خەوتنە". لە پڕ غەڵبە غەڵب نەماو.. بەندییەکان خزانە ژێر جێگاکانیانەوە.

## (١٤) کەسێك کە ناسنامەی نەبێ جێی متمانەوباوەڕنییە

زیندە بەرادەیەك ناسرا بوو کە زۆربەی بەندی و مامووڕەکانی زیندان دەیانناسی لە هەموو شوێنێکدا باس هەر باسی بەسەر هات و ژینی ئەو بوو. هەندێ جار مشت ومڕ دەکەوتە نێوان بەندییەکان و تەنانەت بە مامورەکانیشەوە لەسەر ڕاستی ودرۆیی قسەکانی ئەو!

– زیندە ئەم شتانە لە خۆیەوە دروست دەکات.

– بۆ ڕاست نەبێ! بەسەر هەموومان هاتووە.

– ئاخر... یەکێ – دووانی بۆ هەموو کەس ڕوو دەدات.

– بەڵام چۆن دەشێت ئەم هەموو کارەساتە بەسەر یەك کەسدا بێت؟

– ڕاستە زیندە بڕێ ترش وخوێ بە قسەکانییەوە دەکات، بەڵام لە بنچینەدا ڕاستن!

– بەچیدا مەعلومە؟...

– من پەنجا ساڵە لە زیندان دام... زۆرم لەم شتانە دیوەو بیستووە.. کەس وەکو زیندە ناتوانێ بەم شیرینییە حەکایەت بگێڕێتەوە.

– برادەران، چمان بەسەر راست و درۆوە داوە... مەبەست خۆ خلافاندن و کات بەسەر بردنەنە!

– راستە...

– کەواتە هەقت بەسەرەوە نەبێ، زوو کە با بڕۆین بۆ قاوشەکەو شیوەکەمان بخۆین. ئێستا چیرۆك گێرانەوە دەست پێدەکات.

جاران ئەگەر هەوا خۆش باو دنیا هەتاو بوایە، بەندییەکان تا بۆیان بکرایە درەنگ دەچوونە ژوورەوە. بەڵام لەم رۆژانەدا بۆ ئەوەی پاشماوەی حەکایەتەکەی زیندە بژنەون، هەر کەسە هەوڵی دەدا زووتر بچێتە ژوورەوەو جێی باش بۆ خۆی بگرێ... هەواڵی حەکایەتخوانی زیندە گەیی بووە قاوشەکانی تریش، شەوان لە قاوشەکانی دییەوە بۆ گوێ گرتن دەهاتن، بۆیە زیندە هەوڵی دەهاتن، بۆیە زیندە هەوڵی دەدا هەر شەوەی چیرۆکێکی تەواو بگێڕێتەوە تا ئەگەر مشتەری تازە هەبن لەزەت لە چیرۆکەکەی وەربگرن.

ردێن سپی قاوشەکە دەستووری دا کە چەند چایەك بۆ میوانەکان بێ و گوتی: دەی برادەران هەر کەس لە جێی خۆی دانیشێت، زیندە دەیەوێ دەست بە چیرۆکەکەی بکات...

زیندە دەستی پێکرد: – برادەران کەسێ خۆی ئەم کارەساتانەی نەجەرباندبێ، ناتوانێ هەست بەوە بکات کە من چ رەنج و داخێ دەکێشم. خوا بە نسیبی دوژمنیشی نەکات. دیسان هەر شوکرم، گەلێك هەن لە منیش بەدبەخت ترو چارە رەش ترن.

بەندییەك بە دەنگی بەرز هاواری کرد: – خاڵۆ، چ حەیوانێ لە ئێمە بەدبەخت ترە؟

ردێن سپی قاوشەکە لە پێکەنینا کەوتبووە کۆکە کۆک، بە ئیشارەی دەست بەندییەکانی بێدەنگ کردوگوتی: نا شوکری مەکەن.. خوا خراپتریشی لایە... لیَ گەڕێن بازیندە چیرۆکەکەی بڵیَ.

کە هەموو بێدەنگ بوون، زیندە گوتی: لە ئێمە بەدبەخت تر ئیحسان خانمە، هەر چەندە لە نێو زێڕو زیودا دەگەوزیَ، بەدبەخت ترین ئینسانی ئەم سەر زەمینەیە.

یەکێك لە بەندییەکان پرسی: ئیحسان خانم کێیە؟

زیندە هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو گوتی: ئەگەر بیرتان مابیَ ئەقدەسی خۆشەویستم لەماڵی ئیحسان خانم دا کاری دەکرد، ئەو ئیحسان خانمەی کە خاوەنی کۆشکێکی شاهانەیەو ماڵەکەی دەڵێی بەهەشتە. کە لە کاری پسوولە بڕین دەریان کردم، سەیرم کرد نە شوێنیَ هەیە رووی تیَ بکەم و نە پارەم هەیە پارووە نانێکی بکڕم. گوتم وا چاکە بڕۆم سەردانێکی ئەقدەس بکەم... هەم نانێك بخۆم و هەم خەم و خەفەتی دڵم فەرامۆش بکەم....

ئەقدەسی خۆشەویستم... ئومێدو هیوام... لە ئاشخانەکەدا بوو.. وەکو فڕفڕۆکە دەخولایەوەو کاری دەکرد. دەك لە دەوری ئەو قەدو باڵایەی گەڕێم. جلی تازەو جوانی لەبەر کردبوو. قژەکەی کۆکردبووەوەو لە شێوەی چەپکە گوڵێك دا بە تەوقە بەستبووی. بە ئەسپایی لە شووشەی پەنجەرەکەم دا. ئەقدەسی نازەنینم زۆر ترسا. قیژەیەکی کورتی کرد، قاپەکەی دەستی کەوتە سەر عەردو شکا. کە منی بینی دەستی خستە سەر سینگی و لەسەر کورسییەك دانیشت.

چەند دەیقەیەك ماتەڵ بووم، تا هاتەوە سەر خۆی. تۆزیَ ئاوی خواردەوەو پەنجەرەکەی کردەوە، وەکو قارەمانی نێو فیلم بە پەنجەرەکەدا هەڵزنام و خۆم بە ئاشخانەکەدا کردو گوتم: ئەوە چی بوو؟ ئەدی خۆت نەتگوت هەر کاتیَ هاتم لە پەنجەرەکە بدەم.. بۆ ترسایت؟ بە نازو عیشوەوە خۆی هاویشتە باوەشم وگوتی: زۆر ترسام... هێندەی نەما بوو منداڵەکەم لە بار بچیَ!

یەك – دووانێ لە بەندییەکان گوتیان: نۆبەتی ئەم قەوانەیە!..

وەك بڵێی لە پڕ کوتەکێکیان بەسەرما کێشا بێ... داچڵەکیم، خەریك بوو دڵم لە لێدان بوەستێ. گوتم: ح...و... منداڵی چی؟!.

ئەقدەس بە هەردوو دەست سەری گرتم و تۆزێ یاری بە قژەکەم کردو گوتی: ئارام بە، خانمی گەورە دەنگت دەژنەوێ!...

لە کاتێکا کە سەراپام دەلەرزی پرسیم: باشە کە تۆ سکت هەبوو، بۆ زووتر پێت نەگوتم تا پتر خۆشحاڵ ببم...

– نەمویست لەو دەمانەدا کە بێکار بویت ئەم هەواڵەت بدەمێ.. سەبرم کرد تا کارەکان رایی ببێ و کارێك بدۆزیتەوەو موچەت دیار ببێ و ئەوجا ئەم مژدەیەت بدەمێ!..

سەراپام نیشتە ئارەقە.. لە دڵی خۆمدا گوتم: "باشە ئەقدەس لە کوێ زانیویەتی کە کارم دۆزیوەتەوە. ئەی ئەگەر بزانێت دەریان کردووم، تەگبیرم چییە؟!".

تاقەتی قسە کردن و تەنانەت هەناسەدانم نەبوو. لەمە ناخۆشتر نەبوو کە لەم کاتەدا مژدەی بوونە باوکی پێدام، ئەقدەس کە هەستی بە حاڵم کرد، بەو خەیاڵەوە کە گوایە گەشکەدار بووم، بە نازو غەمزەوە گوتی:

– زۆرت حەز دەکرد ببی بە باوك؟!

گوتم: لە منت کەوێ ئەی چۆن! گوایە لەمە خۆشتر هەیە؟!

ئەقدەس لەسەر ئەژنۆکانم دانیشت و گوتی:

– دەمزانی، بەڵام نەك تا ئەم رادەیەی کە رەنگت زەرد ببێ و هەناسەت سوار ببێ! ئارەقەکەی نێو چەوانم سڕی و گوتم: ئاخر بە دەستی خۆم نەبوو... ئەقدەس دەستی لە ملم کردو گوتی:

– ئێستا دەمەوێ مژدەی دووەمت بدەمێ!..

دیسان دڵم کەوتە ترپە ترپ. خوایە مژدەی دووەم چی بێ؟!

ئەقدەس نازی دەکردو بە نازەوە سەری دەخستە سەرم، بە پاڕانەوەوە گوتم:

- خێرا بڵێ بزانم مژدەی دووەم چییە؟!

بەڵام ئەقدەس دەیویست زیاتر سەر بخاتە سەرم... خۆم پەست کردو بێدەنگ بووم، ئەقدەس کە زانی بێ تاقەت بووم گوتی: لەو شەوەوە کە لە باخەکەدا بووین، بڕیارم دا کارەکەمان یەك لاییی بکەمەوە.. بیرم کردەوە. بە تاسەوە پرسیم:

- قوربانی دەمت بم، بیری چیت کردەوە؟!

- بیرم کردەوە کە بە دوو قۆڵی لە یەك شوێندا کار بکەین.

- جا کاری وا کوانێ؟

- دە... ئەمە گرنگە... من ئەم کارەم دۆزیوەتەوە..

- لە کوێ؟

- هەر لەم ماڵەدا.. لەلای خانمی گەورە.. کوڕی خانمی گەورە ماوەیەك لەمەوپێش ژنی هێناو لێرە ڕۆیی.. ئەم خانووە بەم گەورەیەیە بۆ من و خانمی گەورە زۆرە. بە دوای یەکێکدا دەگەڕێین کە بە بەڕۆژەوە کاری بازاڕمان بۆ بکات... و شەوانیش پاسەوانی بکات. من بە خانمی گەورەم گوت کە تۆ ڕابگرێ..

به پەرۆشەوە پرسیم: ناسنامەی ناوێ؟

ئەقدەس پێکەنی و گوتی: چما ئێرە دایەرەی دەوڵەتییە؟

- باشە لە کەیەوە دەست بە کار بم؟

- لەمرۆوە..

لە خۆشیاندا هێندە ئەقدەسم بە توندی بە خۆمەوە گوشی خەریك بوو منداڵەکەی لە بار بچێ... هاوارێکی کورتی کردو گوتی:

- بۆ شێت بوویت؟!

- مژدەی ویساڵی تۆ شێتی کردووم.. باشە کاری من چییە؟

ئەقدەس پێکەنی: گەشکە نەتگرێ. جارێ دەبێ خانمی گەورە بت بینێ و بڕیاری خۆتان ببڕنەوە.

گوتم: باشە ... هەرچی دەکەی زووتر...

بڕیار بوو لە پەنجەرەکەوە بچمە دەرێ‌و دیسان وەکو ئەوەی تازە لە ڕێوە گەییشتبم، بچمە بەر دەرگاو لە زەنگ بدەم، لە باخەکەوە ڕۆییشتم، زەنگی دەرگام لێدا، ئەقدەس هات و دەرگای کردەوە... چوومە ژوورەوە.

گوتی: خانمی گەورەم لە هاتنت ئاگادار کردەوە... با بچین بۆ لای تا بت بینێ....

– با بڕۆین...

– ئاوا نابێ... ڕاوەستە..

– چی بکەم؟!

– خانمی گەورە تۆزێ وەسواسە، دەبێ لە پێشەوە پێڵاوەکانت دابکەنی...

زیندە هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو گوتی: فەلەك بۆ لە ئاستی خەمەکانی مندا کەڕو نابینایت!

یەکێك لە بەندییەکان پرسی: چما چی بوو؟...

زیندە، دڵۆپە فرمێسکەکەی سەر گۆنای سڕی و گوتی: کە پێڵاوەکانم داکەند، بۆنی ئارەقە خانووەکەی پڕ کرد، ئەگەر خانمی گەورە بۆنی کردبا، دڵ و دەروونی دەردەهات. ئەقدەس ئافرەتێکی فامیدە بوو، بێ ئەوەی بەسەر خۆی بێنێ، دەستی گرتم و بردمی بۆ حەمامەکەو گوتی: پێت بشۆ تا بچم جووتێ گۆرەوی پاکت بۆ بێنم..

دوای ئەوی پێم شت ودەست ودەمو چاوم شت پێکەوە چووینە نهۆمی سەرەوە... داخڵی ژوورەکەی خانمی گەورە بووین... چ ژوورێ! چ ناو ماڵ و تفاقێ! چ رایەخ و قەنەفەیەك! چ ئاوێنە بەندێك!... ژووری نووستنی پاشاش وانابێ!

عەینی ئەو کۆشکانە بوو کە لە فیلمدا بینی بوومن.. وێنە.. نەخش‌و نیگار.. ئاوێنە پیاوێان وڕدەکرد...

کە چاوم بە سووچ و کەلێنی ژوورەکە راهات وهەموو شوێنەکانم بە چاکی بینی.. نۆرە هاتە سەر بینینی خانمی گەورە... تەماشای هەموو لایەکم کرد کەچی چ هەوالێك لە خانمی گەورەوە نەبوو.. تەنانەت لە سەر جێگاکەشی نەبوو. ئەگەر ئەقدەس تێوەی نەدەژەندم، هەر نەمدەزنی خانمی گەورە لە کوێیە... کە سەیری ئەو شوێنەم کرد کە ئەقدەس نیشانی دام، چیم ببینم خوایە؟ کێوێکی گۆشتینم لەسەر موبیلەیەکدا بینی. قژەکەی بژ، تەنیا بە سەر لە بنیادەم دەچوو. نزیکەی هەشتا ساڵ و بگرە زۆر زیاتریش بوو!...

ئێستا بۆم دەرکەوت کە بۆچی ئەقدەس دەیگوت: خانمی گەورە ناتوانێ لە ژوورەکەی بێتە دەرێ، بەستەزمانە هێندە قەڵەو بوو نایتوانی لە جێی خۆی بجوڵێ، چ جای هەستان و رۆییشتن..

ئەقدەس گوتی: خانمی گەورە.. ئەگەر یادتان مابێ، پێم گوتبوویت خزمێکم هەیە ئامادەیە بێت لێرە کار بکات، ئەوا هاتۆتە خزمەتتان..

خانمی گەورە وەك ئەوەی لە ناو چاڵەوە قسان بکات: ئەها، دەزگیرانەکەتە؟ ئەرێ.

بە دەست ئیشارەتی بۆ کردم و گوتی: وەرە پێشەوە بزانم.

چوومە پێشەوە. خانمی گەورە عەینەکەکەی گۆڕی، وەك بڵێی بیەوێ شتێك بکڕێ، ماوەیەك سەیری کردمو پرسی: نێوت چییە؟

– زیندە...

خانمی گەورە پێکەنی و گوتی: ئەمە چۆن ناوێکە؟

گوتم: خانمی گەورە ئەمەش جۆرە ناوێکە.. چیرۆکی من زۆر درێژە، دوایی عەرزتی دەکەم...

خانمی گەورە بە دەست ئیشارەی کرد کە قسان نەکەم، و گوتی:

– من لەم خانووە گەورەیەدا بە تەنێ دەژیم، کچەکەم و زاواکەم لە ئەمریکان.. کوڕێکم بە ماڵ و منداڵەوە لە فەڕەنسایە. کوڕە بچووکەکەم تازە ژنی

هێناوەو هەفتەی جارێك سەرم لێ دەدات.. ئەقدەس ئیش و کاری ماڵەوە ئەنجام دەدات و تۆش ئیش و کاری دەرەوە بکە...

- بەسەر چاو خانمی گەورە.

- من زۆر لە ئەقدەس رازیم... تۆش کە دەزگیرانی ئەویت و مەحرەمی یەکدین.. ئیدی خەیاڵم رەحەتە!.

ئەوجا رووی کردە ئەقدەس و گوتی: ژوورەکەی پێ نیشان بدەو خۆت کارەکانی دی ساز بکە.

- بەسەر چاو خانمی گەورە..

لە ژوورەکەی خانمی گەورە هاتینە دەرێ. گوتم: کیژێ ئەم خانمی گەورەیە، کرێکەی دیاری نەکردم و نەیگوت مانگی چەندم دەداتێ...

ئەقدەس تووڕە بوو، و گوتی: وس بە.. تۆ نەجیب زادەو خانەدانان ناناسیت.. بە تایبەتی خانمی گەورە... تۆ نازانی چەند دەست و دڵ کراوەو تێرە.. پارەو خۆڵی لەلا یەکە..

ئیدی لەو رۆژەوە دەست بە کار بووم... هێندە بە دڵ و بە گیان کارم دەکرد هەر مەپرسە. خانمی گەورەش وەك ئەقدەس گوتبووی ژنێکی بەرچاو تێر بوو. هیچ کاتێ حیسابی پارەی نەدەکرد.. کە بە رۆژەوە دەچوومە بازاڕو شتم دەکڕی و دەگەڕامەوە، دەمویست باقی پارەکەی بدەمەوە کە چی قەبوڵی نەدەکردو دەیگوت: هی خۆتە!.

ئیدی رۆژ، رۆژی من و ئەقدەس بوو. هەم کارەکەمان سەخت و ناخۆش نەبوو، هەم تێرمان دەخواردو دەخەوتین. رۆژ بە رۆژ پاشەکەوتمان زیاد دەبوو. ئیدی هیچ خەمو پەژارەیەکمان نەبوو، تەنیا بیرمان لەلای ئەوە بوو کە ئەگەر منداڵمان ببێ تەگبیرمان چییە..

هەموو بەیانییەك دەچووم بۆ بازاڕ، شتم دەکڕی و دەگەڕامەوە، تا دەمەو عەسر لە نێو باخەکەدا خزمەتی گوڵەکانم دەکرد یان لە پاڵ ئەقدەس دا

رادەکشام و رازو نیازمان دەکرد. ڕۆژگارمان بە خۆشی دەگوزەراندو لە هیچمان کەم نەبوو. تا ڕۆژێك لە زەنگ درا...

چونکە لەو کاتانەدا شیر فرۆشەکە دەهاتو منیش هەمیشە شۆخیم لەگەڵ دەکرد، بەرەو دەرگا رام کرد، بەدەم کردنەوەی دەرگاوە گوتم: شیرەکەت خراپە! وەلێ کە لە بری شیر فرۆشەکە، پاسەوانێکی تووڕەی سمێڵ بابڕم بینی راچڵەکیم و ترسام.. پاسەوانەکە بە دەنگێکی گڕ گوتی: "ئیحسان لەماڵە؟".

تێکڕای خەڵکی گەڕەك، دۆست و ئاشنا، تەنانەت بێگانەکانیش بە خاوەن خانووەکەیان دەگوت خانمی گەورە، و ڕێزی زۆریان لێ دەگرت. کەچی پاسەوانەکە گوتی "ئیحسان"و وشەی خانمی نەخستە پاڵ، زۆر تووڕە بووم و منیش بە هەمان توندی ئەو وەڵامم دایەوە: ئیحسان ناومان نییە.. ئێرە ماڵی خانمی گەورەیە.. خاتوو ئیحسانە...

ئەمجارەیان تووڕەتر گوتی: چەنەبازی مەکەو بە کورتی وەڵامم بدەوە، ئیحسانم گەرەکە...

منیش بە هەمان تووڕەیی گوتی: ئیحسان ناومان نییە.. خاتوو ئیحسان خانم هەیە.

– بانگی کە با بێ...

– ناتوانێ بێت..

– چۆن ناتوانێت بێت؟

– چۆن و مۆن نییە؟ ناتوانێ بێت و بڕایەوە. هەر کارێکت هەیە بە من بڵێ... و ئاگاداری دەکەمەوە.

پاسەوانەکە زۆر تووڕە بوو، وگوتی: دەبێ هاتنێکی نیشان بدەم چۆن حەز بکات.

– زۆر چاکە.. بزانم نیشانی بدە!

– کەواتە بەم شێوەیە... بەرانبەر بە یاسا دەوەستیت؟

- نە گیانە... ئێمە بەرانبەر بە یاسا ناوەستین.. چونکە خانم گەلێ قەڵەوەو ناتوانێ لە قاڵدرمەکان بێتە خوارەوە...

پاسەوانەکە کە ئەم قسەیەی ژنەوت کەمێ هێور بووەوە و گوتی:

- بنیادەمێکی جاحێڵ هێندە قەڵەو نابێت کە...

بە سەرسامییەوە وەڵامم دایەوە: جاحێڵی چی؟! هەشتا ساڵ پترە! کابرای پاسەوان لە سەرسامیدا دەمی داچەقی و لە ژێر لێوەوە گوتی: لا حەولە وەلا.. ئەمە چ فێڵێکە؟

پرسیم: قوربان، مەسەلە چییە؟

پاسەوانەکە کە دەستەیەك کاغەزی لە جانتاکەیدا دەرهێناو بە توندی کێشای بە نێو لەپی خۆیدا و گوتی: لەم کاغەزانەدا نووسراوە ٢٢ ساڵە. کاغەزی رەسمی دەوڵەت هەڵە نابێت. لە قاقای پێکەنینم داو گوتم: بە پێچەوانەوە هەرچی هەڵە هەیە وا لە نێو کاغەزی رەسمی دەوڵەتی دایە!

پاسەوانەکە بەم قسەیە زۆر قەڵس بوو، و گوتی: ئاگات لە دەمت بێ کوڕە.. نابێ گاڵتە بە دەوڵەت بکرێ...

زانیم قسەیەکی خراپم کرد، بەڵام نەم هێنایە سەر خۆم لە گێلی داوگوتم گوتم:

- بە راستمە قوربان.. منیش لە کاغەزی رەسمی دەوڵەتیدا هەشتا ساڵ لەمەو پێش مردووم کەچی وا دەبینی لە بەردەمی تۆدا وێستاوم..

پاسەوانەکە لە تووڕەییدا دەلەرزی، قسەکانی منی بە تەوس و توانج دەزانی، ددانەکانی بە چیڕا بردو گوتی: زۆر چاکە، گوتت ئیحسان ٧٠- ٨٠ ساڵە؟

- بەڵێ، وەکو عەرزم کردیت لەوانەیە ٩٠ ساڵیش ببێ.

- ئەی چۆنە تا ئێستا نەچووە بۆ سەربازی؟

بە پێکەنینەوە وەڵامم دایەوە: ئاخر ژن ناچێتە سەربازی!

پاسەوانی بێچارە وڕو کاس بوو بوو، بە تووڕەییەوە گوتی:

- ئەم ئیحسانەی کە دایەرەی سەرباز وەزیفە بە دوای دا دەگەڕێ پیاوەو تەمەنی ٢٢ ساڵە.. خێرا بچۆ بانگی بکەو لەوە پتر سەر مەخە سەرم.

زانیم پاسەوانەکە باوەڕی بە قسەکانم نەکردووە، گوتم: بەسەر چاو، هەر ئێستا دەچم پێی دەڵێم و وەڵامت لێ دەگێڕمەوە.

- خێراکە.. ماتەڵ مەبە.

چوومە نهۆمی سەرەوەو بە خانمی گەورەم گوت: خانمی گەورە، پاسەوانێك هاتووەو دەڵێ گوایە ئێوە سەربازی فیرارن!

خانمی گەورە هەوەڵ جار حاڵی نەبوو، کە شتەکەم بۆ دووبارە کردەوە لە قاقای پێکەنینێکی ئەوتۆی دا کە تەواو ترسام... تا ئەو کاتە نەم بینی بوو خانمی گەورە بەو شێوەیە پێبکەنێ... دوای ئەوەی پێکەنینەکەی تەواو بوو، پرسی: پاسەوانەکە لە کوێیە؟

- لەبەر دەرگایەو چاوەڕێی وەڵامە...

- بڕۆ بیهێنە سەرەوە.. بەڵام وریا بە پێڵاوەکانی لە خوارەوە دابکەنێ.

گەڕامەوە بەر دەرگاو بە پاسەوانەکەم گوت: - خانمی گەورە چاوەڕوانتە.. فەرموو.

لەگەڵ پاسەوانەکەدا چووینە ژوورەوە. لە پاینی قاڵدرمەکەدا پێم گوت: - بە ئەرك نەبێ پێڵاوەکانت دابکەنە.... ئەگەر کەسێك بە پێڵاوە بچێتە ژوورەوە خانمی گەورە قیامەت رادەکات.

پاسەوانەکە لەوانە نەبوو، هەروا بە هاسانی پێڵاو دابکەنێ، بەڵام کە دیکۆری قالی و رایەخی گران بەهای بینی، ناچار دانەوییەوە، قەیتانی قۆندەرەکانی شل کردەوەو دای کەندن. بە ئەسپایی دەرگای ژوورەکەی خانمی گەورەم کردەوەو بە ئیشارەی سەر گوتم: بچۆ ژوورەوە..

پاسەوانەکە لای دەرگاکەوە سەیری کرد، کە بینی خانمی گەورە لە ژێر جێگادا راکشاوە، بە ئەسپایی گوتی: ئەمە ئیحسانە؟

سەری ئەرێم بۆ لەقاند. وەلێ پاسەوانەکە باوەڕی نەدەهات و دوو دڵ بوو لەوەی بچێتە ژوورەوە. خانمی گەورە لە ژێر لێفەکەوە بانگی لێکرد:

– کاکی پاسەوان وەرە ژوورێ.. بیستوومە هاتوویت بم بەیت بۆ سەربازی؟

پاسەوانەکە بە ملە جاوکێوە گوتی: و.. وا .. چ .. چی .. بڵێم.

خانمی گەورە کەمێك هەڵکشاو گوتی: – بڵێ بزانم مەسەلە چییە؟

پاسەوانەکە گوتی: بێگومان گۆڕاوە...

خانمی گەورە بە پێکەنینەوە گوتی: چی... چی گۆڕاوە؟

– راستیەکەی لە دەفتەری ئێمەدا، ئیحسان ناوێك کە ئەدرەسەکەی ئێرەیە، سەربازی فیراره...

خانمی گەورە بە پێکەنینەوە گوتی: سەرۆکی دایەرەکەت من باش دەناسێت.. برۆ پێی بڵێ خوا بۆ خۆی بیباتەوە!

پاسەوانەکە کاغەزێکی لە نێو دەستە کاغەزەکانی دەرهێناو بە دەنگی بەرز خوێندییەوە: نێوتان ئیحسان نییە؟

– بۆ نە ء... ئیحسان یەکانە.

پاسەوانەکە سەلماندی: راستە.. ئەی نێوی بابت؟

– بابم لە موڵکدارە گەورەکان بوو. رەحمەتی بە ئەعزەمل سەڵتەنە مەنشووره..

– ئەمەش دروستە... ئەی نێوی دایکت؟

– رەحمەتی، ئەشرەف سادات.

پاسەوانەکە چەند جارێك چوك.. چوکی کردو گوتی: هەموو نیشانەکانت لەگەڵ جەلبەکەدا جووتە، تەنیا تەمەنتان کارەکەی گەن کردووە.

خانمی گەورە بە تەوسەوە گوتی: ئەی ئافەرین بۆ خۆتان.

پاسەوانەکە بە نە باوەرییەوە گوتی: خانم، سبەینێ وێنەیەك لە ناسنامەکەتان بێننو وەرن بۆ دایەرە، تا فایلەکەتان رێك بخەین و رەوانەی سەرباز وەزیفەی بکەین.

خانمی گەورە بەپەستییەوە گوتی: رۆڵە گیان، بەخۆت حاڵی من دەبینی؟ من چۆن بەم کەلەشەوە بێم بۆ دایەرە؟

– قەیناکات خانم، قەڵەوی شەرم نییە.. بەڵکو تەشریف دێنن.

– مەسەلە شەرم و نا شەرم نییە... ناتوانم بەرێوە بڕۆم...

پاسەوانەکە گوتی: بە گوێرەی یاسا، پێویستە پەیڕەوی جەلبی پۆلیس بکەن.. پاسەوانەکە ئەوەی گوت و بە پەلە چووە دەرێ. تا من رام کرد گازی بکەم لە دەرگای باخەکەش تێپەڕی بوو... چ چارەیەکمان نەبوو. دەبوایە هەر چۆنێ بووە خانمی گەورە بۆ دایەرە بەرین.. ژنێ بەو قەڵەوییە. چۆن لە قاڵدرمەکان هێنامانە خوارێ! چۆن سواری گالیسکەمان کردو بە چ زەحمەتێك بۆ دایەرەمان برد، چیرۆکەکەی زۆر دوورو درێژە. من باڵێکیم گرتبوو. ئەقدەسیش باڵەکەی تری. بەستەزمانە وەکو جوجکەیەك چوو بێتە ژێر باڵی مریشکێکی بێگانەوە لەقە فرتێی دەکرد. دەترسام ئەقدەسی نازەنینم دەرەقەتی نەیات و منداڵەکەی لە بار بچێت. بە تەنیاش نەم دەتوانی ئەم کێوە گۆشتینەیە هەڵگرم. درۆم نەکرد بێ نزیکەی دوو سەد کیلۆ دەبوو. دەترسام لە قاڵدرمەکان بکەوم و خانمی گەورەش بەسەرم دا بڕمێ و وردو خاش ببم! ئاقیبەت بە هەر زەحمەتێ بوو، بە هانکە هانك خانمی گەورەمان بۆ دایەرە برد.. سەرۆك دایەرە لەبەر خانمی گەورە هەستا، کورسییەکی نیشان داین، بەڵام ئێمە ئاقڵیمان کرد لە سەر کورسییەکە دامان نەنا، لە سەر موبیلەیەکی تەختە دامان نا.

سەرۆك دایەرە بە رێزەوە گوتی: خانمی گەورە، داوای لێبوردن دەکەم.. چەند دەیقەیەك لەمەوپێش هەواڵیان دامێ.. بەڵام چ چارێکمان نەبوو. خۆت لە من باشتر یاسا دەناسیت.. ئێمە ناچارین بەپێی یاسا کار بکەین!

سەرۆك دایەرە هەوڵی دەدا هەموو گوناحەکان بخاتە ئەستۆی یاسا، خانمی گەورە بێ ئەوەی خۆی شێلو بکات گوتی:

– زۆر چاکە، منیش پەیڕەوی یاسام کرد بۆیە هاتمە خزمەتتان تا بە چاوی خۆتان ببینن کە ژنم؟! ئەمەش وێنەی ناسنامەکەمە، کە داواتان کرد بوو.

سەرۆك دایەرە، وێنەی ناسنامەکەی وەرگرت، بۆ ئەوەی دڵنەوایی خانمی گەورە بکات پرسی: حەز لە چی دەکەن؟ چای.. قاوە یان ساردییەکی فێنك؟

خانمی گەورە گوتی: هیچ ناخۆمەوە رۆڵەگیان.. زووتر کارەکەم راپەڕێنە با برۆم، زۆر ماندوو بووم.

سەرۆك دایەرە لەپشت مێزەکەیەوە دانیشت و گوتی: تەنیا چەند پرسیارێکمان هەیەو ئەوجا تەشریف بەرن.

خانمی گەورە بە توڕەییەوە گوتی: پرسیاری چی؟

- تا روون ببێتەوە کە پیاوی یا ژن!

- یانی چی؟ دوای ئەم هەموو تەمەنە، دوای ئەم هەموو کوڕو کچە، تازە دەتەوێ تاقیبی ئەوە بکەیت کە پیاوم یان ژن!!..

- خانمی گەورە ئێمە چ تەخسیرێکمان هەیە؟ یاسا دەڵێ بۆ هەر سەربازێك فایل بکرێتەوە.

- یاسا دەڵێ: "سەرباز" ئەمە چ پێوەندییەکی بە منەوە هەیە؟

- راستە... هەڵەیەك رووی داوەو پێویستە بە گوێرەی یاسا هەڵەکە راست بکرێتەوەو فایلی پێ بکرێتەوە تا جارێکی دی یەخەتان نەگرن!.

خانمی گەورە بە نەبەدڵییەوە ملی دایە خەت.

- زۆر چاکە، مادام مەسەلەکە یاسایە، چۆنت ئارەزووە وا بکە..

سەرۆك دایەرە بە خەتی خۆی بەڵگەی ژنایەتی "ئیحسان" وەك چۆن لە خانمی گەورەدا هەبوون، تۆمار کرد، دوو پاسەوان و منو ئەقدەس بەڵگەنامەکەمان ئیمزا کردو هاتینە دەرێ، کە بە هەزار شەڕە شەق خانمی گەورەمان گەیاندەوە ژوورەکەی خۆی، هەر سێکمان لە شەکەتی دا هەناسەمان پێ نادرا! خانمی گەورە مۆڵەتی داینێ و گوتی: رۆڵە، دەزانم زۆر ماندوو بوون. ئەوشۆ هەردووکتان ئازادن. بچن بەلای کەیف و خۆشی خۆتانەوە، من هیچ کارێکم پێتان نییە..

ئەوە شەوە من و ئەقدەس تەواو پشوومان دا.. لە بەینی خۆمانا دەمانگوت: بریا فایلەکەی خانمی گەورە هەر وا زوو تەواو نەبێ و هەفتەی دوو سێ جار بانگ بکرێ..

زۆری پێ نەچوو، ئارەزووەکەمان هاتە دی.. رۆژێك دیسان پاسەوانێك هاتە بەر دەرگاو گوتی: خانمی گەورە دەبێ تەشریف بێنێ بۆ دایەرەی سەرباز وەزیفە.شتێکی گرینگ نییە..هەندێ مەسەلەی یاساییەو دەبێ ئەنجام بدرێ..

خانمی گەورە، لەسەرەتادا ئەم بەزمەی پێ ناخۆش نەبوو، بەلاّم وردە وردە عادەتی پێوە گرت وگوتی:مادام شتەکە یاساییە دەبێ برۆین..

دایەرەی سەرباز وەزیفە وەکو دایەری پۆلیس نزیك نەبوو، خانمی گەورەمان سواری گالیسکە کردو بۆ دایەرەی سەرباز وەزیفەمان برد. برادەران، وا خەیالّ نەکەن ئەم کارە هەروا بە هاسانی بڕایەوە!.

یەکەم، دوو سێ جاران خەریك بوو بکەومە ژێر خانمی گەورەوەو لە ژێر لاشە دوو سەد کیلۆییەکەی ئەوەوە فاتیحام بۆ بخوێنن.. دووەم، سوودمان لە چوونە دایەرەی پۆلیس وەرگرتبوو، گالیسکەیەکمان بۆ خانمی گەورە بە کرێ گرت کە هەم ئەسپەکانی بەهێز بوون و هەم دەرگاکەی گەورە بوو. هەلّبەت کوڕو کچەکانی خانمی گەورە هەموویان ئوتۆمبیلی چاك و دوا مۆدیان هەبوو، دەیان توانی بۆ کوێی بوێ بیبەن. بەلاّم خانمی گەورە نەی دەویست کەس بەمە بزانێت! شەرمی لە بووك و زاواکانی دەکرد. من و ئەقدەسیشی راسپارد بوو کە بەوان نەلّێین.. کە گەییشتینە دایەرەی سەرباز وەزیفە، بوو بە پێکەنین و هەراو قەرەبالّغییەکی ئەوتۆ کە سەرۆك دایەرە بە خۆی هاتە دەرێ. خانمی گەورە بە توڕەییەوە بە سەرۆك دایەرەی گوت: قوربان، کامە یاسا دەلّێ من سەربازم؟.

سەرۆك گوتی: خانمی بەڕێز، گومانی تێدا نییە کە هەلّە بووە، بەلاّم ئێمە دەبێ بە گوێرەی یاسا کار بکەین.

– چ یاسایەك كوڕم؟ من ژنێكی بەتەمەنم... كوڕ و كچم شوویان كردووەو ژنیان هەیە... وا نەوەكانم گەورە بوون.. هەر ئەمەم كەم بوو كە تازە بۆ سەربازی بانگ بكرێم؟

سەرۆك گوتی: توڕە مەبن خانمی بەڕێز.

– چۆن توڕە نەبم؟ ئەگەر یەخەی یەكێك لە ئێوە بگیرێ و بڵێین ژنن چی دەكەن؟ منیش وام بەسەر هاتووە...

سەرۆك دایەرە یەكەمجار توڕە بوو، ئەوجا پێكەنی و بە نەرمی گوتی:

– هەق بە تۆیە خانمی بەڕێز.

خانمی گەورەش هێدی بووەوەو گوتی: عەمر درێژ بی، ئەوە دوو مانگە هاتوچۆم پێ دەكەن.. ئەگەر شارەزا نەبام ئێستا جلی سەربازیشیان لەبەر كرد بووم!

سەرۆك دایەرە هەر چۆنێ بوو خۆی گرت و پێ نەكەنی.. گوتی:

– بەداخەوە هەندێ جار ئەم هەڵانە روو دەدەن، هەڵبەتە ئەوەی تۆ زۆر گرنگ نییە، زوو جێبەجێ دەبێ... تەنیا تكایەكمان لێت هەیە..

– فەرموو رۆڵە.. چ تكایەك؟

– تۆ بەپێی یاسا پێویستە بچیتە دایەرەی ئامارو دەفتەری ئامار راست بكەیتەوە.

خانمی گەورە دیسان پەست بوو: وای خوایە.. خەریكە دڵم دەوەستێ.. كوڕەكە گیان پەرداخێ ئاوم بدەرێ...

سەرۆك دایەرە بە گورجی لە زەنگی دا، دەستووری دا ئاو بۆ خانمی گەورە بێنن.. سەربازی بەر دەرگاكە رای كرد كە ئاو بێنێ. ماوەیەك تێپەڕی‌و هەر نەگەڕایەوە. سەرۆك دیسان لە زەنگی دایەوە، ئەو سەربازەی كە چوو بوو ئاو بێنێ بە دەستی بەتاڵ گەڕایەوە... سەرۆك دایەرە پرسی: كوا ئاوەكە كوڕە. سەربازەكە بە ترس‌و لەرزەوە گوتی:

– قوربان ئاو بڕاوە.

سەرۆك دایەرە لە تورەییدا تفێکی رۆ کردە عەردی و گوتی:

- بچۆ لە چایخانەکە بێنە.. وریا بە پاك بێ...

سەربازەکە چووە دەرێ.. ئەقدەس شووشە قۆلۆنیایەکی لە جانتاکەی دەرهێنا، تۆزێکی لە نێو چەوانی خانمی گەورەدا، کە خانمی گەورە هاتەوە سەر خۆ بە سەرۆك دایەرەکەی وت: کارێکی وا بکە من نەچم بۆ دایەرەی ئامار... خۆتان بە جۆرێ فایلەکە دروست بکەن!

سەرۆك گوتی: بە گیانی منداڵەکانم ناکرێ.. ئەمە حوکمی یاسایەو چ کارێکمان لە دەست نایەت.. خۆتان تەشریف بەرنە دایەرەی ئامارو شتەکە ببڕێننەوە. دوای ئەمە سەرۆك دایەرە چەند پرسیارێکی لە خانمی گەورە کردو ئیمزای پێ کردو گوتی: ئیدی چ شتێکمان نییەو دەتوانیت تەشریف بەریت.

دیسان بە هەمان زەحمەت گەڕاینەوە ماڵێ و خانمی گەورە شەوێکی دی مادونی داینێ... شتێ کە لە خوا شاراوە نییە، بۆ لە بەندییەکان شاراوە بێ... من بەم حاڵە زۆر رازی بووم... جگە لەوەی خانمی گەورە مادونی پێ دەداین، بەوەش کە دەم بینی لە دنیادا خەڵکانی لە منیش بەدبەخت تر هەیە، تەسکینیم دەهات.. بە من دەڵێن تۆ زیندوو نیت و چەند ساڵە مردوویت، و بە خانمی گەورەش کە تەمەنی ٨٥ ساڵە دەڵێن دەبێ بچی بۆ سەربازی!..

سبەی بەیانی خانمی گەورە لە ئەنجامی شەکەتیدا نەخۆش کەوت و لە جێدا کەوت، رۆژی چەند پزیشکێك دەهاتنە سەری و دەرمانی جۆراو جۆریان دەدایێ. بەڵام بێ سوود بوو. سات بە سات حاڵی خراپتر دەبوو. بۆیە نەیتوانی سەری دایەرەی ئامار بدات. لەو لاشەوە پاسەوانەکان دەست بەردار نەبوون. هەر رۆژەی چەند جارێك دەهاتن و خانمی گەورەیان دەویستو هەڕەشەیان دەکرد کە ئەگەر زووتر فایلەکە تەواو نەبێ، خانمی گەورە دەبەن بۆ سەربازی!...

خانمی گەورە خەریك بوو لە نیگەرانی و تورەییدا شەق بەرێ هاواری دەکرد: وا.. وا لێکراوان، من دوو شەقاوان رۆییشتم ئەم دەردەم بە سەرهات، ئاخر چۆن دەتوانم بۆ سەربازی بچم؟

بەڵام تا ئێستا چ کارێك بە دادو بێداد دروست بووە تا کاری خانمی گەورە دروست ببێ. ئەم هەواڵە گەییە کوڕو کچەکانی خانمی گەورە. تەنانەت هەموو خزم و دراوسێکانیش پێیان زانی. خەریك بوو ئابڕوی بچێت، خانمی گەورە ناچار بوو بۆ دایەرەی ئامار بچێت. کە سەرۆکی دایەرە چاوی بە خانمی گەورە کەوت بە شێوەیەك سەری رێزی بۆ دانەواند خەریك بوو قەپۆزی لە قەراخی مێزەکە بکەوێ! هاتە پێشەوەو دەستی خانمی گەورەی ماچ کردو گوتی: پایە بەرز، خانم ئیحسان سەڵتەنە خانم بەخێر هاتن. پێڵاوتان بەسەر سەر.

کەس نەبوو خانمی گەورە نەناسێت. بە تایبەتی سەرۆکی دایەرەی ئامار. دەستووری دا کە چای بێنن. بەڵام خانمی گەورە قبوڵی نەکردو گوتی: – لەبری چای، زووتر کارەکەم راپەڕێنە.

سەرۆکی ئامار پرسی: چ ئەمرێکتان هەیە؟

خانمی گەورە بەسەر هاتەکەی بۆ گێڕایەوە، سەرۆکی دایەرەی ئامار کە خەریك بوو لەبەر پێکەنین ببورێتەوە گوتی: ئەم هەڵانە لە دایەرەی سەرباز وەزیفەدا زۆر روو دەدەن، نیگەران مەبە هەر ئێستا دەستوور دەدەم دەفتەری گشتی بێنن و راستی بکەنەوە.

خانمی گەورە سوپاسی کرد، بەرپرسیاری ئامار دەستووری دا کە بەرپرسی دەفتەری گشتی بە خۆی و دەفتەرەکەیەوە بێت. زۆری نەبرد مامورێك بە دەفتەرێکی ئەستوورەوە خۆی بە ژوورێدا کرد. لاپەڕەی خانمی گەورەیان دۆزییەوە. چەند پەڕە کاغەزێك بە دەرزی لەو لاپەڕەیە درا بوون مامورەکە بۆ ماوەی چەند دەیقەیەك لەگەڵ سەرۆك دا بە چپە قسەی کرد.. بە دوو قۆڵی ماوەیەك پێکەنین، ئەمجا سەرۆك ئامار بە خانمی گەورەی گوت: هەموو شتێ روو بووەوە..

خانمی گەورە بە خۆشییەوە پرسی: هەموو؟... چۆن بووە؟

– هیچ، هەڵەیەکی بچووك بووە بە باعیسی ئەم هەموو دەردی سەرییە، لە بری ئەوەی ساڵی لە دایك بوونەکەتان ١٩٢٢ بنووسن، ١٩٧٢یان نووسیوە، بەم

حسێبە تۆ ٧٢ ساڵانیت و لە دەفتەرەکانی ئێمەدا بە ٢٢ ساڵان قەید کراوی و بە جارێ پەنجا ساڵیان لە تەمەنت دا شکاندووە.

خانمی گەورە زۆری کەیف بەم قسەیە هات ودەستی بە پێکەنین کردو گوتی: جا لەسەر کاغەز چ سوودێکی هەیە؟.. ئەگەر بەڕاستی بتان توانیبا پەنجا ساڵ لە تەمەنم دابشکێنن، ئامادە بووم نیوەی سەروەت و سامانەکەم بدەم.

سەرۆك ئامار بۆ دڵدانەوەی خانمی گەورە گوتی: تۆ هێشتا هەر جاحێڵی!

خانمی گەورە بە ئیشارەی سەر سوپاسی کردو پرسی:

– کێ ئەم هەڵەیەی کردووە؟

– مامورێکی گێژو وێژ، قەرزاروگرفتار.. بێگومان تا ئێستا یان مردووە.. یان لە شوێنێ گیری خواردووە.

– باشە ئێستا تەگبیری من چییە؟چی بکەم؟

– هیچ... گرنگ نییە، کارەکەی تۆ لەلای ئێمە وەکو رۆژ رووناکە، بەڵام دەبێ زەحمەت بکێشیت و سەرێکی دادگا بدەیت.

خانمی گەورە دیسان حاڵی خراپ بوو.. و هاواری کرد:

– ئێوە هەڵەتان کردووەو من بۆ دادگا بچم؟! چ پێویستە بۆ دادگا بڕۆم؟!

سەرۆك ئامار بە هێمنی وەڵامی دایەوە: خانمی بەڕێز هەڵەیەکەو رووی داوە. هیچ چارێ نییە جگە لەوەی دادگا ڕا بدات...

هیچ چارەیەك نەبوو، دووبارە خانمی گەورەمان بۆ ماڵ بردەوە.. دیسان خانمی گەورە شەوێکی مادونی داینێ.

سبەی بەیانی هێشتا خانمی گەورە بە تەواوی نەهاتبووە سەرخۆ، ئەقدەسی نازەنینم بە دەستە سپی و گۆشتنەکەی خەریکی شێلانی شان وملی خانمی گەورە بوو. خانمی گەورە هەمیشە بۆڵە بۆڵی دەکردو بە تەلەفۆن دەستووری بە کوڕ وکچ و زاواکەی دەداو دەیگوت: کارێ بکەن دەترسم بم بەن بۆ سەربازی!

سەیرم کرد ئەمە باشترین هەلە کە دەردی خۆم بە خانمی گەورە بڵێم و داوای یارمەتی لێ بکەم. هەر چۆنێ بێ ئەو لە کەسانی دی پتر بە دەردم

دەزانێت. قیروسیام لێ کردو خۆم بە ژوورەکەیدا کردو بێ پێشەکی گوتم: خانمی گەورە منیش وەکو تۆ گیرۆدەی دایەرەکان بووم.

خانمی گەورە مرەیەکی کردو گوتی: تۆش کاتت دۆزییەوە؟ واز بێنە با دەردی من دەرمان ببێ، ئەوسا تۆ دەست پێ بکە!...

– ئاخر دەردەکەی منیش لەوەی تۆ دەچێت!.

– بڵێ بزانم دەردی تۆ چییە؟

– پێم دەڵێن تو زیندوو نیتو چەندین ساڵە مردوویت.

خانمی گەورە گوتی: ئاوها.. یانی چی؟

– چوزانم، ناسنامەشم نادەنیو دەڵێن تۆ لە یەکەم جەنگی جیهاندا و لە بەرەی شەڕدا شەهید بووی.

خانمی گەورە نیگایەکی پڕ لە گومانی تێ بڕیم و گوتی:

– ئەوە شێت بوویت کوڕم؟ ئەم قسانە چییە؟

– بەزاتی خوا بە راستمە.. زۆریشم هەوڵدا ناسنامە دەربێنم، کەچی نەیان دامێ و گوتیان تۆ مردوویت!

– ئەی ئێستاکێ ناسنامەت نییە؟

– نەخێر.. نیمە..

وام دەزانی خانمی گەورە بەزەیی پێمدا دێتەوەو بە زەبری ئەو دەسەڵاتەی کە هەیەتی ناسنامەم بۆ دەردێنێو لەسەرگەردانی قوتارم دەکات. کەچی بە پێچەوانە دەرچوو،و بە دەستی خۆم، خۆم بەدبەخت کرد...

خانمی گەورە بە کەم حەوسەڵەییەوە گوتی: ئێستا وەختی ئەم قسانە نییە. دوایی بیرێکت بۆ دەکەمەوە.

ئەوجا تەلەفۆنی بۆ کوڕەکەی کرد کە سبەینێ ئەوقاتی بۆ بگرێ و لە دادگادا بەرگری لێ بکات!... رۆژی بردنی خانمی گەورە بۆ دادگا وەکو رۆژانی پێشوو زەحمەت نەبوو... کچەکەی، کوڕەکەی، زاواکەی، بووکەکەی و چەند خزم و کەسێکی دی هاتن، خانمی گەورەیان خستە سەر دەست و خستیانە

ئۆتۆمبیلەوەو لەبەر دەرگای دادگادا دایان گرت. من و ئەقدەسیش چووین و وەکو تەماشاکەر دانیشتین.. کە دادگا کرایەوە، خانمی گەورە گوتی: من سەر لە یاساو ماسا دەرناکەم ئەوقاتەکەم لە بری من قسان دەکات!..

ئەوقاتەکەی زۆر بە گەرمی کەوتە بەرگری کردن و زۆری قسان کرد، بەڵام من و ئەقدەس یەك وشەی لێ حاڵی نەبووین، وا دەزانم ئەوانی دیش لێی حاڵی نەبوون.. ئەوجا نۆرە هاتە سەر حاکم، کە سوور بوو لەسەر ئەوەی بیسەلمێنێ خانمی گەورە پیاوەو تەمەنی ٢٢ ساڵەو پێویستە بۆ خزمەتی سەربازی بچێت!...

دوو سێ کەڕەت ئەم مشتومڕە دووبارە بووەوە. ئاقیبەت دادگا رای خۆی دەربڕی، کە سکرتێری دادگا ویستی دەقی رای دادگا بخوێنێتەوە، هەموو ئامادەبووان هەستانە سەرپێ. سکرتێر دەستی بە خوێندنەوەی دەقی رایەکە کرد: "بە گوێرەی داوای جەنابی موارجیع و بۆ ئەوەی خۆی ساغ بکاتەوە کە ژنەو تەمەنی هەفتاو دوو ساڵە دەبێ بچێتە لای پزیشکێك کە جێگای متمانەی وەزارەتی تەندروستی بێ، ئەوجا پزیشکەکە بۆچوونی خۆی بە نووسین بۆ دادگا بنێرێ".

خانمی گەورە خۆی پێ نەگیراو بە پێچەوانەی یاساوە رووی دەمی کردە حاکم وگوتی: جەنابی حاکم، من دوای ئەم تەمەنە، دەبێ بۆ سەلماندنی ژنێتیم بچمە لای پزیشك؟

حاکم زۆر بە ساردییەوە گوتی: چ قەیدییە خانم؟ یاسا بۆ هەمووان یەکسانە، ژن و پیاو، پیرو جوان لە روانگەی یاساوە جیاوازییان نییە!

بە قسەی سەرۆکی دادگاو هاوکارەکانی، بڕیاردرا چەند شایەتێکی باوەڕپێکراو، شایەتی لەسەر تەمەنی خانمی گەورە بدەن. بەڵام دۆزینەوەی ئەم بابەتە شایەتانە کە بە لای کەمەوە دەبوا تەمەنیان ٩٠ ساڵ بێ، خۆی لە خۆیدا گیرو گرفتێکی دی چێکرد. ئەوانەی کە تەمەنیان کەمتر بوو خۆیان لەم کارە نەدەدا. دەترسان گیرو گرفتەکە رووی خۆیان بگرێتەوە...

دوای سۆراخ و گەڕانێکی زۆر دوو کەسیان پەیدا کرد کە تەمەنیان دەگەییە ٩٠ ساڵ، بەڵام یەکێکیان دوو چاری نەخۆشی بیر چوونەوە بوو بوو. قسەکانی خۆی بیر نەدەما. دووەمیشیان پەکی کەوتبوو، و توانای جوڵانی نەبوو. دادگا شایەتی هیچیانی پەسەند نەکرد.. بڕیاردرا پشت بە تاقی کردنەوەکەی دکتۆر ببەستن. خانمی گەورە وەکو کچۆڵان خۆی بە ناز دەگرت و قسەی پێکەنین هێنەری دەکرد: — من دوای ئەم هەموو تەمەنە ناتوانم خۆم بۆ پزیشك رووت بکەمەوە!

کوڕ و کچ و زاوا و بووکی خانمی گەورە بێ ووچان دەپاڕانەوە:

— هیچ نییە.. موعایەنەیەکی ئاساییە..

بەڵام خانمی گەورە رازی نەدەبوو، دەیگوت:

— ئامادەم بۆ سەربازی بچم، بەڵام فەحس نەکرێم..

دایەرەی سەرباز وەزیفەش دەست بەردار نەبوو، هەمیشە ماموران لە هاتووچۆدا بوون. ئاخری بە هەر زەحمەتێ بوو خانمی گەورەیان بردە لای پزیشك.. پزیشك بەڵگەنامەکەی کرد، و کاغەزەکەمان بۆ دادگا بردەوە.. دوای دوو کۆبوونەوەی دی دادگا ڕای خۆی بە قازانجی خانمی گەورە دەربڕی. ئیدی خانمی گەورە لە سەربازی رزگار بوو.. ئاهەنگێکی گەورەیان بەم بۆنەیەوە گێڕا. خەڵکێکی زۆر لە دۆست و ئاشنایان بەشداریان لەم ئاهەنگە پڕ شکۆیەدا کرد..

کە خانمی گەورە، لە سەربازی رزگاری بوو، منیش ئومێدم پەیدا کرد کە ناسنامەکەم بۆ تەگبیر بکات. سبەی بەیانی بە خۆم گوت:

" وا چاکە ئەم هەلە لە دەست نەدەم و لە خانمی گەورە بپاڕێمەوە، کە بە ئەوقاتەکەی بڵێ کارەکەی منیش رایی بکات.. خۆم گەیاندە ژوورەکەی خانمی گەورەو بێ پێشەکی گوتم: خانمی گەورە سوپاس بۆ خوا کە کارەکەت تەواو بوو.. ئەگەر بیرتان مابێ بەڵێنتدا کارەکەی منیش رایی بکەن"..

خانمی گەورە پرسی: کارەکەی تۆ چی بوو؟

— وەکو عەرزم کردیت کاری ناسنامەکەی منیش تەگەرەی تێ کەوتووە...

وەك ئـەوەی بۆمبایـەکیان تەقانـد بێتـەوە، خـانمی گـەورە هـاواری کـرد، هاوارێکی ئەوتۆ خەریك بوو گوێم کەڕ بێ.. بە جۆرێ سەیری دەکردم وەك ئەوەی دڕندە بم.. بە ترس و لەرزەوە پرسی:

– کەواتە تۆ ئێستا ناسنامەت نییە؟

– نەخێر خانمی گەورە.

– چۆن دەبێت؟! ئاخر مرۆڤ بێ ناسنامە نا بێت.. ئەوە تۆ چی دەڵێی؟ چۆن بزانم راست دەکەیت؟

لە جێی خۆم بەنج بووم.. خانمی گەورە ئەقدەسی بانگ کرد.. ئەقدەس بە راکردن هات.. بە جۆرێ هەناسە برکێی پی کەوتبوو، خەریك بوو دڵی لە سینگییەوە بێتە دەرێ. خانمی گەورە قیژاندی:

– بۆ پێت نە گووتووم ئەم کابرایە ناسنامەی نییە؟

ئەقدەس وەکو کۆترێ کە گیرۆدەی هەڵۆ بوو بێ مات و بێدەنگ وێستاو نەیدەزانی چ وەڵامێك بداتەوە. بە گریانەوە گوتی:

– خانم بە خوا هیچ کەم وکوڕییەکمان نییە..

خانمی گەورە قیژاندی: زوو بە ڕێی بکە، ئەگەر دەمزانی ناسنامەی نییە، ڕێم نەدەدا پێ بەمماڵەدا بکات.

بە دەمی وشکەوە گوتم: خانمی گەورە مۆڵەتم بدەن.

بەڵام خانمی گەورە بە شێوەیەك هاواری کرد، دەمم بوو بە تەڵەی تەقیو. بە هاوار کردنەوە گوتی: بۆ لە یەکەم ڕۆژەوە نەتگوت ناسنامەی نییە؟! من لە کوێ بزانم تۆ کێیت؟ دزی؟ بێگانەی؟ قاچاخ چیت؟ پیاو کوژیت؟ چ کارەیەت؟ خەتای خۆمە! دەبوو لە ڕۆژی هەوەڵەوە داوای ناسنامەم لێت کردبا، ئەقدەس تەفرەی دام.. من هەرگیز ڕێ نادەم کابرایەکی بێ ناسنامە پێ بە ماڵم دا بکات...

– خانمی گەورە ماوەم بدە با عەزرت بکەم..

خانمی گەورە وەکو گورگی زامدار دەی لوراندو دەی قیژاند:

– ماوەت نادەم...

بەڵام من بە سەرخۆمم نەهێنا و درێژەم پێدا: چما تۆ لات وایە من نامەوێ ناسنامەم هەبێ؟ بەخوا بێزووی پێوە دەکەم. بەڵام چی بکەم نام دەنێ. تۆ کارێکی وا بکە کە تا ماوم نۆکەر وئەڵقە لە گوێت بم.. بەڵان خانمی گەورە گوێی بە قسەو پاڕانەوەکانم نەدا، پەنجەی خستبووە گوێچکەی بۆ ئەوەی قسەکانم نەژنەوێ! ئەقدەسی نازەنینم وەکو بی نێو ئاو دەلەرزی، فرمێسك وەکو هەوری بەهار لە چاوە گەشەکانییەوە دەباری. کە سەیرم کرد، ئاگرم تێ بەر بوو.. بەرادەیەك پەست بوو بووم، دەمویست دەست بخەمە بینی خانمی گەورەو بیخنکێنم.. ئەقدەس کەوتە سەر دەست و پێی خانمی گەورە، فرمێسکی هەڵدەڕشت و دەپاڕایەوە کە یارمەتیمان بدات، بەڵام دڵە رەقەکەی خانمی گەورە نەرم نەدەبوو، زۆر بە توندی قسەی دەکرد: ئەم قسانە بە گوێم دا ناچێت.. بە هیچ جۆرێ ئامادە نیم خەڵکی بێ ناسنامە لەماڵی خۆمدا رابگرم.

خانمی گەورە تەنانەت ڕێی نەدا ئەو شەوەش لە ماڵەکەیدا بمێنم و بۆ سبەی بیرێ لە خۆ بکەمەوە.. بەڵێ برادەران هەر ئەو شەوە دەریان کردم، دیسان دەورانی بەدبەختی و سەرگەردانی و جودایی من و ئەقدەسی نازەنینم سەری هەڵدایەوە.

کە زیندە بێدەنگ بوو، هاو بەندییەکانی تێکڕاو بەیەك دەنگ گوتیان: سەیری ئەم بەدبەختییە بکە!..

## (١٥) سێ منداڵی زیادە هی کێیە

لەو کاتەوە کە زیندە حەکایەت گێڕانەوەی شەوانی دەست پێکرد بوو، هەرکە دنیا تاریك دەبوو، جموجۆڵێکی سەیر لە قاوشی دوودا دەستی پێ دەکرد... تەواو وەکو ئەوەی کۆمەڵێك بیانەوێ بۆ سینەما بچن یان بۆ شانۆگەری یا بۆ سەیران. بەندییەکان بە پەلە شیویان ئامادە دەکرد.. خیرا نانەکەیان دەخوارد، جگەرەیان پێدەکرد.. هەر بە گەرمی چایەکانیان

هەڵدەقوراندو لەسەر جێگاکانیان دادەنیشتن تا زیندە دەست بە پاشماوەی چیرۆکەکەی بکات.

– باشە برادەران، گەیی بووینە کوێ؟

پەیکەر سازەکە وەڵامی دایەوە: گەییینە ئەو شوێنەی کە گوتت خانمی گەورە هەر بەو شەوە دەری کردیت..

– بەڵێ برادەران.. ئەو پیرێژنە وەکو ورچ مانی گرتو.تەرەی کردم.. لەو دەمەدا کە دەمویست لە دەرگا دەربچم. ئەقدەس دامێنی گرتم و گوتی:

– بە تەنێ لێرەم جێ مەهێڵە.. من چیدی لە دووریت هەڵناکەم، لەگەڵ خۆتم بەرە.. هەر چەند گوتم: ئەقدەس گیان ئاخر تۆ بۆ کوێ بەرم؟ بە گوێیدا نەدەچوو، و وەك هەوری بەهار ئەشکی هەڵدەڕشتو دەپاڕایەوە:– ئەگەر منیش لە گەڵت بێم، خانمی گەورە بە تەنێ دەمێنێتەوەو ئەوسا ناچار دەبێ هەردووکمان رابگری.

– ئەی ئەگەر تۆشی دەکرد، ئەوسا تەگبیرمان چییە؟

ئەقدەس گوتی: کەس ئامادە نییە خزمەتی ئەم دێڵە پیرە بکات، بە بێ خزمەتچیش ناتوانێت تا تەوالێت بڕوات. ئەگەر من نەبم رۆژێ ناژی. خاترجەم بە ئەگەر بڵێم منیش دەڕۆم، هەردووکمان گل دەداتەوە، منەتیش دەبات!

گوتم: ئەقدەس گیان ئەم جارەیان قسەکەی تۆ راست نییە... ئەمانە پارەدارن... بە پارە هەموو کارێ دەکرێ.. پارە بدەی مەلا لە مزگەوت دەردەکەی.. بە خۆڕایی لەقە لە بەختی خۆت مەدە.

ئەقدەس پرسی: بە رای تۆ چی بکەم؟!..

سەیرم کرد، قسەکانم کاریان تێکردووە و ئەقدەسی نازەنینم رام بووە.. دەنگم کزتر کردو درێژەم پێدا: بە لای کەمەوە بیر لە منداڵەکەمان بکەوە. لەبەر خاتری ئەو بەستەزمانە کەمێ دان بە خۆتدا بگرە! تۆ لێرە بمێنەوەو منیش بە پشتیوانی خوا، بە زوویی کاری نانو ئاو پەیداکردن دەدۆزمەوەو دێم بە شوێنتدا.

ئەقدەس دیسان ڕای خۆی گۆڕی: من ناتوانم، تا تۆ کار دەدۆزیتەوە سەبر بکەم. تۆ ژوورێکم بۆ بە بکرێ بگرە، ئەوی تری خۆی چیێ دەبێت، خوا ڕەحمی زۆرە، بە دوو قوڵی ئیش دەکەین و پاروە نانێك پەیدا دەکەین و پێکەوە دەیخۆین. قسەکەی ڕاست بوو، کەس لە برسانا نامرێ.. بەڵام تا دنیا دنیایە ئاغای وەکو خانمی گەورە پەیدا نابێ. لەو ماوە کەمەدا کە لە لای بووم، پارەیەکی باشم پاشە کەوت کرد بوو.. جگە لەوەی خۆی ئافرەتێکی دەست ودڵ تێر بوو، کچ و کوڕەکەی و تەنانەت بووك و زاوەکەشی بەخششییان دەدامێ. ژووری ئاسانە و دەمتوانی بە کرێی بگرم، بەڵام دەردەکە لە جێیەکی دی بوو. ئەگەر خاوەن خانووەکە لە کاتی سەند نووسینەکەدا بڵێ کوا ناسنامەکەت، چی بکەم؟

کەسیش بەبێ کرێ نامە" عقدایجار" خانوو بە کرێ نادات.

برادەران دوو دانە مانگ بە شوێن خانوودا گەڕام، بەڵام دەستم نەکەوت... لەو لاشەوە ئەقدەس پێی لێ کرد بوومە کەوشەوەو خانووی لێم دەویست... تەواو تەواو تەنگاو بوو بووم، گیانم هاتبووە سەر لێوم..

ڕۆژێ بەیانی لە چاخانەدا دانیشتبووم، خەریکی چا خواردنەوە بووم، زەلامێك کە دیار بوو شارستانی بوو لە تەکمەوە دانیشتبوو، ڕۆژنامەی دەخوێندەوە.. لە ڕۆژنامەکەی ئەودا چاوم بە ڕاگەیاندنێك کەوت. نووسرابوو ژوورو هەیوانێ بۆ کرێ. بە ڕاستی ئەوە بوو کە من بە دوای دا دەگەڕام، هەر چەند لە بەختی خۆم ڕانەدەبینی و دڵم پێ خۆش نەبوو، ئەدرەسەکەم لە لای خۆم نووسی و کەوتمە ڕێ...

لەو دەمەدا لە ژێر لێوەوە دوعام دەکرد، غیرەتم نایە بەر خۆم و پەنجەم بە زەنگەکەوە نا، زۆری نەبرد دەرگا کرایەوە، پیرەمێردێکی کەنەفت و پەك کەوتە کە نزیکەی ٩٠ساڵ دەبوو پرسی: کێت دەوێ؟

- هاتووم ژوورەکەی ئێوە بە کرێ بگرم.

پیرە مێردەکە قەدەرێ لێم وورد بووەوە، هەستم کرد کە خۆشی پێمدا نەهاتووە... لەگەڵ ئەوەش دا دەستی بە رووومەوە نەنا.. بە ئیشارەی ئەو چوومە ژوورەوە تا هۆدەکە ببینم... پیرەمێردەکە خانووەکەی بە قەرز کڕی بوو، دەیویست بە کرێکەی هەندێ لەو قەرز بداتەوە.

بەشی خوارەوەی بریتی بوو لە ژوور و هەیوانێك، بۆ ئێمە زۆر باش بوو بەڵام کرێکەی زۆر بوو، گوتم: خاڵۆ گیان، داوای لێ بووردنت لێدەکەم، کە ئەزیەتم دایت.. بە کەڵکی ئێمە نایەت...

کابرای خاوەن خانوو، تورە بوو، گوتی:

– چ جۆرە خانوویەك بە کەڵکی ئێوە دێت؟

زۆر بە هێمنی و لەسەر خۆ گوتم: راستیت دەوێ لەم دنیا بەرینەدا هێشتا ئەو خانووەی کە بە کەڵکی ئێمە بێت دروست نەکراوە!

پیرە مێردەکە زیاتر تورە بوو: – بۆچی...؟

– چونکە من خەڵکی ئەم دنیایە نیم.

کابرای پیرەمێرد ئەبڵەق بوو، منیش بێ ئەوەی گوێی پێ بدەم لەسەری رۆییشتم: بەرای دەوڵەت من زیندوو نیم و سەد ساڵ لەمەوبەر شەهید بووم...

پیرەمێردەکە بە گومان و دوو دڵییەوە گوتی: دڵنیایت کە ئاگات لە خۆیە؟

– بەخوا ساغ.. ساغم... لە ژیانـدا نەخۆشی یان شێتیم بە خۆمەوە نەدیوە... تەنیا دەوڵەت ئازارم دەدا.

خاوەن خانووەکە، هێور بووەوە... دەستی گرتم و بۆ ژوورەکەی خۆی بردم و گوتی: وەرە رۆڵە... وەرە رۆڵە... وەرە دانیشە، بڵێ بزانم مەسەلە چییە؟ چەند رۆژێ بوو بە دوای یەکێکدا دەگەڕام تا گرێی دڵمی بۆ بکەمەوە... کە لە ژوورەوە بەرانبەری یەکدی دانیشتین، چیرۆکەکەم لە نووکەوە تا دوایی بۆ گێڕایەوە.. کابرای پیرەمێرد هێندە پێکەنی چاوی ئاوی کرد.. ماوەیەك دوای چیرۆکەکەش هەر پێدەکەنی.. ئەمجا بە پێکەنینەوە گوتی: بڕۆ شوکری خوا بکە... من زۆر لە تۆ خراپترم... بۆیە پێ دەکەنیم...

بەسەرسامی پرسیم: چی لەمە خراپتر دەبیٚ؟
- گویٚ بگرە تا پیٚت بیٚژم...
- فەرموو.

کابرای پیرەمیٚرد دەستی بە گیٚڕانەوەی کلۆڵی خۆی کرد.. ژنەکەی دوای ٥٣ساڵ ژن و میٚردایەتی، بەم ئاخری عەمرە بە تاقی تەنیا بەجیٚی هیٚشتبوو، و رۆیی بوو.. دوای ئەوەی ماوەیەك نەفرەتی لە ژنەکەی کرد، گوتی: لاوۆ.. من ئامادەم ئەم خانوەت زۆر بە هەرزانتر لە نرخەکەی خۆی پیٚ بە کریٚ بدەم!.

پرسیم: بەبیٚ ناسنامە، چۆن دەتوانین کریٚنامە مۆر بکەین؟

پیرەمیٚردەکە ئاهیٚکی هەڵکیٚشاو گوتی: من کە خۆم ئەم هەموو دەردی سەرییەم کیٚشاوە.. لە حاڵی تۆ تیٚدەگەم.. کریٚنامەم ناویٚ تەنیا بەڵیٚنم بدەیە کە لە سەرەتای مانگدا کریٚکەم بدەیتیٚ، تا منیش بتوانم بیدەم بە بانق و وەسڵەکانم وەربگرم.

بەڵیٚنی پیاوم پیٚداو کارەکە بڕایەوە.. بۆ یەکەمین جار بوو تووشی پیاویٚکی چاك و مرۆڤیٚکی پیاوانە ببم.. لە خۆشی و شادیدا دەستم لە ملی کابرای پیرەمیٚرد کردو ئەم لاو ئەولام ماچ کرد.

پیرەمیٚردی خاوەن خانوو گوتی: داوایەکی تریشم لیٚت هەیە..

گوتم: تکایە ئەمر بکە.

- خۆت دەزانی من زۆر پیرو کەنەفتم، ناتوانم بە تەنیایی بچم بۆ دادگا.. هەر کاتیٚ بڕیار بوو کە بۆ دادگا بچم، دەبیٚ لەگەڵمدا بییٚت و یارمەتیم بدەیت...
- بەسەر چاو باوکە.. ئامادەم بت خەمە سەر سەرم...
- عەمر دریٚژ بی کوڕم...

ئەقدەس گیان زۆری دڵ بە خانووە تازەکە کرایەوە.. هەر ئەوە بوو باڵی نەدەگرت، دەیگوت: دەڵیٚی هیٚلانەی باڵندەیە..

وەکو دوو مارەبڕ چووین بۆ بازاڕ، هەرچی پێویستی نێو ماڵ هەبوو کڕیمان.. خانووەکەمان پۆشتە کردەوە، بەڵام باش نەبوو ئەقدەس جارێ لە ماڵی خانمی گەورە بێتە دەرێ.

پێم گوت: ماوەیەکی دی دان بە خۆت دا بگرە، تا من خۆم دەگرمەوە ئەوجا دەست لە کارەکەت هەڵبگرە.. قەبوڵی کرد.. دوورییەکەیم زۆر لە لائەستەم بوو. بەڵام دابین کردنی ئایندە، بە تایبەتی منداڵەکە کەچەند مانگێکی دی دەهاتە دنیاوە لە هەموو شتێ گرنگتر بوو.

ئەقدەس تەنیا ڕۆژانی سێ شەممە، نیوەڕۆ دەهات بۆ لام و دەمە دەمی ڕۆژئاوا دەگەڕایەوە بۆ ماڵی خانمی گەورە. خاوەن خانووەکە هەر چەند دەیزانی، چونکە ناسنامەم نییە بەڕەسمی ئەقدەسم مارە نەکردووە، بەڵام قسەی نەدەکردو هەقی بە سەرمەوە نەبوو.

چەند جارێ، بەگوێمدا دابوو تاکو بزانم کە ژنەکەی بۆ بەجێی هێشتووە، بەڵام پیرەمێردەکە وەڵامی ڕاستی نەدەدایەوەو دەیگوت:

- ئەنجامی بەدی حاڵییەك "سوتفاهم" بوو!

ڕۆژێ پیرەمێردەکە گوتی: کوڕم دوو سبەی ڕۆژی دادگامە... لە بیرتە کە بەڵێنت دامێ لەگەڵما بێی؟

گوتم: بەسەر چاو... بە سوپاسەوە ئامادەم.

ڕۆژی دادگا لەگەڵ کرێدارەکەمدا چووین بۆ دادگا. تومەز ژنەکەی تورا بوو و ڕۆیی بوو، لە پێش ئێمەدا هاتبوو و لە دادگادا ئامادە بوو بوو. لە پێش دا وام هەست دەکرد کە ژنەکەی زۆر جوان و گەنجەو بەلای کەمەوە ٢٠- ٣٠ ساڵ لە مێردەکەی بچووکترە. چونکە نەی توانیوە لەگەڵ مێردەکەیدا هەڵبکات بۆیە بەجێی هێشتووە، تا دوای تەڵاق وەرگرتن مێردێکی جاحێڵ بکات. بەڵام وەختێ کە چووینە دادگا، پیرەمێردەکە ژنەکەی نیشان دام، تەزوویەکی ساردم پێدا هات. سەیریم کرد ژنەکە ١٠- ١٥ ساڵ لە مێردەکەی گەورەتر بوو، هێندە لاوازو کەم جورم بوو، دوو کەس باڵیان گرتبوو تا نەکەوێ. لەمەش خۆشتر ئەوە بوو

ژنەکە شکاتی لە مێردەکەی کردبوو، داوای لە دادگا کرد بوو تەڵاقی بۆ وەرگری!. ژنەکە تەنانەت ئەوقاتی گرتبوو، بەڵام پیرەمێردەکە ئەوقاتی نەگرتبوو، پرسیم: باوکە ئەی تۆ بۆ ئەوقاتت نەگرتووە؟

گوتی: شەرمم کرد بچمە لای ئەوقات.. ئاخر ماقووڵ نییە بەم تەمەنەوە رێمان بکەوێتە دادگا، بەڵام چی بکەم پیرێژن دەست بەردار نییە، لە دادگادا شکایەتی کردووە کە گوایە من خیانەتم لێکردووە، ژنم بە سەری هێناوە، توخوا من کاری وام لە دەست دێ؟ من ناتوانم بە پێوەبوەستم، ئیدی چۆن دەتوانم...

ژنەکەی کە دوو- سێ شەقاوان لەو لاترەوە دانیشتبوو وەك بڵێی گوێی لە قسەکانی بوو، لە پڕ هاواری کرد، بەڵگەی رەسمیم هەیە.. بەڵێ بەڵگەم هەیە.. بەڵگەی دەوڵەتی.. ئەگەر خیانەتت لێ نەکردبم ئەی ئەو بێ باوکە نا شەرعییانە لە کوێوە هاتن؟!

پیرەمێردەکە نقەی نەکرد.. بە ئەسپایی بە منی گوت: دەترسم مەسەلەکە بگاتە دەمی رۆژنامەکان.. و ئابرووی چەندساڵەم بچێ..

خەریکی قسەکردن بوو، لە پڕ سکرتێری دادگا گازی کرد: "حەسەن نەسیحەت" ژێر باڵیم گرتو بردم بۆ جەلسەی دادگا... من لە دواوە دانیشتم و پیرەمێردەکەش لە "رگەی تاوانباریدا" دانیشت، دوای ئەوەی سەرۆکی دادگا پرسیاری لە پیرەمێردەکە کرد، و سکرتێرەکە وەڵامی پیرەمێردەکەی نووسی.. ئەوجا سەرۆکی دادگا پرسیاری لە پیرێژنەکە کرد.. پیرێژنەکە کە نەیدەتوانی لە جێی خۆی هەستێ، لە پڕ زیندوو بووەوەو راپەڕی و گوتی:

- جەنابی سەرۆك ئێمە ٥٣ ساڵە ژن و مێردین..

سەرۆکی دادگا پرسی: هێشتاش هەر ژن و مێردن؟

پیرێژنەکە وەڵامی دایەوە: بە داخەوە بەڵێ.. سێ کیژمان هەیە.. بە ناوی "گوڵ پەری، گوڵ ئەندام، گوڵ ناز"* هەر سێکیان بە مێردن و یەکی چەند منداڵێکیان

---

* ئەم ناوانەم گۆڕیوەو کردومن بە کوردی – وەرگێڕ-

هەیە.. نەوەكانیشمان خاوەنی ماڵ و منداڵن... نامزانی دوای ئەم هەموو ساڵە مێردەكەم خیانەتم لێ دەكات...

سەرۆكی دادگا دەیویست پیرێژنەكە لە كورتی بیبڕێتەوە، بەڵام پیرێژنەكە دەست بەردار نەبوو، و بێ وچان قسەی دەكرد: دەفتەری مووچەی كاركەناری مێردەكەم گوم بوو.. دەیویست بڕوات موچەكەی وەربگرێ، چ هەواڵێ لە دەفتەرەكەی نەبوو.. ماڵەكەم لە سەنگ و سوژن دا بەڵام نەدۆزرایەوە، بۆ ئەوەی دەفتەرێكی تازە دەربێنێ، دەبوایە ناسنامەكان ببات. ناسنامەكانیش ون بوو بوون.. ناچار بووین مراجەعەتی دایەرەی ئامار بكەین. چووین بۆ گوندی "هەزار گوڵ" ئەو شوێنەی كە تێیدا لە دایك بوو بووین و ناسنامەمان لەوێ دەركرد بوو. داوام كرد ناسنامەی نوێمان بدەنێ... دوای چەند رۆژێك ماندووێتی پێنج ناسنامەیان داینێ.. هەوەڵ جار وامزانی تەنیا بۆ سێ كەسمان دەرچووە، سەرم سوڕما كە بینیم ناسنامەی خۆیان لەلای خۆیان بوو. كە بە چاكی سەیرم كرد بینیم ناسنامەكان، دوانیان كوڕن و یەكێكیان كچەو ناوەكان جیاوازن لە ناوی منداڵەكانی ئێمە، "كی ناز" و "بوی ناز" و "ئایتوناز". خوا دەیزانی لە پێشدا هیچ بیرێكی خراپم نەكردەوەو گوتم هەڵبەت بە هەڵە بە ئێمە دراون، سێ ناسنامەكەم بردەوە بۆ بەشی ئاماری گوندو گوتم: ئەمانە منداڵی ئێمە نین... ماموری ئامار سەیری دەفتەرەكانی كردو گوتی: "هیچ هەڵەیەكی تێدا نییە.. ئەم منداڵانە هی حەسەن نەسیحەت"ن فەرموو جەنابی سەرۆك دادگا، ئەمەش نامەی رەسمی دایەرەی ئامارە كە سەلماندوویەتی مێردەكەم سێ منداڵی دی هەیە..

پیرێژن نامەكەی بە سەرۆك دادگادا، و بە دەم جنێودانەوە لە جێی خۆی دانیشتەوە، سەرۆكی دادگا دوو سێ جار لە زەنگی دا كە پیرێژنەكە بێدەنگ بێ، بەڵام هەر دەست بەردار نەبوو...

بە دەستووری سەرۆك دادگا، ئەوقاتی پیرێژنەكە دەستی بە بەرگری كردن كرد: "بەپێی بەڵگەی رەسمی، تاوانبار بە پێچەوانەی یاساو بە دزییەوە ژنێكی دی

هێناوەو ئەنجامی ئەم خیانەت کارییە دوو کوڕو کیژێکە کە لە ناسنامەکاندا دیاری کراوە، چونکە تاوانی خیانەتەکە لەلایەن مێردەکەوە روون و ئاشکرایە.. بە نێوی ژنەکەوە، کە من ئەوقاتی ئەوم داوای تەڵاق دەکەم و داوا لە جەلسەی دادگای بەڕێز دەکەم، هەموو ئەو زیانە مادی و مەعنەویانەی کە لە ئەنجامی ئەو خیانەتەوە لە ژنەکە کەوتووە، بە مێردەکە ببژێردرێ و بکرێ بە فرمان..

سەرۆکی دادگا داوای لە پیرەمێردەکە کرد کە ئەگەر قسەیەکی هەیە بیکات.

پیرەمێردەکە بە هەزار حاڵ هەستایە سەرپێ و بە چاوی پڕ لە گریان و دەنگی لەرزۆکەوە گوتی: لام وایە هەڵەیەك روویداوە، چونکە ئەو ناسنامانەی کە لە بەشی ئاماری "هەزار گوڵ"ەوە بە نێوەی منداڵەکانی منەوە ناردویانە یەکێکیان هەشت مانگانەو یەکێکیان دوو ساڵ لە من گەورەترە! بەندە تەمەنم ٨٦ ساڵە، چۆن دەشێت منداڵی هەشت مانگانم هەبێ؟ یان چۆن دەبێ کوڕ دوو ساڵان لە بابی گەورەتر بێ؟.. جەنابی سەرۆك بە خوا من بێ تاوانم و تا ئێستا بە موخیانەتم نەکردووە..

پیرێژنەکە بەبێ موڵەت وەرگرتن هەستاو گوتی: جەنابی سەرۆك، مێژووی لە دایك بوونیان گۆڕاوە.

سەرۆکی دادگا دەستووری بە سکرتێر دا کە بڕیاری دادگا بنووسێت: "دەفتەری گشتی ئاماری" "هەزار گوڵ"وێنەی ناسنامەی "کی ناز" و "بوی ناز" و "ئایتوناز" بۆ ئێرە بنێرن.. کۆ بوونەوەی دادگا تازە دەکرێتەوە، کۆبوونەوەی دوایی، پاش گەییشتنی وێنەی ناسنامەکان بە هەردوولا رادەگەیەنرێ.

کە لە هۆڵی دادگا هاتینە دەرێ، پیرەمێردەکە چووە لای ژنەکەی و گوتی: دەست لەم کارانە هەڵگرە... ئابڕووم مەبە.. ئێمە پێمان بە لێو قەبرەوەیەو دوای ئەم هەموو ساڵە ئەم قسانە باش نین... ئاخر من چۆن دەتوانم منداڵی هەشت مانگان دروست بکەم؟

بەڵام پیرێژنەکەی ئەم قسانەی بە گوێدا نەدەچوو، گوتی:

- تۆ هەموو شتێکت لە دەست دێ!...
کۆمەڵە خەڵکێکی بێکارەیان لە دەور خڕ بووەوە. دەتگوت تەماشای شانۆگەرییەکی کومیدی دەکەن. گوێیان لە قسەکانیان دەگرت و پێدەکەنین.
تکاو پارانەوە لەمە پتر سوودی نەبوو. کە پیرە مێردەکەم بۆ ماڵ بردەوە دەستم بە دڵدانەوەی کردو گوتم: نیگەران مەبە.. هەڵەیەکەو چاك دەبێتەوە.
پیرەمێردەکە گوتی: چۆن نیگەران نەبم.. چش لە تەڵاق دانی ژنەکەم.. دەترسم دادگا داوای منداڵەکان بکاتو چونکە من ئاگام لەم مەسەلەیە نییە. و تاوانی کوشتنی منداڵەکانم بخەنە پاڵو حاکم بڵێ گوایە بۆ پاکانە منداڵەکانم لە نێو بردوون.
پیرەمێردەکە راستی دەکرد، بەڵام من نەم دەویست قسەکانی بسەلمێنم.. گوتم: بەو شێوەیەش نییە.. کە لەسەر هەڵەی یەکێکی دی، خەڵکی تاوانبار بکەن. حەقیقەت هەر دەردەکەوێ جا درەنگ بێ یان زوو.
کابرای پیرەمێرد بە کەسەرەوە سەری لەقاند: تا حەقیقەت دەردەکەوێ من دەمرم.. رۆڵە گیان تۆ بۆچی ئەم قسانە دەکەیت؟ ئەگەر هەڵە نەبێ بۆ تۆ دەبێ ئەم هەموو بەدبەختییە هەڵگری؟
قسەی پیرەمێردەکە، بەدبەختی خۆمی بیر خستمەوە، خەریك بوو بکەومە گریان، ئەوجا پیرەمێردەکە کەوتە دڵدانەوەی من..
- ئینشەڵڵا چ گرفتارییەك نامێنن.. خەم مەخۆ..
دوای هەفتەیەك پیرەمێردەکەیان بۆ دادگا راکێشا، پێکەوە چووین.. سەرۆك تەماشای فایلەکەی کرد و گوتی: ئەدرەسی منداڵەکانت "کی ناز" و "بوی ناز" و "ئایتو ناز" بە دادگا بدە...
پیرەمێردەکە بە شێوەیەکی ئەوتۆ راچڵەکەی ترسام دڵی بوەستێت. بە زەحمەت خۆی گرت و وەڵامی دایەوە: لەمەوبەریش گوتوومە من سێ کیژم هەن بە نێو "گوڵ پەری" و "گوڵ ئەندام" و "گوڵناز" جگە لەوانە منداڵی دیم نین. ئەوانەی کە دایەرەی ئامار ناوی داون منداڵی من نین و بە هیچ جۆرێ ئاگام لێیان نینە...

سەرۆکی دادگا گوتی: دایەرەیەکی رەسمی ئەم زانیارییەی داوە.. تۆ شەش مندالت هەیە. چاکتر وایە جێگای سێ مندالەکەت بلێی و بە خۆرایی کاتی دادگا بە فیڕۆ نەدەیت...

پیرەمێردەکە گوتی: قوربان بە خوا، بە پێغەمبەر درۆیە.. من ناتوانم لەم تەمەندا مندالی هەشت مانگان دروست بکەم.

سەرۆکی دادگا بە تووڕەییەوە گوتی: ئەم مەسەلەیە پێوەندی بە دادگاوە نییە، کە تۆ دەتوانیت مندالْ دروست بکەیت یان نا. لە سایەی پێشکەوتنی زانست دا هەموو رۆژێ لە رۆژنامەکاندا دەی خوێنینەوە کە پیاوانی ٩٠ و بگرە ١٠٠ سالەش دەتوانن مندالْ دروست بکەن!

پیرەمێردەکە کەوتە گریان: قوربان ئەی مندالی دووەم کە دوو سالان لە من گەورەترە؟

– رەنگە مێژووی لە دایك بوونەکەی بە هەلەنووسرا بێ.. چونکە تۆ پیریت، نامەوێ هەوالەی دایەرەی ئاگاداریت بکەم... ئەگەر لە ماوەی هەفتەیەکدا ئەدەرسی مندالەکانت نەهێنی ناچارم بتدەمە دەست پۆلیس، ئەوان زۆر بە ئاسانی دەتوانن بت هێننە قسان.

لە کاتی گەڕانەوەدا، کابرای پیرەمێرد بە دەم رێگاوە بۆ خۆی دەدوا:

– ناشێ راست بکەن و لە راستیدا خیانەتم لە ژنەکەم کردبێ؟ بەلام من پیاوی ئەم حالە نیم. ئاخر چ گلاراوێکم بوو کە چووم ناسنامەی نوێ دەربێنم.. سەریەشەیەکی سەیرم بۆ خۆم دروست کرد.. من سێ مندالْ لە کوێ بدۆزمەوە، سەرۆکی دادگا هەقیەتی.. نامەی رەسمیی دایەری ئامار درۆ نییە.. ئەوجا رووی کردە من و گوتی: – رۆلە گیان بڕۆ شوکری خوا بکە کە ناسنامەت نادەنێ، ئەی لە جێی من بوای چیت دەکرد؟

نەمدەزانی چ وەلامێکی بدەمەوە.. بەستەزمانە هەقی بوو، بە تۆبزی دەیانویست تاوانی پیاو کوژی بدەنە پالْ.

گوتم: ئەم کارە بەبێ ئەوقات ناکرێ.. پێویستە تۆش ئەوقات بگری..

- ڕاست دەکەی پێویستە ئەوقاتێکی زیرەك بدۆزمەوە.
چونکە ئەو ڕۆژە زۆر ماندوو بوو بوو، بڕیارماندا سبەینێ بۆ لای ئەوقات بچین..
خۆم دەردم کەم بوو، هی ئەمیشی بێتە سەر ناچار بووم هەموو ڕۆژێ کابرای پیرەمێرد بۆ ئێرە و ئەوێ بەرم... نەدەمتوانی بە شوێن کارێکدار بگەڕێم و نە هیچ هەواڵێکی ئەقدەسم دەزانی.. بەڵێنم بە کابرای پیرەمێرد دابوو، دەبوو بیگەیەنمە سەر. سبەینێی ئەو ڕۆژە لەگەڵ کابرای پیرەمێردا چووین بۆ لای ئەوقاتێکی ئاشنا... پیرەمێردەکە هەموو شتێکی بۆ ڕوون کردەوە.
ئەوقاتەکە گوتی: هیچ خەمت نەبێ، وا بزانە کارەکەت تەواو بووە.. یاسا هەزار پێچ و پەنای تێدایە...
پیرەمێردەکە پرسی: چی بکەین؟
- پێویستە بچینە دادگاو شکایەت لە سەرۆك ئامار بکەین...
کە قەوڵ و قەراریان بەست، کابرای پیرەمێرد هەندێ پارەی کاشی بە ئەوقاتەکە دا... ئەوقاتەکەش بەڵێنی دا کە لە ماوەی دو سێ هەفتەدا لایحەیەکی بە قوەت بنووسێت و لە یەکەم کۆبوونەوەدا کابرای پیرەمێرد لەم تاوانە گەورەیە تەبرێ بکات. لە ڕاستیدا لایحەیەکی زۆر چاك و جوانی نووسی بوو... کە بۆ ئێمەی خوێندەوە هۆش و گۆشمان لەلای خۆمان نەما... بە هەزار و یەك بەڵگە سەلماندبووی کە منداڵەکان پێوەندییان بە کابرای پیرەمێردەوە نییەو داوای لە دادگای کردبوو بڕیاری بێ تاوانی پیرەمێردەکە دەربکەن.
یەکێك لە بەندییەکان گوتی: سەیری کاری دنیا بکە.. یەکێك شەوو ڕۆژ هەوڵ دەدا ناسنامەی بدەنێ.. یەکێك هەوڵ دەدات ناسنامە زیادەکانی لێ وەربگرنەوە..
زیندە پێکەنی و گوتی: لەو ساوە کە ئەوم بینی ڕۆژی هەزاران جار شوکرانەی خوام دەکرد... کە پێم دەڵێن شەهید بووی.
بەڵام کابرای پیرەمێرد بەوە تاوانبار کرابوو کە سێ کەسی کوشتبوو.

ردێن سپی قاوشەکە گوتی: بابە لە باسەکە دەرمەچۆ.. راستە مەبەستەکە بڵێ بزانین کابرای پیرەمێردەکە بە کوێ گەیی؟

زیندە پێکەنی: دوای ئەوەی ئەوقاتەکەی ئێمە ماوەیەك هاتووچۆی کرد، وەڵامی دایەرەی ئاماری "هەزار گوڵ" گەیی. دەزانن چی نووسیبوو؟

– دە ئازاری گیانمان مەدەو بیگێڕەوە..

– نووسرا بوو، جگە لەو سییانە، شەش منداڵی دیش پەیدا بووە!

بەندییەکان بە یەك دەنگ گوتیان: نۆبەتی ئەو قەوانەیە!

یەکێکی دی لە بەندییەکان پرسی: وەڵڵا.. برادەر وەکو دەڵێن کارێکیان پیکردووە با بە دەواری شری نەکردبێ!..

لێرەدا بەسەرهاتی حەسەن نەسیحەت بەجێ دەهێڵین و دوای گێڕانەوەی چیرۆکی "ریچارد رشاد" ئەنجامەکەیتان عەرز دەکەم..

ردێن سپی قاوشەکە پرسی: ئەویان کێیە؟

– بەسەر هاتی ئەو دوورو دێژە.. سبەی شەو بۆتانی دەگێڕمەوە.

بەندییەکان بە پێکەنین و خۆشییەوە خزانە ژێر جێگاوەو بە خەیاڵی ئاسوودەوە خەویان لێ کەوت.

## (١٦) ئەو جاسوسەی کەنێوی ریچارد "رشاد" بوو!

بەندییانی قاوشی یەك، بە درێژایی ئەو رۆژە هەر باسی منداڵە زیادەکانی حەسەن نەسیحەت–یان دەکرد. کۆمەڵێك لا یان وابوو کە زیندە خۆی دروستی دەکات وشتی وا نابێت. کۆمەڵێکی تری باوەڕیان بەم هەڵانە هەبوو. تەنانەت چەند کەسێك گرێویان لەسەر ئەنجامی کارەکەو بڕیاری دادگا کردبوو. بە تاسەوە چاوەڕێ بوون کە کات خێرا بڕوات و زووتر ئەنجامی بەسەرهاتەکەی حەسەن نەسیحەت بزانن و گرێوەکەیان یەك لایی ببێتەوە.

شەوێ،دوای ئەوەی سفرەیان هەڵگرت، دوو- سێ کەس داوایان لە زیندە کرد کە ئەنجامی کاری پیرەمێردەکە بڵێ. بەڵام زیندە قەبوڵی نەکردوگوتی: خۆی تاموچێژەکەی لەمەدایە. پێویستە لە پێشدا بەسەر هاتی ریچارد "رشاد" بژنەون ئەوجا ئەنجام و ئاقیبەتی کاری پیرەمێردەکەتان پێ بێژم...

ردێن سپی قاوشەکە لەبری هەموویان گوتی: زۆر چاکە وەستای حەکایەتی بێژ.. چیت دەوێ وا بکە، تەنیا زۆر مەڕۆ، زووتر دەقی رووداوەکە بڵێ..

زیندە بە ئیشارەی سەر سوپاسی کردو کەوتە باس کردن.

- بەڵێ برادەران.. ریچارد جاسوسێکی فەڵە بوو کە دوایی موسوڵمان بوو... ئەم کابرایەش کرێچی حەسەن نەسیحەت بوو. واتە هەمان کرێداری من. من وحەسەن نەسیحەت لە نهۆمی خوارەوە دادەنیشتین و.. ریچاردش لە نهۆمی سەرەوە دادەنیشت. پیاوێکی خوێن گەرم و روح سووك و زمان شیرین بوو. هەر چەندە هەندەرانی بوو بەڵام تورکییەکی رەوانی دەزانی.. هەر یەکەم رۆژ داوەتی کردم بۆ ماڵەوەو پێشوازییەکی گەرمی کردم. باری ئابووری ئەو زۆر چاك بوو. جیاواز بوو لە هەموو خەڵکی گەڕەکە هەژار نشینەکەی ئەو ناوچەیە. زۆرم مەراق بوو بزانم ئەم پیاوە پارەدارە بۆ لە گەڕەکی هەژارەکاندا دەژی.. بەڵام نەگەییمە هیچ ئەنجامێ..

شەوێ کە لەلای ئەو بووم.. لێی پرسیم کە خەریکی چ کارێکم، منیش سەر گوزشتەو بەسەرهاتی خۆم بۆ گێڕایەوە. گوتم: چونکە ناسنامەم نییە کەس کارم ناداتێ..

ریچارد پێکەنی و وەڵامی دایەوە: من کارێکی چاکت دەدەمێ..

- زۆر مەمنونم.. خوا راوەستاوت بکات..

ئەوجا من لەوم پرسی: ئەی تۆ خەریکی چ کارێکی؟

زۆر بەساردییەوە گوتی: من راوێژکارێکی هەندەرانیم، چونکە بەم زووانە کارکەنار دەبم، بڕیارم داوە لە وڵاتی ئێوەدا بمێنمەوەو کارخانەیەکی گەورە دامەزرێنم..

هێندە بەجێ و ڕێ و بە بڕواوە قسانی دەکرد، هەموو کەسێ باوەڕی پێدەکرد. بە تایبەتی یەکێکی وەکو من کە هەموو بیروهۆشم لە لای کار پەیدا کردن و هێنانی ئەقدەس بوو بۆ لای خۆم. مژدەی لەوە خۆشتر هەر نابێت... بەجۆرێ کەوتمە سەر زەوق دەمویست بەسەر دەست و قاچی ڕیچاردا بکەوم. لەدڵی خۆمدا گوتم: خوا ئەم کابرایەی بۆ من رەخساندووە! رۆژم دەژمارد کە چ وەختێ جەنابی ریچارد کارکەنار دەبێ و دەست بە پرۆژەکەی دەکات. شەوێکی تریش کە چوو بوومە لای گوتی: – دەمەوێ موسوڵمان ببم..

کە ئەم قسەیەی کرد هێندەی دی چووە دڵمەوە.. ریچارد لە روانگەی منەوە نموونەی تەواوی ئینسانیەت و پاکی بوو. ئاخر چ پیاوێکی پارەدار رازی دەبێ لە گەڕەکی هەژاراندا بژی و کە کارکەنار بوو، هەموو پاشەکەوتی خۆی بۆ پێشکەوتنی وڵاتێکی بێگانە تەرخان بکات...

لەم هاتووچۆیەدا شەوێك ریچارد گوتی: من عاشقی کیژێکی تورك بووم.. باوك و دایکی پەڵپیان لێ گرتووم کە دەبێ موسوڵمان ببم، بۆیە بڕیارم داوە خۆم خەتەنە بکەم.

بە پێکەنینەوە گوتم: کاك ریچارد.. ئەمە دەبێ لە منداڵی دا بکرێ، لەم تەمەنەدا زۆر زەحمەتە.

–ناچارم..

کاك ریچارد دوو هەفتە لە جێدا کەوت. ئەوجا ناوی خۆی گۆڕی و کردی بە رشاد. بوو بە موسوڵمانی تەواو. کە بۆ یەکەمجار ژنەکەیم بینی دڵم تێك هەڵات و خەریك بوو بڕشێمەوە. ئەگەر من لە جێی ئەو بام نەك خەتەنە بەڵکو نینۆکی پێم لەبەر خاتری ئەم ژنە نەدەکرد. چونکە لەگەڵ کاك رەشادا بوو بووم بە ئاشنا و هیچمان لە یەکدی نەدەشاردەوە، رۆژێ پێم گوت: کاك رەشاد دەمەوێ شتێ بڵێم، بەڵام تو خوا زویرنەبی...

بێ ئەوەی سەرسام ببێ گوتی: چیت لە دڵدایە بیڵێ..

– تۆ لە راستیدا عاشقی ژنەکەت بوویت، یان ئەمە ژن هێنانی مەسڵەحەتە؟

بە روویەکی خۆشەوە گوتی: لە راستیدا بۆیە ئەم ژنەم هێنا تا زمانی تورکی فێر ببم...

- ئیٚ خۆ تۆ تورکی باش دەزانیت؟

- بەڵێ دەیزانم، وەڵی فەرقم پێدەکریٚ و هەموو کەسیٚ دەزانیٚ کە هەندەرانیم. دەمەویٚ بە جۆریٚ قسان بکەم کەس پیٚ نەزانی کە تورك نیم..

- باشە ئەم خانمە دەرسی تورکیت پیٚ دەڵێتەوە؟

- زمانی بێگانە بە دەرس خوێندن تەواو نابیٚ. دوو رێگا هەیە، یەکێکیان عەشق بازییە و ئەوی تریان شەڕ کردنە.. لەم دوو بوارەدا پیاو دەتوانیٚ هەموو رستەیەکی پێویست بە کار بێنیٚ! من کە دەچمە هەر وولاتیٚ ژنێك دێنم... ژن هێنان باشترین رێگای فێر بوونی زمانە، هەم عەشق بازی تێدایەو هەم شەڕوئاژاوە، پیاو زووتر فێری زمان دەبیٚ.. لە راستیدا کاك رشاد راستی دەکرد. لە ماوەیەکی کەمدا بە جۆریٚ  تورکی فێر بوو دەتگوت زمانی زکماکی خۆیەتی.. ئەوانەی کە نەیان دەناسی باوەڕیان نەدەکرد بێگانە بیٚ. رۆژ بە رۆژ دۆستایەتیمان بە هێزتر دەبوو، وردە وردە هەموو نهێنی‌یەکیم بۆ دەردەکەوت. بیری کار دۆزینەوەم لە مێشکی خۆ دەرکرد. چاوەڕوان بووم کاك رەشاد کارخانەکەی بکاتەوەو ئیدی خۆم هەموو کارەبم. ئیدی وازم لە خاوەن خانووەکەم هێناو بام دایەوە سەر کاك رشادو شەوو رۆژ خزمەتیم دەکرد.

رۆژێکیان بەیانی بوو، لە هۆڵەکەی ماڵی کاك رەشادا دانیشتبووم، چاوەڕوان بووم کاك رەشاد لە خەو رابیٚو لە ژووری نووستن بێتە دەرەوە گوێم لیٚ بوو ژنەکەی پێی دەگوت: نازانم تۆ بۆ هاتوچۆی ئەم هەتیوە بێکارەو بەرەڵلایە دەکەیت؟ چ کارێکتان بە یەکدی هەیە؟ رشاد ئەم کابرایە پیاوێکی ماقوڵ نییە.. زۆر رووی مەدەریٚ...

کە ئەمەم بیست زۆر نارەحەت بووم.. لەو رۆژەوە بڕیارم دا کە چیدی هاتووچۆی رەشاد نەکەم.و بە دوای کاروکاسبیدا بگەڕێم...

ماوەیەك تێپەڕی، شەوێکیان درەنگ، هیلاك و ماندوو نائومید. گەڕامەوە بۆ ماڵێ. کاك رشاد هاتە لام. دوای گلەیی و گازاندەیەکی زۆر گوتی: دەمەوێ نهێنیەکت لە لا بدرکێنم بە مەرجێ بە کەس نەڵێی..

بەڵێنم داو سوێندم خوارد کە مەگەر گڵ لە دەممی ببیستێ..

کاك رشاد گوتی: من جاسوسم.

کە ئەمەم بیست مێشکم لەقی و دڵم هەڵکەندرا.. وەك ئەوەی چەکوشێکیان بە سەرمدا کێشا بێ چاوم کەوتە رێشکەو پێشکەو وڕوکاس بووم.. دەمم کردەوە کە قسەیەك بکەم بەڵام دەنگم دەر نەهات. ویستم بڵێم: توخوا لێرە مەمێنەو تا زووە بڕۆ.

دوای ماوەیەك توانیم خۆم هێور بکەمەوە، گوتم: چاك بوو ئەمەت گوت.. دەتەوێ سەرم بە فەتارە تێکدا بدەیت؟ مەخابن کە نمەکم کردوویت، ئەگینا هەر ئێستا دەچووم خەبەرم لێدەدایت..

کاك رشاد بە پێکەنینەوە گوتی: بۆ رەنگت تێك چوو، چما جاسوس چییە؟

– من تا بەم تەمەنە گەییووم، بە سەربەرزی ژیاوم... ئێستا ئەگەر بزانن هاتووچۆم لەگەڵ جاسوسێکدا هەیە چی بکەم؟

– هیچ نا بێت...

بە پێکەنینێکی تاڵەوە گوتم: لە قەنارەم دەدەن.. پێستم دەگروون!..

کاك رشاد کە زۆر خۆشحاڵ دەهاتە بەر چاو گوتی: پیاوێ کە بەر لە دایك بوونی شەهید بوو بێ چۆن لە قەنارە دەدرێ؟!

لە کاتێکا هێشتا لە ترساندا هەڵدەلەرزیم گوتم: کاك رشاد من تاقەتی شۆخیم نییە، تۆ خۆت دەزانی هەر کاتێ کارەکان بە قازانجی دەوڵەت بێ پێم دەڵێن زیندوویت، و هەر کاتێکیش بە پێچەوانەوە بێ دەڵێن مردوویت...

کاك رشاد پێکەنی و گوتی: تۆ مەترسە.. من دەمەوێ خزمەتێکی گەورەت پێ بکەم..

بە ترس و دوو دڵییەوە گوتم: بێگومان دەتەوێ بمکەی بە دار دەست و جاسوسیت بۆ بکەم! ئەمجارەیان رشاد لە قاقای پێکەنینی داو گوتی: بە پێچەوانەوە تۆ بە ئاشکرا کردنی من خەڵاتێکی گەورە لە دەوڵەت وەردەگری.. هەم ناسنامەت دەدەنێ و هەم پارەی زیاد...

کە ناوی ناسنامەو کاروپارەی زۆرم بیست زمانم لە گۆکەوت و وڕو کاس بووم، خۆم ناناسی.

کاک رشاد دەستی بە باسکردنی رووداوەکە کرد.. گەلێ شتی لە مەڕ جاسوسی کردن و خزمەت بە وولاتەکەی خۆی و سەر گوزشتەی ژیانییەوە گێڕایەوەو لە ئەنجامدا گوتی: حەز دەکەم بۆ خۆم ئیدی لەم وولاتەدا بژیم.

من کە هێور بوو بوومەوەو کۆنترۆڵی خۆم راگرتبوو گوتم: باشە بۆ خۆت ناڕۆیت تەسلیم ببی؟و دەتەوێ من تووش بکەی؟

گوتی: یەکەم، دەمەوێ خزمەتێ بەتۆ بگەیەنم.. دووەم، ئەگەر تۆ ئاشکرام بکەیت و بمدەیت بە دەستەوە کارەکە ئاسایی تر دەبێ. لە راستیدا بە تیرێ دوو نیشان دەشکێنین.

کە سەیرم کرد قسەکەی ماقوڵە قەبوڵم کرد. وەلێ نەمدەزانی مراجەعەتی کوێ بکەم و چی بکەم. کاک رشاد گوتی: من هەموو شتێك دەزانم، تۆ هەقت نەبێ.. تەنیا لەگەڵم دا وەرەو بەسە...

دەستی بە قسان کرد:- دوایی بۆت دەردەکەوێ کە من کێم و لە سەرسامیدا دەمت دادەچەقێ، نەك هەر دەمی تۆ، بەڵکو دەمی دەوڵەتیش دادەچەقێ.. هەواڵی گرتنم لە دنیا دا دەنگ دەداتەوە. گاڵتە نییە جاسوسێکی جیهانی بە بەڵگەوە بگیرێ، بە تایبەتی بە هۆی کابرایەکی نەخوێندەوارەوە. مەسەلەیەکی گرنگە.. ئەم جانتایە دەبینی! پڕە لە بەڵگەی رەسمی و جیهانی... باشە بزانم کە چووینە ئەوێ چی دەڵێی؟.

بەو شێوەیەی کە خۆی فێری کرد بووم گوتم: دەڵێم قوربان جاسوسێکی گەورە "سفر -ئێکس"م بۆ هێناون..

- ئافەرین.. راستە..

- بەرپرسان کە گوێیان لەم وشەیە ببێ ئەبڵەق دەبن، گرتنی جاسوسێکی "سفر- ئێکس" گاڵتە نییە..

چووینە دایەرەی ئەنتی جاسوسان.. کاك رەشاد پێی گوتم: بڕۆ لەو دەرگایەی بەرامبەرت بدە.. پیاوێکی قەڵەوی سەر رووتاوە لە ژوورەوەیە من لەپێشەوە رۆییشتم و کاك رەشاد بە دووما هات. لە دەرگام دا، هەردووکمان چووینە ژوورەوە. ئەو پیاوە قەڵەوەی کاك رەشاد گوتبووی لە پشت مێزێکی گەورەوە دانیشتبوو. سڵاوم لێکردو گوتم: قوربان جاسوسێکی "سفر-ئێکس"م بۆ هێناون.

چاوەڕێ بووم لە سەرسامیدا راپەڕێ و سەری بە بەن میچەکەدا بدات. وەلێ کابرای قەڵەوی سەر رووتاوە زۆر بەساردییەوە سەری هەڵبڕی و گوتی: ها!... گوتت چی؟

دەمم بوو بە تەڵەی تەقیو، کاك رەشاد لە بری من وەڵامی دایەوەو گوتی:

- بەندە جاسوسی "سفر- ئێکس"م....

کابرای سەر رووتاوە هەستایە سەر پێ و بە رێزەوە گوتی:

خۆشحاڵم قوربان.. فەرموو دانیشە... داوای لێبوردن دەکەم.

کاك رەشاد لەسەر کورسییەك و لە تەك مێزەکەوە دانیشت و من بە پێوە وێستام.. کاك رەشاد گوتی: من نێوم "ریچارد ویلینگ"،.. بەڵام لە وڵاتی ئێوە بە رەشاد بانگم دەکەن.

کابرای سەر رووتاوە کە لە پشت مێزەکەوە دانیشتبوو پرسی: چ ئەمرێکت هەیە؟ کاك رەشاد، لەوەی کە کابرای سەر رووتاوە هیچ شتێکی نەنواند و بە رێزەوە قسەی لەگەڵ دەکرد. وای زانی کە بە چاکی قسەکەی نەژنەوتووە، بۆی دووبارە کردەوەو گوتی: - قوربان من جاسوسم...

کابرای سەر رووتاوە بە پێکەنینێکی دۆستانەوە گوتی: شادم بە دیدارت.. ناوم بیستوویت، زۆریش ناسراوی.

**کاک ڕەشاد کە زانی دەی ناسن خەیاڵی ئاسوودە بوو، و گوتی:**

**ئەم برادەرە ناساندوومی و هێناومی هەواڵەی ئێوەم بکات.**

**کابرای سەر رووتاوە بە خۆشحاڵییەوە گوتی: کەواتە تۆ جاسوسیت!.**

– **بەڵێ جاسوسم..**

– **فەرموو بچۆ نهۆمی دووەم، ژووری ژمارە "٢٣" لەوێ لە کارەکەت دەکۆڵنەوە.**

**بەو شێوەیەی کە کاک ڕەشاد گوتبووی، وامدەزانی هەر کە پێمان بگاتە دایەرە، دەست بەجێ هەردووکمان دەگرن. کەچی بە پێچەوانەوە دەرچوو، یارۆ هەر نەیگوت کەرتان بەچەند، کاک ڕەشادیش لە من سەرسام تر بوو بوو، خەجاڵەتی ئەو قسانە بوو کە کردبوونی. کە گەییشتینە نهۆمی دووەم گوتی: ئەو برادەرە حاڵی نەبوو، ئێستا دەبینی ئەمەیان چۆن دەشڵەژێ..**

**ژووری ژمارە "٢٣" مان دۆزییەوە چووینە ژوورەوە. کابرایەکی ڕەقەڵەی عەینەك لە چاو لە پشت مێزێکەوە دانیشتبوو. بەر لەوەی من قسە بکەم، ڕەشاد گوتی: من جاسوسی "سفر-ئێکس"م.**

**کابرای عەینەك لە چاو بێ ئەوەی سەر لەسەر فایلەکانی هەڵبڕێ گوتی:**

– **ئەگەر بۆ ئیش هاتوویت، بە داخەوەم شوێنی بەتاڵمان نییە!..**

**کاک ڕەشاد تۆزێ توندتر گوتی: کاکە من جاسوسم، هاتووم خۆم تەسلیم بکەم..**

**کابرای چاویلکە لە چاو بە هەمان ساردییەوە گوتی:کاکە گیان پێم گوتیت.شوێنی بەتاڵمان نییە**

**ڕەشاد زۆر تورە بوو بوو. گوتی: کاکە گیان من بەڵگەنامەیەکی زۆر گرنگم پێیەو بە کەڵکی ئێوە دێت..**

**کابرای چاویلکە لە چاو سەری هەڵبڕی، ماوەیەك بە قەدو باڵایا هەڵڕوانین وگوتی: ئێ لە هەوەڵەوە واتان گوتبا.. تەشریف بەرنە نهۆمی سێیەم، ژووری ژمارە "٦٢"..**

چووینە نهۆمی سێیەم، ژووری نێو براومان دۆزییەوە، کاك ڕەشاد دیسان خۆی ناساند... ئەو مامورەی لەوێ بوو گوتی: کێ ناردنی بۆ ئێرە؟

- خۆم هاتووم‌و دەمەوێ تەسلیم ببم...
- مەبەستم ئەوەیە کێ پێی گوتی بێی بۆ ئێرە؟

ڕەشاد کارتەکەی نیشان دا... مامورەکە کارتەکەی خوێندەوەو گوتی:

- کەواتە تۆ پسپۆڕی کاروباری تەقاندنەوەو وێرانکاریت؟
- بەڵێ...
- چ جۆرە تەقینەوەیەك؟..
- زیاتر لە بەشی تەقاندنەوەی پردو تونێلدا کارم کردووە.
- فەرمووتان تەقاندنەوەی پرد؟
- بەڵێ...
- بە هەڵە تۆیان بۆ ئێرە ناردووە.
- ئەی بچمە لای کێ؟
- مامورەکە تۆزێ بیری کردەوە.. ماوەیەك قەڵەمەکەی خستە بەینی ددانەکانی و گوتی: "پرد.. پرد.. تەقاندنەوەی پرد.. پێم وایە لە نهۆمی چوارەم بێ.. تەشریف بەرن بۆ ئەوێ، پێتان نیشان دەدەم".

کە گەیینە نهۆمی چوارەم، ڕەشاد لە یەکەم کەسی نێو ڕاڕەوەکەی پرسی:

- بەشی تەقاندنەوەی پرد کامەیە؟

ئەو زەلامە ژوورێکی نیشان داین، چووینە ژوورەوە. ڕەشاد خۆی بە مامورەکە ناساند، گەلێکی دەربارەی تەقاندنەوەی پردو وێرانکاری و ئەو شتانەی کە بە دەستەوەیە بیکات، بۆ ڕوون کردەوە.. مامورەکە گوتی:

- شارەزاییتان لە چ جۆرە پردێك هەیە؟
- هەر جۆرێ بێ.

– ئاخر چەند جۆرە پردێکمان هەیە.. پردی دارو تەختە؟ پردی ئاسن؟ پردی جوڵەدار؟.. من شارەزای وڵاتی ئێوە نیم. وەلێ لێرە بۆ هەر چەشنە پردێك دایەرەی تایبەتیمان هەیە!

رەشاد گوتی: زیاترلە بەشی پردی ئاسندا کارم کردووە.

– ئەها.. . کە وایە تەشریف بەرنە نهۆمی پێنجەم ژووری ژمارە "١٠١" بە زمانی منەوە بە مامورەکە بڵێن کە زوو کارەکەتان رایی بکات.

کاك رەشاد تەواو ئومێد بڕ بوو، بەڵام پێی حەیف بوو بە بێ ئەنجام لە نیوەی رێدا بگەڕێتەوە. چووینە نهۆمی پێنجەم، خۆمان بە ژووری "١٠١" دا کرد، مەسەلەکەمان بۆ ئەویش باسکرد. ئەمجارەیان مامورەکە تەلەفۆنی هەڵگرت، ژمارەیەکی لێداو گوتی: کابرایەك هاتووە بۆ ئێرە، دەڵێ جاسووسەو لە تەقاندنەوەی پردی ئاسندا شارەزایە! چ دەستووری دەفەرمووی؟

دوای ئەوەی دوو سێ جار گوتی: بەسەر چاو.. بەسەرچاو.. ئەمرەکەی... بەسەرچاو.. تەلەفۆنەکەی داخستەوەو گوتی: جەنابی سەرۆك دەڵێ بێ زەحمەت تەشریف بێنێتە نهۆمی سەرەوە.

چووینە سەرەوە.. رەشاد هەموو شتەکانی بۆ سەرۆك روونکردەوە.. جەنابی سەرۆك بە وردی گوێی لە قسەکانی گرت و پرسی:

– بەچی پردی ئاسن دەتەقێنیتەوە؟

– ئەمە پێوەندی بە تۆوە نییە..

سەرۆك زۆر بە ساردی گوتی: ببورە، تورە مەبە.. خەڵکی تورە ناتوانن لە کارەکانیاندا سەرکەوتووبن.. مەبەستم ئەوە بوو کە بە پلێتە ئیش دەکەیت یان بە کێبلی ئەلەتریك؟

رەشاد گوتی: بە هەردووکیان.

– زۆر باشە... شتەکە بڕایەوە.. کەواتەت بە ئەرك نەبێ تەشریف بەرنە نهۆمی خوارەوە لای کاك هاشم.

چووینە خوارەوە. کاك هاشم ئەو پیاوە قەڵەوە سەر رووتاوە بوو کە یەکەمجار چووینە لای. کاك هاشم هەر بیری نەما بوو کە تۆزێ لەوە پێش لەلای بووین. خەریك بوو پاڵتۆکەی لەبەر دەکردو دەیویست بڕوات..

هەر بە پێوە سەر لە نوێ مەسەلەکەمان بۆ گێڕایەوە. سەیری سەعاتەکەی کردو گوتی: تازە ئەوڕۆ کات نەماوە.. سبەینێ زوو وەرنەوە، بێ ئەوەی تۆزێکی دی چاوەڕێ بکات بەرەو دەرگا کەوتە رێ... نزیکی دەرگاکە شتێکی بیر کەوتەوە و گەڕایەوە بۆ لامان و گوتی: – سبەیش یەك شەممەیە و دەوام نییە، یەکجاری رۆژی دوو شەممە زوو وەرن.

کاك هاشم رۆیی، ئێمەش ناچار بووین بڕۆین... رەشاد خەریك بوو لە توڕەییدا شەق بەرێ. بە نارەحەتییەوە گوتی: با بڕۆین بە شوێن کاری خۆمانا. وا دیارە لە نێو چەوانم نووسراوە کە تا مردن هەر دەبێ جاسوس بم!.

لە قاڵدرمەکان هاتینە خوارەوە. خەریك بوو لە دەرگای تەلارەکە تێ پەرین یەکێك بە پەلە لە پشتمانەوە هات و قۆڵی رەشادی گرت و گوتی:

– بۆ کوێ دەڕۆن؟

– بە دوای کاری خۆمانا...

– دەتەوێ بەم هاسانییە لە چنگم رزگار بی؟! وەرە بزانم...

گێڕامانیانەوە بۆ نێو تەلارەکە ، بردمانییە ژێر زەمینێکی تاریکەوە چەند کەسێکی دی لەوێ بوون. یەکێکیان پرسی: چۆن هاتنە نێو ئەم تەلارەوە؟ رەشاد زۆر بە ساردییەوە گوتی: لە دەرگاوە هاتینە ژوورەوە.

رەشیاد ئەمجارە هیچی نەگوت. ئەو زەلامەی کە لەبەر دەرگاوە گلی داینەوە تەلەفۆنی هەڵگرت، نمرەیەکی لێداو دەستی بە قسان کرد:

– قوربان دوو زەلامی گومان لێکراومان دەست گیر کردووە، چییان لێ بکەین؟

رەشاد بە ئەسپایی پێی گوتم: نۆبەتی ئەم قەوانەیە!

دووان لەوانە بۆ پشکنینی ئێمە هاتنە پێشەوە بە وردی هەموو لەشمان گەڕان. سێ ناسنامەو پەساپۆرتێکیان لە گیرفانی رەشاد دەرهێنا. ئەو زەلاسەی کە منی دەپشکنی پرسی: — کوا ناسنامەکەت؟

گوتم: — ناسنامەم نییە... نامدەنێ...

— بۆ ناتدەنێ؟...

— چونکە بەر لەوەی لە دایك بم شەهید بووم..

زللەیەکی لێدام ئاگر لە چاوم بووەوە.. هەر مەپرسە چیمان بەسەر هات، بەڵایەکیان بەسەر من و رەشادا هێنا ئیدی دەستمان لە ژیان شۆرد. دوای چوار رۆژان تێ هەڵدان و ئەشکەنجەدان کە زانیان من هیچ نازانم و کابرایەکی مەیلەو شێتم ئیدی ئازادیان کردم. یارۆ چوار ناسنامەی هەیە و تۆش بۆ یەکێك بە ئاسماندا دەچیت.. هەڵبەتە هەندێك ناسنامەی زیادە وەربگرن، ئەوانی دی بێ ناسنامە دەمێننەوە.

لەو رۆژە بە دواوە رەشادم نەبینی، نازانم چ بەڵایەکی بەسەردا هات.. یان لە نێویان برد یا بۆ فێر بوونی زمانی عەرەبی چوو بۆ یەکێك لە وڵاتە عەرەبییەکان..

زیندە بێدەنگ بوو.. گریان ئەوکی گرتبوو، و نەیدەتوانی لەوە پتر قسان بکات. ردێن سپی قاوشەکە پرسی:

— باشە، ئەی کاك حەسەن نەسیحەت"ی خاوەن خانووەکەت چی لێهات.

زیندە هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو گوتی:

— باسی ئەویش دەکەم. راوەستن با پشوویەك بدەم..

دەستی برد، کاغەزێکی دەق کراوی لە جانتاکەی دەرهێنا، کاغەزەکەی کردەوەو گوتی: رەنگە هەندێکتان وا بزانن من ئەم قسانە لە خۆمەوە هەڵدەبەستم و درۆدەکەم. بۆ ئەوەی دڵنیا بن کە هەموو قسەکانم راستەو درۆ ناکەم، دەمەوێ بەڵگەنامەیەکتان نیشان بدەم.

دوای ئەوەی من ئازاد بووم و رەشاد لەوێ مایەوە، یەکرێ چوومەوەبۆ ماڵێ، بۆ لای حەسەن نەسیحەت.. دوای چەند رۆژێك ژنەکەی رەشاد ماڵەکەی پێچایەوەو باری کرد، خانووەکەی چۆڵ کرد.

منیش وەکو جاری جاران، هەمیشە کاك حەسەنم لەم دادگاوە بۆ ئەو دادگا دەبرد. کە لە دادگا دەهاتینە دەرێ کاك حەسەن کاغەزو بەڵگەنامەو شتەکانی دەدایە دەستی من کە بۆی هەڵبگرم و ئاگاداری ببم، دوێنێ کە جانتاکەم دەگەڕام یەکێك لەو نامانەم دۆزییەوە... فەرموو بیخوێننەوە. زیندە کاغەزەکەی دایە دەست ردێن سپی قاوشەکە، کاغەزێکی رەسمی بوو بە مۆری دەوڵەتییەوە.

ردێن سپی قاوشەکە بە دەنگی بەرز دەقی کاغەزەکەی خوێندەوە:

ئەوقاتی شکایەتی کەروماموری ئامار کە شکایەتیان لە دەستی ئەو هەیە لە دادگادا ئامادە بن.. ئەو نامانەی کە لە دایەرەی ئامارەوە گەییوەو دەربارەی مندالآنێکە بە نێوی "میتاز"، "بوی ناز"، "ئایتوناز" کە لە دەفتەری رەسمیدا بە نێوی کاك حەسەن نەسیحەت-ەوە قەید کراون بخوێنرێتەوە.. چونکە بۆ دادگا روون نییە کە کاك حەسەن نەسیحەت لە چ رۆژ و ساڵێك دا ژنە تازەکەی هێناوە، بڕیاردرا نامەیەك بۆ دایەرەی ئامار بنووسرێ تا بە وردی ژن هێنانەکەی بۆ دادگا بە نوسین دیاری بکرێ...

بەم جۆرە جارێکی دی دادگا تازە دەکرێتەوەو رۆژی جەلسەی ئایندە دوای گەییشتنی وەڵامی دایەرەی ئامار بە هەردوولا رادەگەیەنرێ.

هەر یەکێك لە بەندییەکان قسەیەکی کردو دەنگی پێکەنین و شۆخی ژوورەکەی پڕ کرد.. ردێن سپی قاوشەکە نامەکەی دایەوە دەست زیندە، ئیشارەتی بەندییەکانی کرد کە بێدەنگ بن تا زیندە پاشماوەی حەکایەتەکە بگێڕێتەوە...

زیندە کە لە ژێرەوە سەیری پەیکەر سازەکەی دەکرد، دوای نیشاندانی ئەم بەڵگەنامەیە لە جاران گەرمتر درێژەی بە حەکایەتەکەدا:

- بەڵێ برادەران.. حەسەن نەسیحەت هەمیشە دادو بێدادی بوو لە دەست ژنەکەی. پیرێژنەکەش دەیگوت مێردەکەم خیانەتم لێدەکات. رۆژێك لە دادگادا چی بەدەمدا هات بەو پیرەمێردە بێ چارەیەی گوت:
حەسەن نەسیحەت خەریك بوو دەمرد. لە پڕ لە سەر کورسیەکە کەوتە خوارەوەو ئەل فاتیحا.. پەیکەر سازەکە گوتی: - مرد؟!
- بەڵێ... مردو لە دەست ژنەکەی رزگار بوو. خۆزگە لەو کاتەدا کە لاشەکەیمان دەبرد لەوێ دەبوویت و سەیرت دەکرد. پیرێژن شین و شەپۆرێکی گەرم کرد هەر مەپرسە.. قژی دەرنییەوەو سینگی خۆی دەکوتاو وەکو هەوری بەهار فرمێسکی بۆ مێردەکەی هەڵدەرشت! پیرێژن هەموو جلەکانی پارچە پارچە کرد. بە جۆرێ دەگریا و دەی لاواندەوە دڵ بۆی دەبوو بە کەباب، "وای حەسەن گیان بۆ بە تەنیا جێت هێشتم؟ لە پاش تۆ دڵ بە کێ خۆش بکەم، چی قوڕێ بەسەرا بکەم...."
کە ویستیان کاك حەسەن بنێژن، بە تۆبزی پیرێژنیان لەسەر نەعشەکەی لابرد. هاواری دەکرد: منیش لەگەڵ مێردەکەمدا بنێژن.. نامەوێ دوای حەسەن بژیم! دوای چەند رۆژێ پیرێژنەکە هات خانووەکە وەربگرێ. بە بیانووی ئەوەی کە جێی تەنگە منیشی دەرکرد. دوایی زانیم کە پیرێژنەکە نیازی وایە شوو بکات، کە سەیری کردبوو من جێی پێ تەنگ دەکەم ئیزنی دام.
دیسان ئاوارەو سەر گەردان بوومەوە.. کە لەو خانووەدا بووم ئەقدەس هەفتەی جارێك بۆ لام دەهات.. کە ئەو داڵدەیەشم بڕا ناچار بووین لەگەڵ ئەقدەس دا بە دزییەوە لە پەناو پاسارو کۆڵاناندا یەکدی ببینین.
زینده بێدەنگ بوو، بەڵگەنامەکەی حەسەن نەسیحەت-ی دەق کردەوەو خستیەوە نێو جانتاکەی و گوتی: - با پاشماوەکەی بۆ سبەی شەو وەمێنێ. بەندییەکان خزانە ژێر جێگاکانیانەوەو دوای چەند دەیقەیەك پرخە پرخیان پێکەوت.

## (١٧) فەلەك چاوت كوێر بێ!

سبەینێ، رۆژی دیدەنی بەندییەكان بوو.. ئەوانەی كەس و كار دەهاتن بۆ لایان خۆشحاڵ بوون. ئەوانەی چاو لەڕێ بوون و كەس بۆ لایان نەدەهات، نیگەران و پەست دەبوون، خۆ ئەوانەی هەر كەس نەبوو بێ بۆ لایان... وەكو شێتیان لێ دەهات.

چونكە لە رۆژانی دیدەنی و سەرداندا خواردن و میوەی زۆریان دەهێنا، كاروباری ئاشخانە كەساد دەبوو.. هەڵبەت لەو خواردن و میوانە بەشی ئەوانەش دەدرا كە كەس بۆ لایان نەدەهات.. زیندە یەكێك بوو لەوانەی كە كەس بۆ لای نەدەهات. لەگەڵ ئەوەشا رۆژانی دیدەنی بۆ ئەو چاكتر بوو لە رۆژانی پێشوو. هەر كەسێ كە دەیویست شتێك بفرۆشێت و پارەی پێویست بوایە بە سۆراخی زیندەوە دەهات.. زیندە پارەیەكی زۆری پاشەكەوت كردبوو، خەرج و مەسرەفی لە بالای بەندییەكان بوو. هەرچییەكی دەست كەوتبا یان برادەران پارەیەكیان دابا پێی، بۆ سەواو مامەڵە بە كاری دەهێنا. كە شەو داهات زیندە كەمێ پشووی داو بیری لە ئایندەی تاریك و ئاسمانی بێ ئەستێرەی ژیانی خۆی دەكردەوە. لە گۆشەیەكدا دانیشت. دەستی خستە ژێر چەنەی و چوو بووە ژێری.. دەنگی شاورەكەی بستەبالاو بیرو خەیالاتی پەشێوی خۆی تێكەڵ بە یەكدی بوون. دڵی گیرا بوو، حەزی نەدەكرد ماموری سەرژمێری وا زوو بێت. دوای رۆییشتنی ماموری سەرژمێری، زیندە دەبوایە چیرۆك بگێڕێتەوە، كەچی ئەوشۆ تاقەتی چیرۆك گێڕانەوەی نەبوو. بەڵام دەورانی گەردون گوێ بە خواست و ئارەزووی كەس نادات!... مامورە بستە بالاكە هاتە ژوورەوە. بەندییەكانی ژماردو گوتی: خوا هەمووتان رزگار بكات.

بەندییەكان وەڵامیان دایەوە: هەر بژی جەنابی سەركار.

رۆژانی دیدەنی، شیو خواردنیش زۆری نەدەبرد، چونكە هەر ئەو خواردنانەی میوانەكان لەگەڵ خۆدا دەیان هێنا، لە ناوەندی سفرەكەدا دایان دەناو پێكەوە

دەیان خوارد.. کە سفرەکەیان کۆکردەوە "سامی" کە جاران لەبەر سینەماکاندا جاڕی دەدا، بە دەنگێکی گڕ هاواری کرد:

– برادەران ئامادە بن زیندە دەیەوێ دەست پێ بکات.. ئەوەی نەیەت پەشیمانە!

زیندە بە هێمنی و کزییەوە گوتی: برادەران ئەوشۆ بم بوورن..

ردێن سپی قاوشەکە گوتی: "قسە مەکە، نابێ... فێرکەران فێریان مەکە، فێریان دەکەی لە بیریان مەکە"!.

– نەبە گیانی ئێوە مەسەلە نازوماز نییە.. بێ تاقەتم.. دڵم تەنگە..

پیرترین بەندی کە حەپسی ئەبەدی بوو گوتی: – ناز مەکەو بە زمانی شیرین دەست پێ بکە...

زیندە نەیتوانی چ قسەیەك بکات، هەستا، هات لە ناوەندی ژوورەکەدا لەسەر کورسییەك دانیشت ودەستی پێکرد: –برادەران ئەوشۆ بەم شێوەیە دەست پێدەکەم "فەلەك دەورانت بڕوخێ، چاوانت کوێربێ." "فەلەك بە ناهەق سوتانمیت، خۆزیا هەرگیز نەدەهاتمە دنیاوە". "ئەی فەلەك، بێ وەفا.. بێ ویژدان چاوانت کوێر بێ خوایە".

بەندییەکان کە هەموویان تاسا بوون، مەحکومە پیرەکە گوتی: بۆ جنێو بە فەلەك دەدەیت؟ هەموو خەتای خۆمانە کە لە قە لە بەختی خۆ دەدەین و رێی راست ناگرین، چەند جوانی گوتووە شاعیر:

تۆ کە پشت لە ئەستێرەی بەختی خۆ دەکەی

فەلەکی چی! چاوەڕوانی چی لێ دەکەی!

زیندە وەك ئەوەی شتێکی خۆشی بیر کەوتبێتەوە، بە دەنگی بەرز پێکەنی و گوتی: من لە وەستا سلێمان–ەوە فێر بووم کە جنێو بە فەلەك بدەم هەر کاتێ پیاو دڵی تەنگ بوو، وا باشترە کە یەك –دوو جنێو بە فەلەك بدات تا داخی دڵی خۆی هەڵڕێژێ! ئەوشۆ دەمەوێ سەرگوزشتەو بەسەرهاتی وەستا سلێمان–تان بۆ باس بکەم....

بەندییەکان تێکڕا گوتیان: – بیڵێ ... گوێمان لێتە..

بەڵێ برادەران، وەختێ کاك حەسەن نەسیحەت بەو دەردە چوو، ژنەکەی مێردی بە نێرە فیلیێ کردو منیان لەو خانووەدا دەرپەڕاند. ماتەڵ مابووم کە ئەو شتانەی کڕی بوومن بو کوێی بەرم.. نەمدەزانی چی بکەم.. ئەقدەسی بەستەزمان، ئەقدەسی خۆشەویست تر لە گیانم، بە سکی پڕەوە زۆربەی تفاقەکانی بۆ ماڵی خانمی گەورە برد. و ئەوەکەی دیشم هەرزان فرۆش کرد.. چونکە پارەم نەبوو خانوو بەکرێ بگرم، چووم بۆ کاروانسەرایەك کە لە دەرەوەی شار بوو، و خاوەنەکەیم دەناسی تا ژوورێ بەکرێ بگرم... ژووری بەتاڵی نەبوو.. هەموو ژوورەکان پڕ بوون.. زۆر دڵتەنگو نائومێد بووم... خانچییەکە، کە زۆر خۆشی دەویستم، رازی نەبوو بەدەستی بەتاڵ بگەڕێمەوە. بردمییە لای یەکێك لە کرێ نشینەکانی کە نێوی وەستا سلێمان بوو، بوو بە زامنم کە لە ژوورەکەی ئەوا بژیم و بە دوو قوڵی کرێکەی بدەین. وەستا سلێمان پیرەمێردێکی چاك بوو، حەکایەت و چیرۆکی بە لەزەتی لەلا بوو. چیرۆك و حەکایەتەکانی هێندە بە تام و چێژەوە دەگێڕایەوە کە پیاو هەر لە بیری نەچێتەوە. لە ژیانا زۆر شتی بینی بوو. ماوەیەکیش لە زیندانەکانا ژیا بوو.. راست یان درۆ بە گەردنی خۆی. دەیگوت:

– بەهۆی مەسەلەی کرێکارییەوە چوومەتە زیندان. بۆ وێنە کاتێ کە کرێکارەکان بەدەستووری سەندیکای کرێکاران مانیان گرتووە، دەوڵەت ئەمیان گرتووە. بەندییە پیرەکە گوتی: – گوتت نێوی چی بوو؟

– وەستا سلێمان...

– بابی نێوی چی بوو؟

– نازانم، بیرم نەماوە..

– سمێڵ زلێکی برۆ پڕ بوو؟ قژی درێژ بوو؟

– بەڵێ، خۆیەتی.

– ناسیمەوە، چەند ساڵێك لەم ژوورەدا لەگەڵ مندا بوو، هەندێ جاران پێکەوە قسانمان دەکرد، پیاوێکی بە هۆش و فامیدە و سەر سەخت بوو.

- بەڵێ راستە، خۆیەتی.. وەستا سلێمان هەمیشە جنێوی بە فەلەك دەدا، خراپەیەکی لە هەر کەسێك دیبا دەستی بە جنێودانی فەلەك دەکرد: فەلەك رۆژی خۆش نەبینی، بە دەردێ موفتەلا بی کە دەرمانی نەبێ! منیش ئەو کاتانە بەرپەرچیم دەدایەوەو دەمگوت:

- بۆ جنێو بە فەلەك و زەوی و زەمانە دەدەی؟

دەیگوت: ئەگەر جنێو بە سەبەبکارانی خەراپە بدەم پۆلیس دەست بەجێ دەمگرن و لە زیندانم توند دەکەن. بەڵام ئێستا لەگەڵ ئەوەشا کە دەزانن مەبەستم کێیە هەقیان بەسەرمەوە نییە...و منیش دەتوانم هەر چیم لە دڵدایە هەڵی رێژمو کەمێ ئاسوودە ببم.

منیش لەو رۆژەوە هەمان فێڵی وەستا سلێمان بەکاردێنم. هەم قسەی خۆ دەکەم و هەم جنێو دەدەم و کەسیش هەقی بەسەرمەوە نابێ. بەڵێ برادەران چاوی فەلەك کوێر بێ کە نەیتوانی ویساڵی من و ئەقدەس ببینێ...

ردێن سپی قاوشەکە گوتی: - ئەرێ بەراست ئەقدەس چی لێهات؟

- من لە شەرمی خۆم و لە ترسی خانمی گەورە ناچووم بۆ لای ئەقدەس، کاغەزێکم بۆی نووسی و ئەدرەسی کاروانسەراکەم دایێ. بەیانییەکی زوو ئەقدەس بۆ کاروانسەراکە هات. لەبەر دەرگادا یەکمان بینی، بە کۆڵانەکانا کەوتینە رێ. رەنگی تێك چوو بوو. هەر ئەوەتا دەیتوانی بڕوات. زۆر شەکەت و ناڕەحەت بوو. گوتی: خانمی گەورە دەری کردم..ورِو کاس بووم، پرسیم: بۆچی؟!

- چونکە سکم گەورە بووە. کە زانی سکم هەیە ئیدی دەری کردم.. نازانم چی بکەم؟!

ئەو چارەی لە من دەیویست.. کەچەڵ دکتۆر بوایە سەری خۆی دەرمان دەکرد! وەلێ ناچار بووم بیرێکی لێ بکەمەوە.. خەتاباری هەوەڵ و ئاخر من بووم. باخچەیەکی بچووك لەوێ بوو. ئەقدەسم بردو لەوێ دامناو گوتم:

- لێرە دانیشە تا من بچم ژوورێکت بۆ ئامادە بکەم.

لە پشت كاروانسەراكەوە هەندێ خانووی بچكۆلەو پەرپووت هەبوون كە كۆمەڵێك بۆ خۆیان دروستیان كرد بوو، خەدیجە ناوێك بە تاقی تەنیا لە یەكێك لەم خانووانەدا دەژیا. چوومە لای خەدیجەو دەغیلی كەوتم كە بۆ ماوەیەك دالْدەی ئەقدەس بدات تا شوێنێ دەدۆزمەوە.. لەسەر كرێ و مەرجەكان رێك كەوتین. بەپەلە گەڕامەوە بۆ باخچەكە تا ئەقدەس بۆ لای خەدیجە خانم بەرم. ئەقدەس داوای كرد دوو- سێ سەعاتان لە باخچەكەدا پیاسە بكەین، منیش لە خوام دەویست. هەستاو كەوتینە رێ. لە حەوشەیەكی گەورەدا جۆرەها یاری و فرۆشگا لە گەردا بوو... لەبەردەم فرۆشیارەكان دەوەستاین و سەیری بەزم و رەزمی یارییەكانمان دەكرد. بەزم و هەرایەك بوو هەر تەماشای بكەیت.. خاوەن سەكۆو دوكانەكان كردبوویان بە هەرایەك سەگ خاوەنی خۆی نەناسییەوە. لە یەكێك لە كەپرەكاندا هەزاران تفاقی وازییان بە دەزوو بە بن میچەكەوە هەڵواسی بوو، خەڵكی دوو لیرەیان دەداو، بە تفەنگی یاری تەقەیان دەكرد. هەر كەس بیتوانایە لە دەزووەكان بدات، هەرچییەكی پێوە هەڵواسرابا بۆ خۆی دەبوو. لە شوێنێكی دی بلیتی دوو ریالی هەبوو هەر كەس پارەی دەدا، سەری داوێكی لە بەختی خۆی رادەكێشاو بە گوێرەی بەختی ئەو كەسە، تفاقی یاری دەردەچوو. ئەقدەس گوتی:

- وەرە با ئێمەش بەختی خۆمان تاقی بكەینەوە.

گوتم: ئەقدەس گیان بەختی ئێمە تاقی بووەتەوە، ئیدی بۆ پارەكەمان بە فیڕۆ بدەین... قۆڵیم گرت و رۆییشتین. گەییشتینە جێیەك، یاری فوتبۆڵ بوو. خاوەن كەپرەكە هاواری دەكرد: "گوڵێ بكەو ٢/٥ لیرە وەربگرە.." خەریكی سەیر كردنی مەردم بووین، لە پڕ چاوم بە ئاگادارییەك كەوت، نووسرا بوو"پێویستمان بەگۆڵ چییەك هەیە". لە بێ كاریدا سەرم دەیەشا، شەڕیش لە دەست بە تاڵی باشترە! هێندە بێزار بووم گەر بیان گوتبا پێویستمان بە فرۆكەوانە، دەست بە جێ خۆم دەناساند گوتم:

- ئەقدەس گیان...

- ها...؟ چییە؟

- تۆ دەیقەیەك لەسەر ئەو کورسییە دانیشە ئێستا دەگەڕێمەوە.

پرسی: - بۆ کوێ دەچیت؟

-دەچم بەختی خۆم تاقی دەکەمەوە..

- دەتەوێ بچیت گۆڵ بکەیت؟

- نەء.. گۆڵ چییەکیان دەوێ... دەمەوێ بچم ببم بە گۆڵ چی...

- چما تا ئێستا یاری فوتبۆڵت کردووە؟

- نەء...

- ئەی چۆن دەبیت بەگۆڵ چی؟...

- شتێ دەکەم، ئەم ئیشە ناسنامەی ناوێ، دەچم دەڵێم گۆڵ چیم... سا یا گاڵ دێنێ یا پەموو..

- زۆر چاکە برۆ بزانم چی دەکەی شێرە پیاوی من؟

ئەقدەس لە سەر کورسییەکە دانیشت و من چووم بۆ لای خاوەن کەپرەکە.. مایکرۆفۆنێکی بە دەستەوە بوو پەیتا پەیتا جاڕی دەداو بلیتی دەفرۆشت.. کە نۆرە هاتە سەر من پرسی: - چەند بلیتت گەرەکە؟

گوتم: - من گۆڵ چییەکی باشم و هاتووم کار بکەم..

- لە کام تیپ دا یاریت کردووە؟

- لە تیپی شارەکەی خۆماندا وازیم کردووە.

خاوەن کەپرەکە گوتی: با لە پێشەوە پێت بڵێم.. ئەم کارە زۆر زەحمەتە.. ئەگەر گۆڵ چی باش نیت، ئەوە برۆ بەرێی خۆتەوە ئەگینا هەم تۆ زەرەر دەکەیت و هەم من...

گوتم: هەوەڵ خواو دوایی لە سایەی سەری تۆوە نایەڵم یەك تۆپ بە گۆڵەکەدا رەت ببێ.

خاوەن کەپرەکە یەکێکی لە جێی خۆی داناو خۆیشی منی برد بۆ نێو چادرێك و وتی: -زووکە خۆت داکەنە و جلی گۆڵچی لەبەر بکە، دەبێ زۆر وریا بی، هەر

گۆڵێکت لێ بکرێ دوو لیرانت لێ دەستێنم و هەر شوتێك بگریتەوە لیرەیەکت دەدەمێ.

گوتم: قوربان بۆچی کە گۆڵم لێ بکرێ دوو لیران بدەم و گۆڵێك بگرمەوە لیرەیەك وەربگرم؟

گوتی: ئاخر هەر کەسێك گۆڵ بکات دەبێ دوو لیرەو نیوی بدەمێ. بلیتی هاتنە ژوورەوە بە لیرەیەکە، لیرەیەکیش لە تۆ وەردەگرم‌و خۆشم نیو لیرە زەرەر دەکەم... گوتم: – باشە.. بە زیاد بێ..

دەست بەجێ خۆم رووت کردەوە، لەو کاتەدا خەریکی لەبەر کردنی جلی گۆڵچێتی بووم، کابرا رۆیی و زۆر بە گەرمییەوە جاڕیدا: خێراکەن.. هاوولاتیانی ئازیز، گەورەترین گۆڵچی ولات لە خزمەتتاندایە! "کەماڵ" بە نێو بانگترین گۆڵچی شارەکان لە نێو داری گۆڵەکەدایە چاوەڕێی ئێوەیە، خێرا کەن.. بە لیرەیەك بەخت و توانای خۆت تاقی بکەوە. هەر گۆڵەو دوو لیرەو نیو وەربگرە.. تا من جلەکانم لەبەر کرد ۲۰- ۳۰ کەس بلیتیان کڕی و ئامادەی گۆڵ کردن بوون. کە خۆم ئامادە کرد، کابرا دیسان هاتەوە نێو چادرەکەو گوتی:

– خۆت گورج بکە.. نەبادا گۆڵ بخۆیت و ئابڕووی منیش بەری..

– مەترسە قوربان.. شارەزام..

کابرا بردمی بۆ گۆڕەپانێك، دوو – سێ گۆڵی تێدا بوو. دووانیان گۆڵچیان هەبوو. وەلێ کەس ئامادە نەبوو لەو گۆڵانەدا خۆی بجەڕبێنێ. هەموو نۆرەیان گرتبوو کە لە گۆڵەکەی کەماڵی بە نێو بانگترین گۆڵچی شارەکان خۆیان تاقی بکەنەوە.. کە قەرەباڵغییەکەم بینی ترسێکی وام لێ نیشت خەریك بوو شۆرتەکەم پیس بکەم! بەخۆم گوت: "نەگبەت چیت دا بوو لە گۆڵچێتی؟" لە ترساندا هەستم بە برسێتی کرد! بیرم کەوتەوە کە لە دوێنێوە نانم نەخواردووە. رەنگە بپرسن: بۆچی؟ چونکە پارەم نەبوو.. سکم کەوتبووە قوڕە قوڕ. دەنگی کابراش وەکو ئاش لە سەرما دەنگی دەدایەوە: "کەس تاکو ئێستا گۆڵی لە کەماڵ نەکردووە، کەماڵ بە نێوبانگترین گۆڵچی شارەکانە.. وەرن تاقی بکەنەوە،

تاقیکردنەوەی ئاسانە، لیرەیەك دەدەیت، ئەگەر گۆڵت کرد دوو لیرەو نیو وەردەگری... هەر دەڵێن لە وڵاتدا کار نییە.. چ کاریٚ لەمە چاکترە، تا عەسر سەد گۆڵ بکەی ٢٥٠ لیرە وەردەگری،دووسەدو پەنجا لیرە پارەیەکی کەم نییە..."

یاری دەستی پێکرد. گەنجێکی پیٚ خاوس تۆپەکەی لە بەرانبەر گۆڵەکە داناو وردە وردە کشایەوە.. دڵنیا بووم کە یارۆ ناتوانێت بەپێی پەتی لە تۆپەکە بدات، وەکو گۆڵچی راستەقینە لە نێو داری گۆڵەکەدا هەڵبەزو دابەزم دەکردو ئەملاو ئەولام دەکرد. سەیرم کرد یارۆ هاتە پێشەوەو پێی لە تۆپەکەدا، وەلیٚ تۆپەکەم هەر نەبینی، هێشتا هەر خەریکی هەڵبەزو دابەز بووم کە هاواری تەماشاکەران بەرز بووەوە:

– ترحێو جەنابی گۆڵچی!... – کوێرە،کوێر!

– کوڕە دەرپێکەت هەڵکێشە!

زانیم گۆڵ بووە! بەڵام هەر چەند بە دوای تۆپەکەدا دەگەڕام نەمبینی.. بە جۆریٚ کاس بوو بووم گوتم: ئەم گۆڵەم قبووڵ نییە.. من هێشتا لە جێی خۆم نەوێستا بووم!..

کوڕەی گەوج گوتی: – باشە، یەکێکی دی...

دیسان تۆپەکەی دانایەوە، کشایەوە. شوتێکی وای لێدا تۆڕی پشت دار گۆڵەکەی دراند. منیش بۆ ئەوەی تۆپەکە بگرمەوە بە جۆریٚ خۆم بە عەردیدا دا، ئانیشك و ئەژنۆکانم هەموو بریندار بوون. دوو – سیٚ کەس لە تەماشاکەران وا دیار بوو دڵیان پیٚ سووتام، گوێم لیٚ بوو دەیان گوتی: – بەستەزمانە خۆی پارچە پارچە کرد...

– کوڕەکە شووتێکی عەجایەبی لێدا!

کوڕەکەی دوای ئەو هەر لە قەڵافاتیا دیار بوو کە یارچییەکی بەنێو بانگە تۆپەکەی لەسەر خەتەکە داناو گوتی: سەیرکە خاڵۆ... پێش ئەوەی شووت لیٚ بدەم ئاگادارت دەکەمەوە، دوایی نەڵێی قەبووڵ نییە ها!... ئەوجا شووتێکی

وای لە تۆپەکەدا هەر وەکو گوللە تۆپی جەنگی بەرەو گۆڵەکە هات، بەپەلە پرۆزیێ خۆم لادایە لاوەو هاوارم کرد: – ئاوت.. ئاوت..
دەنگی پێکەنینی تەماشاکەران بەرز بووەوە.
– تۆپەکە هێشتا لە نێو گۆڵەکەدایە، چۆن دەڵێی ئاوت...
چاوم رێشکەوپێشکەی دەکردو ئیدی ورو کاس بوو بووم. مشتەرییەکانیش یەك لە دوای یەك شووتیان لێدەدا. جارێکیان کە دەمویست تۆپەکە بگرمەوە، تۆپەکە بەر دەم و چاوم کەوت و لەسەر عەردەکە تەخت بووم کاتێ چاوم کردەوە سەیرم کرد ئەقدەس بەدیارمەوە دانیشتووەو خەریکە خوێنەکەی دەموچاوم دەسڕێ! هەستام کە ئەقدەس لەوێ بەرمە دەرێ، یەکێك شوتی خۆی لێدا، هاوارم کرد: بابە مۆڵەتم بدەن.. قەبوڵ نییە.
چەند کەسێك لە تەماشا کەران پشتگیریان کردم و گوتیان:
– بەستەزمانە وردو خاش بووە، وازی لێ بێنن..
– بەسە ئیدی.. چما ئێوە بەشەرنین!..
یەکێك لە مشتەرییەکان بە نارەزاییەوە گوتی: حەز دەکات با نەچێتە نێو گۆڵەکە.. ئێمە بلیتمان کڕیوەو شووتی خۆمان لێدەدەین...
ناچار بووم بگەڕێمەوە نێو گۆڵەکە.. بێ ناموسانە گۆڵی هێندە توندییان لێدەدا ناوکی دەخستم.. وورده وورده هەناسە بڕکێم پێ کەوت.. دوا تۆپ کە بە بەردەمو چاوم کەوت خوێن لە گوێچکەمەوە فوارەی کرد.. بردیانم بۆ چادرەکە کە دەرمانم بکەن.. دوای ئەوەی دەموچام شت چووم بۆ لای کابرا کە حیساب بکەین. یارۆ کاغەزێکی لە بەردەمم داناو گوتی:
– زۆر باش بوو.. ئافەرین. ٦٥ تۆپت گرتەوە، ٦٥ تۆپ لە دوو لیرە دەکاتە ١٣٠ لیرە، واتە تۆ ١٣٠ لیرەت لە لای منە..
کە ئەمەمم بەر گوێ کەوت ماندوێتیم لە بیر نەما، ١٣٠ لیرە پارەیەکی چاك بوو. بە مردنیش زۆرە چ جای بریندار بوون. نازانم چۆن ئەم هەموو تۆ پەم گرتبووەوە! رەنگە ئەوانە بووبن کە بەردەموچاوم کەوتبن و چووبنە دەرێ! کابرا

لە سەری رۆیی: ١٨٥ گۆڵت خواردووە، یەکی سەرو لیرەیان لە بری دەدەیت واتە دەکاتە ١٨٥ لیرە. جا ١٨٥، ١٣٠ لێ دەرچێت دەمێنێتەوە "٥٥" لیرە واتە دەبێ تۆ ٥٥ لیرە بە من بدەیت!

چ قسەیەکم نەبوو، کابرا پرسی: حیسابەکە تەواوە!..

گوتم: کە تۆ وا بڵێی هەڵبەتە تەواوە. سبەینێ باشتر هەوڵ دەدەمو قەرزەکەت دەدەمەوە، من پیاوێکی بە ویژدانم.

کابرا گوتی: منیش پیاوێکی بە ویژدانمو ئێستا داوات لێ ناکەم.. ڕازیم سبەینێ بیدەیتەوە.. کە ئەم قسەیەم بیست زاتم پەیدا کردو گوتم:

– قوربان گەر مەرحەمەت بکەیتو پێنج لیرەشم بدەیتێ بەڵکو بچم شتێ بخۆم..

کابرا چارەی گرژ کردو گوتی: دوای ئەم هەموو زیانە هێشتا پێنج لیرەشت بدەمێ؟ بەڵام وەك شتێ دڵی پێ سووتام، سێ لیرەی لە گیرفانی دەرهێناو پێی دام:– هانێ.. سبەی زووتر وەرە بزانم چی دەکەیت؟

پارەکەم وەرگرتو لەگەڵ ئەقدەس دا بەرەوماڵی خەدیجە خانم کەوتینە ڕێ... لە شەکەتی دا پێم عەردی نەدەگرت.. لاقەکانم بە دوای خۆمدا بە کێش دەکردو بە زۆر بەدەم ئەقدەسەوە پێ دەکەنیم.. بە هەر حاڵێ بوو ئەقدەسم بە خەدیجە خانم سپاردو بۆ خۆم گەڕامەوە بۆ کاروانسەراکە. هەر کە گەییمە سەر جێگاکەم لەسەر رایەخەکەم کەوتم. وەستا سلێمان پرسی:

– ئەمە چییە؟ بۆ وات لێهاتووە؟

بە سەرهاتەکەم بۆ وەستا سلێمان گێڕایەوە. وەستا سلێمان گوتی:

– ئەی فەلەکی ناچیزە یاخوا دەوەرانت وەرگەڕێ!

سبەینێ بەیانی زوو چوومەوە بۆ باخەکە.. هێشتا مشتەرییەکان نە هاتبوون، جلی گۆڵچیم لە بەر کردو لە نێو گۆڵەکەدا وێستام! کابراش دەستی بە جاڕدان کردەوە: گۆڵچی ناسراوی وولات کەماڵ فیداکار ئامادەیە، خێراکەن، گۆڵێ بکەنو دوو لیرەو نیو حەلاڵ بکەن..

لە تاو ماندوویێتیو ئازاری سەرو دەستو سکم، خۆم بە پێوە نەدەگرت. لەگەڵ ئەوەشا بەسەر خۆمم نەدەهێنا.. ئەم لاو ئەو لام دەکرد بۆ ئەوەی پێمەوە دیار نەبێ، مشتەری وەکو مێروستان رژانە نێو گۆڕەپانەکەوە، هێندە قەرەباڵغ بوو، بلیت بە قاچاغ دەفرۆشرا. تەماشاکەران لە نێو خۆیاندا گرێویان لەسەر دەکردم.. چەند جارێك لە سەر من لە نێو خۆیاندا بوو بە شەڕیان.. ئەو عەسرەش کە بە سەرو گوێلاکی خوێناوییەوە بۆ حیساب کردن دانیشتین، ٣٠ لیرە بە کابرا قەرزار مامەوە. دیسان ٥ لیرەی دامێ و رێك کەوتین کە سبەینێ باشتر هەوڵ بدەم و قەرزەکانم بدەمەوە.. ئەم بەزمە شەش رۆژ درێژەی کێشا، رۆژی ٣٠-٤٠ لیرە پتر قەرزار دەبووم....

رۆژی شەشەم بە ئەندازەی نووکە دەرزییەك ساغایی لە لەشما نەما بوو. بە ئاستەم هەناسەم دەردەهات، ئێسقانەکانی دەست و پێ و سینگم یەك پارچە دەیان زریکاند.. سەیرم کرد فلانی کەری ئەم بارە نیم...

گۆڵچییەکانی دی چەند جارێ گۆڕا بوون. منیش ئامادە بووم کابرا دەرم بکات و دەستم لە یەخە بکاتەوە! وەلێ ئەو رازی نەبوو، بەوپەڕی بێ شەرمییەوە داوای "٢٥٠" لیرەی دەکرد.. بەم هۆیەوە بیرێکی باشم بە سەردا هات و لە دڵی خۆمدا گوتم "گوێم تا قوڵ بێ مەلەی خۆشە" بڕیارم دا خۆم تێك نەدەم و هیچ تۆپێك نەگرمەوە تا کابرا خۆی ناچار بێ و دەرم بکات. مشتەرییەکان پەیتا پەیتا گۆڵیان دەکرد و پارەیان لە یارۆ وەردەگرت.

تەنانەت هەنێ لە تۆپەکان کە لە دارەکەی دابا، یا بیویستایە بۆ ئاوت بڕوا بە دەست دەم هێنایەوە نێو گۆڵەکە! تەماشاکەران چەپڵەیان لێدەدا و هورایان دەکێشا.. مشتەرییەکان لەوان بە شەوق و زەوقتر بوون. هەر کەسە شتێکی دەگوت: بابە گۆڵچییەکە گێژ بووە...

- نەبابە... بە ئانقەست وا دەکات..

کابرای خاوەن گۆڵ، گەییە تینی، لەمایکرۆفۆنەکەوە هاواری کرد:

- هاوڵاتیانی ئازیز سەبر بکەن... گۆڵ مەکەن... گۆڵەکان قەبوڵ نییە. گۆڵی ژمارە "٢" داخرا.

ئەوجا یەکێکی بە شوێنم دا نارد کە بچم بۆ نووسینگەکە.. چوومەلای یارۆ.. بردمییە ژێر چادرەکەوەو گوتی: - هەر چیم لە لاتە گەردنت ئازا بێ... و بڕۆ بەرێی خۆتەوە.. ئیدی تۆم ناوێ. خۆم گێل کردو گوتم:

- چما چی بووە قوربان؟ بۆ قاوم دەدەی؟ تازە خەریکە رادێم.

- بڕۆ یاری بۆ پورت بکە...

- قوربان ئاخر با قەرزەکانم پاك بکەمەوە.

- نامەوێ.. هیچم لێت ناوێ.. بڕۆ و یەخەم بەر بدە.

- نابێ قوربان.. ئاخر من قەبوڵ ناکەم..

- شۆخی مەکە.. باش بوو زوو پێ حەسیام.. ئەگینا ماڵ وێرانت دەکردم..

- قوربان دوای شەش رۆژان رەنج ئێستا بە دەستی بەتاڵ روو لە کوێ بکەم؟

بیست لیرەیەکی لە جانتاکەی دەرهێناو پێی دام و گوتی:

- ها، ئەم بیست لیرەیەش بۆ خەرجی دوو- سێ رۆژت، بڕۆو لە کۆڵم بەرەوە.. بەڵام ئەم فێڵە بە گۆڵچییەکانی دی نەڵێی ها!

پارەکەم لێ وەرگرت، سوپاسم کردو بەرەو کاروانسەراکە بەڕێ کەوتم..

گوێم لێ بوو کابرا هێشتا لە سەر پارە هەر مشت و مڕی بوو لەگەڵ مشتەرییەکاندا.

زیندە بێدەنگ بوو. هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشاو گوتی:

- بەڵێ برادەران، بەم چەشنە گۆڵچیتیەکەشم کۆتایی هات! ئیدی لەو زەمانەوە جنێوەکانی وەستا سلێمانم بۆ ماوەتەوە.

دەنگی شاوری بستە باڵا بەرز بووەوە. بەندییەکان بە یەك دەنگ گوتیان: - فەلەك کوێر بێ چاوانت.

- دەك زەلیل بی فەلەك.

- ئەی فەلەکی ناچیزە بە خۆڕایی سوتاندمت.

– ئەی فەلەك دەمەوێ لە دنیادا نەمێنی.

## (۱۸) هەموو كارێ لە دنیادا بە بەختە!

بەندییەكان سەبریان سوا بوو، تاقەتیان چوو بوو، دەیقە بە دەیقەیان دەژمارد تا بزانن سەرەنجام و ئاقیبەتی زیندەو ئەقدەس و منداڵەكەیان بە كوێ گەیی و بۆچی زیندە كەوتۆتە زیندانەوە. ئامادە بوون ئەم چیرۆكە بە تامە زووتر تەواو بێ و بەس بزانن ئاقیبەتی ئەم ژن و مێردە دەگاتە كوێ؟ زیندەش كە لەو رۆژانەدا دادگای هەبوو، و بە گوێرەی قسەكانی ئەوقات بۆی دەركەوتبوو كە دادگا تەبرێی دەكات و سبەو دوو سبەی دەقی بڕیارەكە مۆر دەكرێ و ئازادی دەكەن. بڕیاریدا پاشماوەی چیرۆكەكەیان بۆ تەواو بكات، تا نەبێ بە مەراقی دڵیان. بۆیە هەر كە سفرەكەیان كۆكردەوە، بەر لەوەی داوای لێ بكەن، یان وەكو شەوانی دی ناز بكات وخۆی گران بگرێ، بێ پێشەكی دەستی پێكرد:

– بەڵێ هاوڕێیان... كە لە گۆڵچێتی دەریان كردم، پتر لە هەوڵ و خەمی ئەقدەس دا بووم. هەستم دەكرد كە گوناحبارم بەرانبەری. دایك و باوكی هەقیان بوو نەفرەتم لێ بكەن. دەبوایە هەر ئەو رۆژەی كە دادگا لە بەشە میراتەكەم بێبەری كردم، وازم لە ئەقدەس هێنابا. بە تایبەتی كە ناسنامەم نەبوو، ئیدی ئومێدی كار پەیدا كردن و ماڵ و منداڵ بەخێو كردن مەحاڵ بوو.. ئەم بیرانە چ سوودێكیان هەیە.. هەڵەیەك بووەو كردم ئیدی ناچار بووم بە هەر نرخێ بووە ئەقدەس و منداڵەكەم رزگار بكەم.. عەسری ئەو رۆژە ئەقدەس وەكو هەمیشە هات بۆ كاروانسەراكە.. هەر چەند ماندوو بووم، بەڵام بەسەر خۆمم نەهێنا. بە هەر زەحمەتێ بوو هەستام و لەگەڵ ئەقدەس گیاندا بەرەوباخ كەوتینە رێ.

لەرێگادا ئەقدەس گوتی: مێردی خۆشەویستم چیت كرد بۆ خانووەكە؟

– وەڵڵا چیت عەرز بكەم.. سەرم قاڵە.

ئەقدەس تەماشایەکی نێو چاوەکانی کردم و گوتی: زۆر قورس بووم.. چیدی کارم پێ ناکرێ، کەسیش ئامادە نییە کارم بداتێ..

ئەقدەس ڕاستی دەکرد. منیش کە هیچ چارەیەکم نەبوو گوتم:

– وا چاکە بگەڕێیتەوە بۆ لای دایك و بابت!.

ئەقدەس هێندە ناڕەحەت بوو، بینی گیراو بە زەحمەت هاتە وەڵام:

– بە چ ڕوویەکەوە؟ بە چ مەعلوم ڕێگام دەدەن بچمەوەماڵیان؟

سەیرم کرد قسەکەی زۆر ڕاست و ماقولە.. گوتم: – گاڵتەم کرد.. ویستم بزانم تۆ چ دەڵێی.. بەڵێنت دەدەمێ تا هەفتەیەکی دی هەموو شتێك جێبەجێ بکەم..

ئەقدەسی دڵپاکم باوەڕی کردوگوتی: چەندی بڵێی سەبر دەکەم.. دەزانم خۆشت دەوێم وهەر کارێکت لە دەست بێ درێغیم بۆ ناکەیت.

ئەقدەسم گەیاندەوە ماڵی خەدیجە خانم، خۆشم چووم لە چایخانەیەك کە کونە جێگام بوو دانیشتم. هێندە پەست و غەمباروپەشێو بووم، ئاگام لە دەوروبەری خۆم نەبوو.. وەکو ئەوانەی بە دەم خەوەوە قسان دەکەن بە دەنگی بەرز لەگەڵ خۆمدا دەدوام.. لە پڕ دەستێکیان بە شانمادا. ڕاپەڕیم، سەیرم کرد یەکێکە لەو هاوشاریانەم کە چەند جارێ لەوە پێش بینی بووم، پرسی: ئەوە چیتە برادەر؟ لەگەڵ خۆتدا قسان دەکەی.. ناکا گەمییەکانت غەرق بوو بن؟ ماوەیەکە گازت دەکەم گوێت لێ نییە... بڵێ بزانم چیتە؟

هەر چەند گوتم هیچ نییە.. دەست بەردار نەبوو، و گوتی: پێم بڵێ بەڵکو بتوانم یارمەتیت بدەم.. ناڕەحەتی و گیروگرفت دێتە ڕێی هەموو کەسێك، هەموو هەر دیومانە.. شەرم مەکە بڵێ بزانم چیتە..

لە نووکەوە سەرگوزشتەکەم بۆ گێڕایەوە.. دوای ئەوەی تەواو بووم بە پێکەنینەوە گوتی: زەمانێ بوو منیش وەکو تۆ بووم، بگرە خراپتریش. ویستم خۆم بکوژم.. بەڵام ئەو پیلانی خۆ کوشتنە بووە مایەی ڕزگاریم.. بڕیارم دا بوو ئەم نهێنییە بە بابم نەڵێم، بەڵام چونکە دڵم بە تۆ دەسوتێ.. لەلای تۆ باسی

دەکەم: چاك چاو وگوێت بکەرەوە.. ئەو قسانەی دەیکەم لە مێشکت دا هەڵی بگرەو کاری پێ بکە...

- فەرمووو... گوێم لێتە..

تۆزێ بێدەنگ بوو، و گوتی: لێرە نابێت، با بچینە دەرەوە پێت دەبێژم..

لە چایخانەکە دەرچووین، چووینە سەر جادەیەکی چۆڵ، هاوشارییەکەم گوتی:

- ئەم ئۆتۆمبیلانە دەبینی؟

- بەڵێ .. دەی بینم..

یەکێك لە دوا مۆدیلەکان بدۆزەوەو خۆتی بخەبەر...

سەیرێکی یارۆم کرد و لە دڵی خۆمدا گوتم: ناکا دین بووبێ، ئەوە چ دەڵێ؟ بەڵام چ ماکێکی شێتی پێوە دیار نەبوو. گوتم: ئەگەر لەبەر خاتری ئەقدەس و منداڵەکەم نەبوایە تا ئێستا سەد کەڕەتان ئەمەم کردبوو و رزگار بوو بووم...

هاوشارییەکەم پێکەنی و گوتی: - نە کەرە گیان مەبەستم ئەوە نییە خۆت بکوژیت. ئەگەر بتەوێ وەعزو حاڵت باش ببێ ئەمە نەخشەیەکی چاکە...

دەبێ باش دیقەت بدەی کە یەکەم: ئۆتومبیلەکە دوا مۆدیل بێ و دیار بێ کە خاوەنەکەی پارەدارە. دووەم: ئەگەر شۆفێرەکە پیرەمێر یان ژنێکی جاحێل یا کیژێ بێ زۆر باشترە، چونکە ئەم بابەتە کەسانە ئامادە نین کاریان بگاتە لای پۆلیس و پۆلیسخانە. سێیەم: دەبێ بە جۆرێ خۆت بخەیتە بەر ئۆتۆمبیلەکە کە تەنیا دەست و دەموچاوت بریندار بێ و ئەوجا بە ئاخ و ئۆفەوە هەستی و وەکو دەست و پێ شکاوێك بەلەقە لەق هەنگاو بنێی و لە خۆتەوە قسەی بێ سەرو بەر بکەیت... بەم شێوەیە دەتوانی پارەیەکی باش وەربگری و لێی خۆش بیت..

بەڵام ئاگادار بە ئەم نەخشەیە لە سەری فلکەکان ئەنجام بدە چونکە خێرایی ئوتۆمبیلەکان لەسەری فلکەکاندا کەمترە. گوتم: برادەر من ناسنامەم نییە.. ناتوانم شکایەت بکەم..

گوتی: پێویست بە شکایەت ناکات.. ئەگەر لە هەڵبژاردندا هەڵە نەکەیت و بتوانی رۆڵی خۆت بە چاکی ببینی، کابرا پارەیەکی باشت دەداتێ و کارەکە

تەواو دەبێ.. من بەم شێوەیە بووم بە خاوەنی هەموو شتێك، خۆت دەزانی من جگە لەمە هیچ چارەیەكی دیم نەبوو.. ئەم كارەش لە هەموو فێڵەكان باشتر بوو. ئەگەر سەركەوتم باشتر ئەگەر ناش ئەوا ئاسوودە دەبم..
خوا حافیزیم لە كاكی هاوشاریم كردو گەڕامەوە بۆ كاروانسەراكە.. ئەو شەوە تا بەرەبەیان بیرم لەو نەخشەیە دەكردەوە.. كەخەویشم لێ كەوت خەونی ئاڵۆزم بینی... سبەینێ زوو چووم بۆ بەر پۆستەخانەكە. كاغەزێكی پڕ سۆزو گودازم بۆ بابی ئەقدەس نووسی و هەموو شتێكم روون كردەوەو نووسیم، بڕیارم داوە ئەوڕۆ خۆم بكوژمو ناونیشانی ماڵەكەی خەدیجەم بۆ نووسی و داوام لێكرد كە بێت كچەكەی بباتەوەو ئاگاداری منداڵەكەی منیش بكات.. كاغەزم خستە پۆستەوە، بۆ ئەنجام دانی نەخشەكەم خۆم گەیاندە شەقامێكی چۆڵ. تا بە دەستووری كابرای هاوشاریم لە یەكێك لە فلكەكاندا خۆم بخەمە بەر ئۆتۆمبیلێكی دوا مۆدیل.. ترس ولەرزێكی سەیرم لێ نیشت بوو.. هەر جارێ كە ئوتۆمبیلێكی لە بار تێ دەپەڕی و دەمویست خۆمی بخەمە ژێر، هێزێكی نادیار رای دەكێشامە دواوە.. خەریك بوو كات بە سەربچێ، لە دوورەوە ئوتومبیلێكی سپۆرتی دوا مۆدێل دەهات، كە نزیكتر بووەوە، سەیرم كرد كیژێكی قژ زەردی عەینەك لە چاو لە پشت سوكان-ەوە دانیشتبوو، لەمە چاكتر دەست ناكەوێ! بڕیارم دا، لە چاو نوقاندنێكدا خۆم فڕێ دایە بەر ئوتومبیلەكەی، كچەكە بە شارەزاییو چابوكییەكی زۆرەوە ئوتومبیلەكەی لێ لادامو ڕەت بوو. منی سیاچارەو نەگبەت كەوتمە ژێر ئوتومبیلیكی كۆنەی داڕزاوەوە، دوای ئەوەی "٢٥" رۆژ لە خەستەخانەدا كەوتم، ئەوجا ڕێی ئەقدەسیان دا بێتە لام. كوڕەكەم بە باوەشییەوە بوو، بە تۆبزی بەری گریانم گرت، كوڕەكەی خستە باوەشمو گوتی:- شێرە پیاوی من سەد شوكر كە نەمردیت.. هەموو شتێ چار دەكرێ. تەنیا مەرگە كە چاری نییە..

بە پێکەنینێکی تاڵەوە گوتم: ئەقدەس گیان کە دەوڵەت پێم دەڵێن مردوویت ئیدی زیندوو بوونم چ کەڵکێکی هەیە؟ ئەقدەس بۆ ئەوەی قسەکە بگۆڕێ گوتی:- بزانە چ منداڵێکی ئێسك سووکە.. کوتو مت لە تۆ دەچێ!

- خوا بکات بەختیشی وەکو من نەبێ..

- ئیشەڵڵا بەختی تۆش چاك دەبێ..

لە ئەقدەسم پرسی:- نێوت ناوە چی؟

گوتی: یحیا.

- مانای چییە؟

هەمان مانای ناوەکەی خۆتە.. بە زمانی عەرەبی بە زیندە دەڵێن "یحیا" کوڕەکەم بە خۆوە گوشی و گوتم: ناو دێر بی رۆڵە...

ئەقدەسو کوڕەکە گەڕانەوە بۆ ماڵێ. دکتۆر قەولی دا ٢-٣ رۆژی دی لە خەستەخانە دەرم دەکەن.. ئەم هەواڵە لە بری ئەوەی دڵخۆشم بکات، پتر پەستی کردم.. چونکە نەمدەزانی دوای ئەوەی لە نەخۆشخانە.. دەربچم چی بکەم؟! بۆ سبەی ئەقدەس هاتەوە بۆ نەخۆشخانە.. بڕیار نەبوو ئیدی ئەوان بێن.. هەستم کرد شتێ روویداوەو رووداوێکی گرنگ قەوماوە.. بەر لەوەی من قسان بکەم ئەقدەس بە خۆشییەوە گوتی:- بابم زەلامێکی ناردووەو کاغەزی بۆ نووسیوین بە زووترین کات بگەڕێینەوە بۆ لای خۆمان.. پیرۆزبایی منداڵەکەشی لێکردوین.. پارەی گەڕانەوەشی بۆ ناردوین..

کە ئەمەم بیست ئیسراحەتم کرد.. لە راستیدا هیچ شوێنێ بە ئەندازەی زێدی بنیادم خۆش نییە.. خوایە ئەستەموڵ وێران بێ کە ئەم هەموو خەڵکە بەرەو خۆی رادەکێشێتو ئاوارەیان دەکات.. دوای دوو رۆژان لە خەستەخانە دەرچووم، یەکراست گەڕاینەوە بۆ لای خۆمان. ئەمجارەیان سێ کەس بووین. دایكو بابی ئەقدەس پێشوازییەکی گەرمیان لێ کردین...

یەکەم کارێ کە دەستم پێوەدا، دەرکردنی ناسنامە بوو بۆ "یحیا"، نەم دەویست وەکو خۆم ئاوارەو سەرگەردان ببێ.. دەست بە جێ عەرزوحاڵێکم نووسی بۆ

دایەرەی ئامارم برد، مامورەکە گوتی:- دوای دوو رۆژی دی وەرەوە ناسنامەکە ئامادەیە.

دوای دوو رۆژان "یحیا"م خستە باوەشی دایکیو پێکەوە چووین بۆ دایەرەی ئامار.. مامۆری بەر پرس کە چاوی پێمان کەوت گوتی:

- کارەکەتان گیرو گرفتی تێدایە...

سەرم گەرم داهات و بە نیگەرانییەوە پرسیم: بۆچی؟ گیرو گرفتی چی؟

مامورەکە گوتی: تۆ ناتوانی ببی بە بابی ئەم منداڵە..

- یانی چی؟ چۆن ناتوانم ببم بە باوکی؟

کابرای مامور کۆنە دەفتەرێکی قەبەی هێنا، کردییەوەو گوتی: بە گوێرەی دەفتەری ئامار تۆ ٥٥ ساڵ لەمەو بەر شەهید بوویت.

لە پڕ کۆنترۆڵی خۆم لە دەست داو هاوارم کرد:

- من نەمردووم.. بە چاوی خۆت دەبینی کە زیندووم.. ئێوە مردوون.. ئێوەی فەرمانبەری هیچو پوچو نافامیدەو ناشی مردوون...

کابرای مامور وەکو گورگی زامدار ڕاپەڕی و لە من توندتر هاواری کرد:

- تانە لە من دەدەی؟ لە کاتی ئەنجامدانی وەزیفە شا ها.. ئێستا پێت نیشان دەدەم.

دەستی درێژ کرد کە یەخەم بگرێ. مستە کۆڵەیەکم بە نێو دەمی دا کێشا لەسەر کورسییەکەی خۆی تەختم کرد. کۆمەڵێك بە سەرماندا رژانو دەستیان گرتمو بێ گوێ دان بە هاوارو گریانو پاڕانەوەی ئەقدەس بۆ پۆلیسخانەیان بردم.. فایلیان بۆ کردمەوەو لەوێوە بۆ شاریان هێنامو ئەوەتام وا لەگەڵ ئێوە دام..

بەندییەکان بە یەك دەنگ هاواریان کرد.. تازە بۆیان دەرکەوت کە زیندە لەبەر چی کەوتۆتە زیندانەوە.

زیندە کەمێ بێدەنگ بوو، و درێژەی پێدا:

- بەڵێ برادەران، هەموو خەتاکەی من ئەوە بوو کە ئامۆژگارییەکەی وەستا سلێمانم فەرامۆش کرد، ئەگەر بە قسەی ئەوم کردباو لە کاتی تورەییدا جنێوم

بە ڕۆژگار بدایە حاڵم بەم حاڵە نەدەبوو. چونکە لە یاساکانی ئێمەدا جنێودان بە ڕۆژگارو فەلەکی چەپگەرد تاوان نییە.

دەنگی شاوری ماموره بستە باڵاکە کاتی خەوتنی ڕاگەیاند. بەندییەکان کە هەر یەکەیان حاڵەتێکی تایبەتی هەبوو، خزانە ژێر جێگاکانیانەوەو خەویان لێ کەوت.

سبەی بەیانی زوو، مایکرۆفۆنی زیندان "زیندە"ی داوا کرد کە بچێ بۆ نووسینگەی زیندان.. ردێن سپی قاوشەکە گوتی:

– زیندە وا بزانم بڕیاری ئازادیت دراوە.. زووکە شتەکانت بپێچەوە... پێش ئەوەی زیندە لە جێی خۆی هەستێ، ماموره بستە باڵاکە هاتە ژوورەوەو مژدەی ئازادی "زیندە"ی ڕاگەیاند.

بەندییەکان بەمە ڕازی بوون‌و ناڕازیش.. پێیان خۆش بوو کە زیندە دوای ئەم هەموو دەردی سەری‌و ئاوارەییە دەگەڕێتەوە نێو ماڵ‌و منداڵی خۆی... پێیان ناخۆش بوو، چونکە هیچ کاتێ حەکایەتخوانێکی وەکو زیندە شیرین زمانیان دەست ناکەوێ..

لە ماوەی ئەو چەند شەوەدا بەندییەکان نەیان دەزانی کەی شەو دێ‌و کەی ڕۆژ دەڕوات..؟

زیندە بە پاشەکەوتی ئەو پارەیەی کە بەندییەکان پێیان دابوو، جل‌و بەرگی سپۆرت‌و چاکی کڕی بوو. لە بەری کردن، پێڵاوی تازەی لە پێ کرد، کراسی سپی پۆشی، بۆینباخی بەست. بە جۆرێ شێوەی گۆڕا بوو، کەسێ نەی ناسیبا وای دەزانی بەڕێوەبەری گشتییە...

بەندییەکان زیندەیان تاکو بەر دەرگا بەڕێ کرد، دوای ڕۆییشتنی ئەو هەموو چاویان پڕ بوو لە فرمێسک.

گوندی چۆخماخ

١٩٨٣/٥

## حەمە کەریم عارف

* کەرکووکییە و لە ساڵی ١٩٥١دا لەدایك بووە.
- لە ساڵی ١٩٧٥ کۆلیژی ئەدەبیاتی بەغدای تەواو کردووە.
- یەکەم بەرهەمی شیعرێکە بەناوی (هەڵبەستێکی هەتیو کەوتوو) کە لە ژمارە (١٧٠) رۆژنامەی هاوکاری لە ١٩٧٢/٦/٨ بڵاوبووەتەوە.
- لە ساڵی ١٩٧٥ەوە بە بەردەوامی نووسین و بەرهەمی ئەدەبی بڵاو دەکاتەوە.
- سەرنووسەر یان بەڕێوەبەری نووسین یان سکرتێری نووسین یان ئەندامی دەستەی نووسەرانی ئەم گۆڤار و بڵاوکراوانە بووە: گۆڤاری گزنگی نووسەرانی کەرکووك، نووسەری کوردستان، کەلتوور،نووسەری کورد، گوڵانی عەرەبی، ئاڵای ئازادی تا ژمارە ٢٢٢، گۆڤاری نەوشەفەق.

* جگە لە ناوی خۆی، بە تایبەتی لە گۆڤاری گزنگی نووسەرانی کەرکووك،نووسەری کوردستان، کەلتوور، رۆژنامەی ئاڵای ئازادی تا ژ: ٢٢٢ بەناوی گۆڤەند، زنار، سیپان، پاکزاد، محەمەدی حاجی، سیروان عەلی، دیدار هەمەوەندی، هێژا، ح. ع ،هامون زێباری، با زەوان عەبدولکەریم بەرهەمی بڵاو کردووەتەوە.

* جگە لە پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی قوتابیانی کوردستان ئیدی ئەندامی هیچ حیزب و رێکخراوێکی سیاسی نەبووە، لە ساڵی ١٩٧٤ – ١٩٧٥دا پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلوول بووە، لە هەشتاکاندا بۆ ماوەی نۆ ساڵ، بێ وابەستەگی حیزبی پێشمەرگە بووە و وەکو بەشدارییەکی مەیدانی و ویژدانی لە خەباتی رەوای نەتەوەی

کوردا شانازی پێوە دەکات و منەت بەسەر کەسدا ناکات، چونکە باوەڕی وایە کە ڕۆڵەی میللەتی مەزلوم مەحکومە بە پێشمەرگایەتی.

- لە هەشتاکانەوە تا ئێستا ڕاستەوخۆ سەرپەرشتی و سەرۆکایەتی لقی کەرکووکی یەکێتیی نووسەرانی کوردی کردووە.
- زۆر بەرهەم و کتێبی چاپ و بڵاو کردووەتەوە، لێ زۆربەی هەرە زۆریان، بە تایبەتی ئەوانەی لە چیادا چاپ بوون بە نوسخەی هێندە کەم بڵاوبوونەتەوە،لە نرخی نەبوو دان و هەر ئەوەندەیە کە لە فەوتان ڕزگار بوون. هەندێك لە وانە:

١- تیرۆژ، کۆ چیرۆك، چاپی یەکەم ١٩٧٩

٢- کۆچی سوور، ڕۆمان، چاپی یەکەم،١٩٨٨،چاپی سێیەم ٢٠٠٧

٣- بەیداخ، چیرۆك، چاپی یەکەم ١٩٨٨

٤- داوەتی کۆچەرییان، کۆ چیرۆك ،چاپی دووەم ٢٠٠٥

٥- لە خۆ بێگانە بوون، کۆمەڵە چیرۆك،چاپی یەکەم (١٩٩٩) دەزگای گوڵان

٦- کوچ سرخ، کۆ چیرۆك، بە فارسی، وەرگێران چاپی یەکەم ١٩٨٧ شاخ

٧- نینا، ڕۆمان، سابت رەحمان، چاپی یەکەم،شاخ،١٩٨٥ چاپی سێیەم ٢٠٠٥

٨- نامۆ، ڕۆمان، ئەلبیر کامۆ، چاپی یەکەم، شاخ١٩٨٧چاپی چوارەم ٢٠٠٩ وەشانخانەی سایە،سلێمانی

٩- ڕێبەر، ڕۆمان، مەهدی حسین، چاپی یەکەم (شاخ) ١٩٨٣، چاپی دووەم، ٢٠٠٧

١٠-شکست، ڕۆمان، ئەلکساندەر فەدایەف، چاپی شاخ (راه کارگر)، چاپی دووەم، ٢٠٠٩ خانەی وەرگێران.

١١- هاومالـەکان، رۆمـان، ئەحمـەد مـەحمود، چـاپی دووەم ٢٠٠٠ دەزگای گولان

١٢ - بێناسنامەکان، رۆمان، عەزیز نەسین، چاپی سێیەم ٢٠٠٦

١٣- قوربانی، رۆمان، هیرب میدۆ، چاپی یەکەم ٢٠٠٤ دەزگای شەفەق

١٤- دووره ولات، رۆمـان ع. قـاسموف، چـاپی یەکـەم٢٠٠٠ دەزگـای گولان

١٥- ئـازادی یـا مـەرگ، رۆمـان، کـازانتزاکیس، چـاپی یەکـەم ٢٠٠٣ کتێبخانەی سۆران، چاپی دووەم: ٢٠٠٨

١٦- چـیرۆکەکانی سـەمەدی بیهرەنگـی، چـاپی دووەم، ٢٠٠٤ کتێبخانەی سۆران هەولێر

١٧- ئامانجی ئەدەبیات. م. گۆرکی، چاپی شاخ ١٩٨٥

١٨- ئـەو رۆژەی کـە ونبـووم (کۆمەڵـە چـیرۆکی بیـانی) چـاپی یەکەم،٢٠٠٦

١٩- جیّ پیّ (کۆمەڵە چیرۆکی فارسی) چاپی یەکەم ٢٠٠٦،نووسەرانی کەرکوك

٢٠- زندە خەون، کۆمەڵە چیرۆك، چیخۆف،چ١،دەزگای موکریانی

٢١- چیرۆکـستان ،کۆمـەڵێك دەق‌ورەخنـەی جیهـانی چ١ ،٢٠٠٥،نووسەرانی کەرکوك

٢٢-دیدارو دەق‌و رەخنە،چ٢٠٠٥،١

٢٣-دیداری چیرۆکڤانی، چ٢٠٠٥،١

٢٤-ئەو بەرخەی کە بوو بە گورگ ،چ٢٠٠٨،١نووسەرانی کەرکوك

٢٥- میوان، چیرۆك،ئەلبێر کامۆ

---

٢٦- مەسەلەی کورد لە عێراقدا،عەزیز شەریف،چاپی دووەم ٢٠٠٥

٢٧- مێژووی رەگ و رەچەڵەکی کورد، ئیحسان نوری پاشا،چ١٩٩٨،١

٢٨- کورد گەلی لە خشتەبراوی غەدر لێکراو، د. کوینتەر دیشنەر، چاپی سێیەم ٢٠٠٤

٢٩- لە مەهابادی خوێناوییەوە بۆ کەنارێن ئاراس، نەجەف قولی پسییان، چاپی یەکەم ٢٠٠٦

٣٠- کورد لە سەدەی نۆزدەوبیستەمدا،کریس کۆچرا،چاپی چوارەم ٢٠٠٧

٣١ -کورد لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلامدا،چاپی یەکەم ١٩٩٨

٣٢- چینی کۆن، چ١(        )دەزگای موکریانی

---

٣٣- دلێریی خۆراگرتن، ئەشرەفی دەهقانی

٣٤- خەباتی چەکداری هەم تاکتیکە هەم ستراتیژ، مەسعودی ئەحمەد زادە

---

٣٥- ڤنسنت ڤان گوگ، شانۆنامە، باول ئایز لەر

٣٦- بە دوعا شاعیرەکان، شانۆنامە، جەلیل قەیسی (گزنگ ژ:١٢)

٣٧- جولەکەکەی مالْتا، شانۆنامە،کریستۆفەر مالرۆ.

٣٨- دادپەروەران، شانۆنامە، ئەلبیر کامۆ

٣٩- بەد حالْی بوون، شانۆنامە، ئەلبیر کامۆ.

٤٠- چاو بە چاو، شانۆنامە، گەوهەر مراد (غولام حسەینی ساعیدی)

٤١- ریچاردی سێیەم، شانۆنامە، شەکسپیر.چاپی یەکەم ٢٠٠٩، بلاوەخانەی سایە، سلێمانی

٤٢- گەمەی پاشا و وەزیر، شانۆنامە، عەبدوللائەلبوسێری..

---

٤٣- مندالە دارینە، چیرۆکی درێژ بۆ مندالان.

٤٤- فاشیزم چییە؟ کۆمەلە چیرۆك بۆ مندالان، یەلماز گونای

١١- هاوماڵـەكان، رۆمـان، ئەحمـەد مـەحمود، چـاپی دووەم ٢٠٠٠ دەزگای گوڵان
١٢ - بێناسنامەكان، رۆمان، عەزیز نەسین، چاپی سێیەم ٢٠٠٦
١٣- قوربانی، رۆمان، هیرب میدۆ، چاپی یەكەم ٢٠٠٤ دەزگای شەفەق
١٤- دووره وڵات، رۆمـان ع. ڤـاسموف، چـاپی یەكـەم٢٠٠٠ دەزگـای گوڵان
١٥- ئـازادی یـا مـەرگ، رۆمـان، كـازانتزاكیس، چـاپی یەكـەم ٢٠٠٣ كتێبخانەی سۆران، چاپی دووەم: ٢٠٠٨
١٦- چـیرۆكەكانی سـەمەدی بیهرەنگـی، چـاپی دووەم، ٢٠٠٤ كتێبخانەی سۆران هەولێر
١٧- ئامانجی ئەدەبیات. م. گۆركی، چاپی شاخ ١٩٨٥
١٨- ئـەو رۆژەی كـە ونبـووم (كۆمەڵـە چـیرۆكی بیـانی) چـاپی یەكەم،٢٠٠٦
١٩- جیّ پیّ (كۆمەڵە چیرۆكی فارسی) چاپی یەكەم ٢٠٠٦،نووسەرانی كەركوك
٢٠- زندە خەون، كۆمەڵە چیرۆك، چیخۆف،چ١،دەزگای موكریانی
٢١- چیرۆكـستان ،كۆمـەڵێك دەقورەخنـەی جیهـانی چ١ ،٢٠٠٥،نووسەرانی كەركوك
٢٢-دیدارو دەق و رەخنە،چ٢٠٠٥،١
٢٣-دیداری چیرۆكڤانی، چ٢٠٠٥،١
٢٤-ئەو بەرخەی كە بوو بە گورگ ،چ٢٠٠٨،١نووسەرانی كەركوك
٢٥- میوان، چیرۆك،ئەلبێر كامۆ

---

٢٦- مەسەلەی كورد لە عێراقدا،عەزیز شەریف،چاپی دووەم ٢٠٠٥
٢٧- مێژووی رەگ و رەچەڵەكی كورد، ئیحسان نوری پاشا،چ١٩٩٨،١

٢٨- کورد گەلی لە خشتەبراوی غەدر لێکراو، د. کوینتەر دیشنەر، چاپی سێیەم ٢٠٠٤
٢٩- لە مەهابادی خوێناوییەوە بۆ کەنارێن ئاراس، نەجەف قولی پسییان، چاپی یەکەم ٢٠٠٦
٣٠- کورد لە سەدەی نۆزدەوبیستەمدا،کریس کۆچرا،چاپی چوارەم ٢٠٠٧
٣١ -کورد لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلامدا،چاپی یەکەم ١٩٩٨
٣٢- چینی کۆن، چ١(        )دەزگای موکریانی

---

٣٣- دلێریی خۆراگرتن، ئەشرەفی دەهقانی
٣٤- خەباتی چەکداری هەم تاکتیکە هەم ستراتیژ، مەسعودی ئەحمەد زادە

---

٣٥- ڤنسنت ڤان گوگ، شانۆنامە، باول ئایز لەر
٣٦- بە دوعا شاعیرەکان، شانۆنامە، جەلیل قەیسی (گزنگ ژ:١٢)
٣٧- جولەکەکەی مالْتا، شانۆنامە،کریستۆفەر مالرۆ.
٣٨- دادپەروەران، شانۆنامە، ئەلبیر کامۆ
٣٩- بەد حالّی بوون، شانۆنامە، ئەلبیر کامۆ.
٤٠- چاو بە چاو، شانۆنامە، گەوهەر مراد (غولّام حسەینی ساعیدی)
٤١- ریچاردی سێیەم، شانۆنامە، شەکسپیر.چاپی یەکەم ٢٠٠٩، بلّاوەخانەی سایە، سلێمانی
٤٢- گەمەی پاشا و وەزیر، شانۆنامە، عەبدوللّائەلبوسێری..

---

٤٣- منداڵە دارینە، چیرۆکی درێژ بۆ منداڵان.
٤٤- فاشیزم چییە؟ کۆمەڵە چیرۆك بۆ منداڵان، یەلماز گونای

٤٥- شوانە بچکۆلەکە، چیرۆکێکی درێژی چینی یە بۆ مندالآن

٤٦- زارۆکستان (چوار شانۆنامە بۆ منالآن)

٤٧- چەند چیرۆکێك لە ئەفسانەی یونانی کۆنەوە (٢٣ئەفسانە)

---

٤٨- لە گەنجینەی حیکایەتی تورکمانییەوە. (ئەفسانەی ئەسپی ئاشق)چاپی یەکەم٢٠٠٨

٤٩- ئەفسانەێن گریکی و رۆمانی، چاپی یەکەم (٢٠٠٤) کتێبخانەی سۆران، هەولێر

٥٠- ئیلیادە، هۆمیرۆس، چ١،دەزگای سەردەم ٢٠٠٩

---

٥١- گۆڤەند و زنار (فەرهەنگی فارسی – کوردی) حەمە کەریم عارف، چ١(٢٠٠٦-٢٠٠٨)دەزگای موکریانی

٥٢-چۆنیەتی فێربوونی زمانی فارسی، چ١، ٢٠٠١

---

٥٣- چرنیشفسکی، فەیلەسوف و زانای گەورەی میللەتی روس

٥٤- چایکۆ فسکی، ژیان و بەرهەمی.

٥٥- ئیدگار ئالین پۆ، ژیان و بەرهەمی.

٥٦- جاك لەندەن، ژیان و بەرهەمی

٥٧- گوگول، نووسەری ریالیست

٥٨- یەڵماز گونای، ژیان و بەرهەمی

٥٩- سادقی هیدایەت، ژیان و بەرهەمی

٦٠- خافروغ لە شیعر دەدوێ، ژیان و بەرهەمی

---

٦١- راگەیاندن لە پەراوێزی دەسەلآتدا (بە شەریکی) چاپی یەکەم (٢٠٠١) دەزگای گوڵان

٦٢-راگەیاندن لە نێوان حەقیقەت بێژی و عەوام خەڵەتێنی دا، حەمە کەریم عارف،چ(١)،٢٠٠٥

---

٦٣- مێژووی ئەدەبیاتی جیهان (لە کۆنەوە تا سەدەکانی ناڤین).چاپی یەکەم٢٠٠٨

٦٤- مێژووی ئەدەبیاتی جیهان (لە سەردەمی رینیسانسەوە تا ئێستا).چاپی یەکەم٢٠٠٨

٦٥- مێژووی ئەدەبیاتی جیهان (ئەدەبیاتی ئینگلیزی زمان- ئەمریکاو ئینگلیستان لە سەرەتاوە تا ئێستا).چاپی یەکەم٢٠٠٨

٦٦- ریالیزم‌ودژە ریالیزم لە ئەدەبیاتدا،سیروس پرهام،چ٢٠٠٤،١،دەزگای سپیرێز

٦٧- قوتابخانە ئەدەبییەکان،رەزا سەید حسەینی، چ٢٠٠٦،١دەزگای موکریانی

٦٨- مێژووی ئەدەبیاتی روسی، سەعیدی نەفیسی

٦٩- لێکدانەوەیەك لەمەڕ نامۆ ، لویس ریی ،چ٢، ٢٠٠٦

٧٠- هونەروژیانی کۆمەڵایەتی، بلیخانۆف، چ١(٢٠٠٥)دەزگای موکریانی

٧١- گوزارشتی مۆسیقا،د. فواد زکریا، چ١،یانەی قەڵەم ٢٠٠٦

٧٢- رێبازە هونەرییەکانی جیهان

٧٣- پێکهاتەی بەدەنی و چارەنووسی ئافرەت،(چ١) ٢٠٠٦

٧٤- دەربارەی شیعروشاعیری، حەمە کەریم عارف، چ٢٠٠٧،١

٧٥- دەربارەی رۆمان‌و چیرۆك، حەمەکەریم عارف،چ١، ٢٠٠٨

٧٦- مەرگی نووسەرو چەند باسێکی دیکەی ئەدەبی-رۆشنبیری،حەمەکەریم عارف،چ١، ٢٠٠٥نووسەرانی کەرکوك

٧٧- نـــاودارانی ئـــەدەب، حەمـــە کـــەریم عـــارف، (چ١) دەزگـــای موکریانی،٢٠٠٩

٧٨- پەیڤستانی من، حەمە کەریم عارف،چاپی یەکەم()

٧٩- پەڵکە ڕەنگینە، حەمە کەریم عارف،چ١، ٢٠٠٤

٨٠- خیانەتی حەلاڵ، حەمە کەریم عارف

٨١-بووکی هەزار زاوا،کۆ چیرۆک،بزورگی عەلەوی

* لە ڕاپەڕینەوە تا نهوو چالاکانە بەشداری بزاڤی ئەدەبی و ڕۆشنبیریی کـوردی دەکـات وبەرهـەمی هەمـە جـۆر (نووسـین و ئامـادە کـردن و وەرگێڕان) بڵاودەکاتەوە..

* ئەو بەرهەمانە و زۆری دیکەی ئامادەن بۆ چاپ و چاپکردنەوە و هەر کەس و گروپ و لایەن و دەزگایەك تەماحی بڵاو کردنەوەی هەبن، دەبێ پرس بە نووسەر بکات...